پێشەکەشە بەوانەی

بنەماکان پێش کەسەکان دەخەن و

وەحی دەخەنە پێش مێژوو

(( لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ))

**سورەتی حدید -٢٥-**

((اللهم رب جبريل وميكائيل وإسرافيل، فاطر السماوات والأرض، عالم الغيب والشهادة، أنت تحكم بين عبادك فيما كانوا فيه يختلفون.. أهدني لما اختلف فيه من الحق، فإنك تهدي من تشاء إلى صراطٍ مستقيم))

**صحيح ابن حبان ٣٣٥/٦**

(دادپەروەری ئەرکی هەر کەسێکە لەسەر هەرکەس لەهەموو رەوشێکدا، ستەمیش بەرەهایی قەدەغەکراوەو بەهیچ شێوەیەک رێی پێنادرێت)

**ئیبن تەیمییە**

(ستەمکار کەستەم دەکات خەڵکی تووشی ئاشوب دەبن و ئەوانەشی ستەمیان نەکردووە دەیانگرێتەوە، لەوکاتەشدا دەستەوسان دەبێت لەرەتکردنەوەی، بەپێچەوانەی ئەوەی گەر لەسەرەتاوە رێگری لەو ستەمە بکرایە، ئەوا هۆکاری ئەو ئاشوبە لەناو دەبرا)

**ئیبن تەیمییە**

## لەسەرنووسین

## بەپێنووسی: دکتۆر یوسف قەرزاوی

سوپاس بۆ خودا، سەڵات وسەلام لەسەر پەیامبەری خوداو خانەوادەو یاوەرانی و ئەوانەی شوێن ڕێنوێنیەکەی کەوتن، دواتر:

برای بەڕێزم (محەمەد موختار شەنقیتی)کەتوێژەرە لەناوەندی قەرزاوی لەدەوحە کتێبەکەی (ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان- خوا لێیان رازی بێت) پێشکەش کردم، ماوەیەک لام مایەوەو دەرفەتم نەبوو بیخوێنمەوە، پاشان خوای گەورە دەرفەتی بۆ ڕەخساندم بیخوێنمەوە، سەرسام بووم بەکتێبەکەو بەشێوازەکەی، پێگەیشتن و بەرچاوڕوونیم لەخستنە رووی ئەم بابەتە هەستیارە بگرە گوماناوییە بینی، لەوبارەیەوە قسەی خۆم لەگەڵ کرد، دەستپێشخەری کردو گوتی: داوا دەکەم بۆچوونی خۆت بکەیتە پێشەکی چاپی نوێی کتێبەکەم، پێم گوت: کتێبەکەت خاوەن پێشەکییەکی جوانە کەبراو هاوڕێمان بیرمەندی ئیسلامی راشید غەننوشی نووسیوویەتی! گوتی: پێشەکیەکی تۆ دەبێتە پێشەکی دووەم و، زیادەی چاکە چاکەیە، بەتایبەت کەهەندێک لەبرایان بەتوندی هێرشیان کردۆتە سەرخۆم و کتێبەکە.

داواکاریەکەم قبوڵ کردو، گوتم: سێ چوار لاپەڕەی بۆ دەنووسم، بەڵام بواری قسە فراوان بوو بۆم، تا گەیشتە ئەم رادەیەو ئەم چەند لاپەڕەیە، گومانی تێدا نیە کەبابەتەکە شایستەی ئەوەیەو، دەکرێت سەرنجی جیاواز لەبارەیەوە هەبێت و، هەموو موجتەهیدێک بەشی خۆی بۆ هەیەو، هەموو کەسیش بەگوێرەی نیەتەکەی پاداشتی بۆ هەیە.

## هاوەڵان کێن؟

ئەم پێشەکییە بەم پرسیارە لەپێشە دەست پێدەکەم: هاوەڵان کێن؟

ئەو نەوە باشەن کەقەدەری باڵا هەڵیبژاردوون، تا لەفێرگەی موحەممەددا (صلى الله عليه وسلم) فێر ببن و، قورئان لەوەوە بەپوختی و نوێی پێیان گەیشت و، ئەم قورئانەیان وەک بەرنامەیەک کەپەیڕەو بکرێت وەرگرت، ئەوان بۆ جێبەجێکردن و شوێنکەوتن وەریانگرت، نەک تەنها گوێ لێبوون، ئەم نەوە قورئانییە دەگمەنە -وەک ئەوەی سەید قوتب ناوی ناون- هەڵگرتنی بانگەواز بۆ لای خوداو، ئەو ناڕەحەتیەی دەیخاتە سەر هاوەڵانی و تووشبوونی نەهامەتی وزیان و لەرزین و، ئەوەی لەبەرگە گرتنی باجی قوربانیدان بەگیان و ماڵی کەوتە ئەستۆیان، لەراستیدا ئەوان لەپێشترین کەسن بەپێناسەی بڕوادار، ئەوانەی کەخوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموویێت: (**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ**) سورەتی الحجرات ١٥.

ئەمانە ئەو کەسانەن کەخوای گەورە لەکۆتایی سورەتی (الفتح)دا پیاهەڵدانێکی گشتی بۆنخۆشی کردوون: (**مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا**) سورەتی الفتح ٢٩.

جوانناسـاندنێکی تایبـەتـی موسـڵمانە پێـشینەکـانی موهـاجیرو ئەنصار دەکات، خوای گەورە لەسـورەتـی (التوبـە)دا دەفـەرموویێت: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَـدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ) التوبه ١٠٠.

باسـی لـەموهـاجیرو ئـەنـصارەکـانیش بـەشـێوەیـەکـی تایبـەت کردووەو، خوای گەورە لەسورەتی (الانفال)دا دەفەرموویێت: (وَالَّذِينَ آمَنُـوا وَهَـاجَرُوا وَجَاهَـدُوا فِـي سَبِيلِ اللَّـهِ وَالَّـذِينَ آوَوْا وَنَـصَرُوا أُولَئِـكَ هُـمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ) سورەتی الانفال ٧٤.

هـەروەهـا لـەسـورەتـی (الحـشر)دا باسـی لـەباشـەی موهـاجیرو ئـەنصاریەکـان بـەجۆرێـک کـردووە، کـەبـەرزی پایـەیـان لای خـوای گـەورە دەخاتـە روو: (لِلْفُقَـرَاءِ الْمُهَـاجِرِينَ الَّـذِينَ أُخْرِجُـوا مِـنْ دِيـارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنْصُرُونَ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ أُولَئِـكَ هُـمُ الصَّادِقُونَ (٨) وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الـدَّارَ وَالْإِيمَـانَ مِـنْ قَـبْلِهِمْ يُحِبُّـونَ مَـنْ هَـاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُـوا وَيُـؤْثِرُونَ عَلَـى أَنْفُـسِهِمْ وَلَـوْ كَـانَ بِهِـمْ خَـصَاصَةٌ وَمَـنْ يُـوقَ شُـحَّ نَفْـسِهِ فَأُولَئِـكَ هُـمُ الْمُفْلِحُـونَ (٩)) سورەتی الحشر ٨و٩.

قورئان باسـی ئەوانەشی کردووە کەبەشداری جـەنگی بـەدریـان کـردووە، کـە لـەکاتێکدا بێدەسـتەڵات بـوون خـوای گـەورە سـەری خستن و، پـەنایدان و بـەسـەرکـەوتـن پشتگیری کـردن و، لـەرۆزی باش بەشیدان تا سوپاسگوزار بن و، دەفـەرموویێت: (وَلَقَـدْ نَـصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنْتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُوا اللَّـهَ لَعَلَّكُـمْ تَـشْكُرُونَ (١٢٣) إِذْ تَقُـولُ لِلْمُـؤْمِنِينَ أَلَنْ يَكْفِيَكُمْ أَنْ يُمِدَّكُمْ رَبُّكُمْ بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَـةِ مُنْـزَلِينَ (١٢٤) بَلَـى إِنْ

تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُمْ مِنْ فَوْرِهِمْ هَذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُمْ بِخَمْسَةِ آَلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ (١٢٥) وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَى لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُمْ بِهِ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ (١٢٦) لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنْقَلِبُوا خَائِبِينَ (١٢٧)) ال عمران.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئەو کاتەی هەندێک لەبەشدار بووانی بەدر هەڵەی گەورەیان کردو عومەر داوای کردو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا رێگام بدە لەگەردنی بدەم، دوورِوو بووە! فەرمووی: ((انه شهد بدرا، وما يدريك لعل الله أن يكون قد اطلع على أهل بدر، فقال اعملوا ما شئتم، فقد غفرت لكم) [1]، واتە: ئەو بەشداری بەدری کردووە، چۆن دەزانیت لەوانەیە خوای گەورەی بەئاگا لەبارەی ئەهلی بەدر فەرموویێتی چی دەکەن بیکەن، من لێتان خۆش بووم).

بەهەمانشێوە قورئان باسی بەشداربوونی ئوحودو، سەرپێچیکردنیان لەراسپاردەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و، هەڵهاتنی هەندێک لەوانەی کەلەدەوروبەری بوون کردووەو، رایگەیاندووە کەلێیان خۆش بووە، لەمبارەیەوە دەفەرموویێت: (ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنْكُمْ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ) ال عمران ١٥٢، لەهەمان سورەتدا دەفەرموویێت: (إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْا مِنْكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ (١٥٥)).

---

[1] ـ متفق عليه: بورخاری لە (الجهاد والسير) (٣٠٠٧) گێڕاویەتیەوەو، مسلیم لە (فضائل الصحابة)دا (٢٤٩٤) گێڕاویەتیەوە، هەروەها ئەحمەد (٦٠٠)و ئەبو داود لە (الجهاد) (٢٦٥٠)و، تورمزی لە (التفسير) (٣٣٠٥) لەعەلیەوە گێڕاویەتیەوە.

باسی لەغەزای ئەحزابیش کردووەو، دەفەرمووێت: **(وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا (٢٢) مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا (٢٣)) الاحزاب.**

بەهەمانشێوە باسی پەیمانی (رضوان) کردووە، ئەوانەی پەیمانیان بەپێغەمبەردا لەسەر مردن لەپێناوی خوادا، خوای گەورە لەبارەیانەوە فەرمووی: **(لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا) الفتح ١٨.**

راستە هاوەڵان پلەو ئاستی جیاوازیان هەیە لەرووی هەوڵدان و جیهادیانەوە، بەڵام فەزڵی خوای گەورە هەموویانی گرتۆتەوەو، دەفەرمووێت: **(لَا يَسْتَوِي مِنْكُمْ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِنَ الَّذِينَ أَنْفَقُوا مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى) الحديد ١٠.**

ئەبێت چی هەبێت لەم بەڵێنەی پەروەردگار مەزنتر: **(وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى).**

ئەم نەوە پەروەردگارییە قورئانییە موحەممەدییە مەزنە، کەچاوی خەڵکی سەر زەوی بەبینینی هاوشێوەیان لەئیمان و سەقامگیری و ئارامگری لەسەر ناڕەحەتی و، کۆشش و قوربانیدان لەپێناوی خوای گەورەو، دونیا نەویستی لەپێناوی ئایندا، برایەتی لەباوەڕداو، ئیمان بەخوای گەورەو بەوەی خوای گەورە بڕواداران سەردەخات ڕوون دەبێت، وەک ئەوەی خوای گەورە دەفەرمووێت: **(هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ (٦٢) وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنْفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) الانفال ٦٢-٦٣.**

**گیرۆدەبوونی ئەم نەوەیە بەئاشوبی پەرتەوازەبوون:**

قەدەری خوای گەورە وابوو کەئەم نەوە مەزنە بەئاشوبێکی مەزن تاقی بکرێتەوە، کەهەموو شتێکی تێدا تێکەڵ بووبوو، بینایی لێڵ بووبوو، بەڵگەکانیان لێ ونبوبوو، گومان بەسەریدایاندا زاڵ بوبوو، پاڵنەری ئارەزوو لەگەڵ پاڵنەری ئایندا کەوتبووە ململانێ، ئەمەش بووە هۆی بەگژیەکداچوونی براکان و، هەردوو دەستە کەوتنە جەنگەوەو، خوێنی بێتاوانان رژا، کەهاوشێوەو نیوەی ئەوەو دەیەکی ئەو خوێنە لەو بیست و حەوت غەزایەو لەدەرچوونی ئەو مەفرەزانەدا نەڕژا کەژمارەیان دەگەشتە پەنجا ولەسەردەمی پێغەمبەردا روویاندابوو: زیاتر لەحەفتا هەزار کەس لەم ئاشوبەدا کوژران.

ئەم جەنگ وناکۆکییە سیاسیانە بۆیەکەمجار ئەم ئومەتەی دابەشکرد بۆ دوو بەرەی دژبەیەک: ئاشوبەکە دوو بەرەی خەڵکی گرتەوە:

١- بەرەیەکیان دەستی چووە ئەو هاوەڵانەو، ئەو هەوڵ و تێکۆشانەی لەپێناوی ئیسلامدا لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابوویان بەهەدەرداو، بەچاوێکی پڕ گومانەوە سەیری کردن و، هیچ پاساوێکی بۆ نەهێشتنەوەو، کردەوەکانیانی بەجۆرێک لەئیجتیهادی رەوای کاروبارە گۆڕاوەکانی دونیا سەیر نەکرد، کە ئەم فەرموودەی بەڕاستی لەبارەوە هاتبوو: (أنتم أعلم بأمر دنياكم) [1] واتە: ئێوە ئاگادارترن لەکاروباری دونیاتان، هەرکەسیش لەکاروبارێکی دونیاییدا –بگرە لەکاروباری

---

[1] ـ موسلیم لە(الفضائل)دا (٢٣٦٣)و،ئەحمەد (١٢٥٤٤)و، ئیبن ماجە لە(الرهون)دا لەئەنەسەوە گێڕاویەتیەوە.

ئاینەکەشیدا- ئیجتیهاد بکات و نەیپێکێت ئەوا لەپاداشت بێبەش ناکرێت، بگرە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەڵێنی پێداوە کەیەک پاداشتی بۆ هەیە: کەئەویش پاداشتی گەڕان و ئیجتیهادەکەیە، ئەوکەسەشی ئیجتهادی کردو حەقەکەی دۆزیەوە لەئیجتیهادەکەیدا، ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە.

گومانی تێدا نیە لەنێو هاوەڵانیشدا هەبووە هەڵەی کردووە، هەروەک چۆن هەیانبووە لەسەر حەق بووە، بگرە هەیانبووە زیادەڕەوی کردووە بەرانبەر براکەی، لەبەر ئەوەیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەعەماری فەرموو: (تقتلک الفئة الباغیة) [1] واتە: پێڕە زیادەڕەوکارەکە دەتکوژن.

زیاد لەوە دەڵێم: ئەو کەسانەی بەشێوەیەکی گشتی رقیان لەهاوەڵانەو، لەناخیانەوە نیاز خراپن بەرانبەریان و، هەموو خراپەکاری و کارێکی نابەجێ دەدەنە پاڵیان و، بەهەڵگەڕانەوەو دوڕووبوون باسیان دەکەن، بەگوێرەی ئەو تێڕوانینەی بەرانبەریان هەیانە، ئەمەش پێچەوانەی دەقە یەکلاوە بووەکانی قورئان و، یەکلاوە بووەکانی فەرموودەو، یەکلاوەبووەکانی مێژووە.

٢- بەرەی دووەمیش وایدابینێت کەهیچکام لەهاوەڵان هەڵەی کردبێت و، پارێزگاریان لێدەکات و، پاساو بۆ هەموو رەفتارەکانیان دێنێتەوە، با بەئاشکراش دیار بێت کەهەڵەیەو، لەگەڵ کۆدەنگی ئەهلی سوننەو جەماعەدا یەکناگرێتەوە، کەپێیان وایە هاوەڵان بێگوناه (مەعصوم) نین لەهەڵە و گوناه، چونکە لای ئەهلی سوننە تەنها پێغەمبەری خوا بێگوناە (مەعصوم)ە، کەخوای گەورە

[1] ــ بوخاری لە(الصلاة)دا (٤٤٧)و،ئەحمەد (١١٠١١)و، نسائی لە(الکبری فی الخصائص)دا لەئەبو سەعیدی خدریەوەو، مسلیم لە(الفتن)دا (٢٩١٦) لەئوم سەلمەوە گێڕاویەتیەوە.

لەبارەیەوە فەرموویەتی: (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤)) النجم. بەڵام هاوەڵان ـ لای ئەهلی سوننە ـ بە (دادپەروەر) باسکراون، بەو واتایەی: ئەوان لەبارەی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) درۆ ناکەن.

**پێویستی ئەم ماوە ناڕەحەتە بەنووسینێکی وردی بەڵگەدار:**

لەبەر ئەوە ئەم ماوە مێژووییە هەستیارە -ماوەی ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان- پێویستی بەقەڵەمی وردی بڕوادار هەیە، کەزانست و دادپەروەری تێدا بێت، نەک بەنەزانی و ستەم و شوێنکەوتنی ویست و ئارەزوو، بیخاتە بەردەم شیکاری لێکدانەوەو توێژینەوەی بابەتی و پرۆگرامی زانستی پەیڕەو بکات، کەبەهۆیەوە بتوانێت راستیەکان لەژێر داروپەردووی ئەو هەڵبەستراوە زۆرانە دەر بهێنێت کەلەبارەی ئەو ماوەیەوە لەکتێبەکانی میژوودا باس دەکرێت و، گێڕانەوەکان بەگوێرەی (بەرنامەی فەرموودەناسان) لەبەڵگەپێهێنانەوەو لاوازکردندا، یاخود لە تەعدیل و تەجریحدا کاربکات، کەمەنهەجێکی زانستی متمانەپێکراوە، نەک بەلۆژیکی هەواڵگێڕەوەکان، ئەوانەی کەهەرچیان بیست چاک و خراپ، پاک وپیس کۆ دەکەنەوە، هەروەها بەگوێرەی رازیکردنی سۆزی ئەوانەش نا کەلایەنگر یاخود دژ بەم بەرەیە یان ئەو بەرەیەن.

ئەوەتا پێشەوایەکی وەک (ئیبن جەریری تەبەری) کەبەفەرهەنگیبوون ناسراوەو، لەفیقهو تەفسیرو فەرموودەو مێژوودا پێشەوا بووە، لەمێژووەکەیدا لەکەسانی متمانەپێکراوەوە دەگێڕێتەوە، هەروەک چۆن لەکەسانی لاوازەو شوێنکەوتەی ویست

و ئارەزووی وەک سەیفی کوڕی عومەری تەمیمی و واقدی و ئەبو مخنف و هاوشێوەکانیانەوە دەگێڕێتەوە، بیانوشی ئەوەیە کەئەو گێڕانانەوە لەبابەتی حوکمەکان و، حەڵاڵ و حەرامدا نیە، هەر بۆیە ئەو هەرچی بیستبێت گێڕاویەتەوە، بەبێ لێوردبوونەوە یاخود پشکنین، تەنها ئەوەی بەس بووە کەرووداوێکی بەسەنەدەوە گێڕاوەتەوە، هەرکەس سەنەدی بکات بۆت ئەوا شوێنکەوتنی گەڕان بەشوێن سەنەدەکەی خستۆتە سەر شانی خۆت.

بەڵام لەسەدەکانی دواپین و سهردەمی هاوچەرخدا، باسکردنی سەنەد هیچ بەهایەکی نەما، چونکە ئەوەی ئەمڕۆ بەلای مامۆستای مێژووەوە گرنگە: رووداوێک دەگێڕێتەوە بۆ کتێبی تەبەری بەشی ئەوەندە، فلانە چاپی و، ئیدی تەواو.

لەبەر ئەوە پەیڕەوکردنی مەنهەجی فەرموودەناسان لەپێشتر بوو، بگرە پێویست بوو.

**بەرەنگاربوونەوەی شەنقیتی بۆ ئەم کارە گەورەیە:**

ئەوەی جەسورانە بەرەنگاری بوویەوە: کوڕی خۆشەویست و، برای ئازیزمان محەمەد کوڕی موختاری شەنقیتی، توێژەر لەمەڵبەندی قەرەزاوی بۆ میانڕەوی ئیسلامی و نوێکردنەوە لەقەتەر، هێندەش کەرەستەی عەقڵی و زانستی و مەنهەجی لەبەئاگابوونی مێژوویی و، مەعریفەی مرۆیی و، هەستی رەخنەگرتن و، زانستی شەرعی لەبەر دەستدایە کەبۆ ئەو کارە شیاو بێت کەلەقوتابخانەی شەنقیتی بۆی ماوەتەوە کەلەنێو زانایانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا بەچاکەو خزمەتی کەلەپوری ئەم ئومەتە ناسراوە.

ئەم گەنجە پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە چل ساڵی چۆتە نێو ئەم جەنگە زانمستیەوەو، لەدەریایەکی داوە کە زۆرکەسی تێدا نغرۆ بووەو، گەلێک کەس ترسی نزیکبوونەوەیان لێی هەیە، بەهۆی ئەو هەستیارییە زۆرە لەبابەتەکەدا هەیەو، پەیوەستی بەسۆزی گشتییەوەو، هەمیشە سەیرکردنی وەک ئەوەی بابەتێکی گوماناوییە، پێویستی بەوە هەیە ئەو کەسەی خۆی لەقەرەی دەدات خاوەن ئازایەتیەکی ئەدەبی و، زانستێکی تێرو تەواو و، بۆچوونی پەسەندی هەبێت.

ئەمەش وایکردووە لەشەنقیتی کوڕو برامان کەئەم نامەیە بنووسێت، کە بە((سەنگ سوک و، پڕ مادە)) دەیبینێت، ئەوەش لەپوختەیدا بریتییە لە(بانگەشە بۆ نووسینی مێژووی ئیسلامی بەمەنهەجێکی نوێ، پیرۆزی بنەماکان بدات بەسەر پێگەی کەسەکاندا، لەگەڵ دانانی بەچاکەو پایەی پێشینان، لەسنوورێکدا کەبنەماکان رێی پیبدەن، کەلەوەوە ئەو باشەو ئەو پێگەیەیان وەرگرتووە)).

نووسەر ئەم نووسینەی وادانـاوە کەسەر بەفیقهی سیاسییە، زیاتر لەوەی پەیوەنددار بێت بەزانستی مێژووەوە، لەواقیعیشدا پەیوەنددارە بەهەردووکیانەوە، یان بڵێ: ئەو تێکەڵەی هەردووکیانە، لەوانەیە هەندێک کەس وای ببینن کە بۆ فیقهی مێژوو زیاتر لەفیقهی سیاسەتی شەرعی نزیک بێت، بەجۆرێک کەفیقهی مێژوو بەتایبەت لەو ماوەیەدا لەفیقهی سیاسەتی شەرعی نزیک دەکاتەوە.

**هەندێک لەزانایان بۆچوونیان وایە پێویستە قسە نەکرێت لەسەر ئەوەی لەنێوان هاوەڵاندا روویداوە:**

کۆمەڵێک لەزانایان وایدەبینن پێویستە قسە نەکرێت لەسەر ئەو ناکۆکیی و، خوێنڕشتنەی لەنێو هاوەڵاندا ڕوویداوەو، لەمەشدا

پشتیان بەوە بەستووە کەلەو بارەیوە گێڕدراوەتەوە، تەبەرانی و ئیبن عدی لەئیبن مەسعودەوە، لەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گێڕاویانەتەوە کەفەرموویەتی: (اذا ذكر أصحابي فأمسكوا، واذا ذكر النجوم فأمسكوا، واذا ذكر القدر فأمسكوا) واتە: ئەگەر باسی هاوەڵانم کرا بێدەنگ بن، ئەگەر باسی ئەستێرە کرا ئەوا بێدەنگ بن، ئەگەر باسی قەدەر کرا بێدەنگ بن.

لەمبارەیەوە پرسیار لەعومەری کوڕی عەبدولعەزیز کرا، وتی: ئەوە خوێنێک بوو خوای گەورە دەستمانی لێ پاراست، با زمانمانی لێنەدەین.

لەپێشەوا ئەحمەدیش پرسیار کرا، وتی: (تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُمْ مَا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٣٤)) البقرة.

ئەوانە پێیان وایە: بابەتی هاوەڵان وتی وتی و، توێژینەوەو رەخنەگرتنی تێدا دروست نیە، ئەمەش بەهۆی ئەو فەزڵەی لای ئەم ئومەتەو، ئەو شوێن و پایەی لەقورئان و سووننەدا هەیانەو، لەبەر ئەوە فەرمانمان پێکراوە قسەی تێدا نەکەین.

من لێرەدا قسە نەکردن وا لێک دەدەمەوە -زۆرێکیش بەهەمان شێوە لێکیان داوەتەوە- کەبەمانای جوێنپێنەدان و دەمدرێژی نەکردنە بەرانبەریان، پێغەمبەریش (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: (لا تسبوا أصحابي) [1] واتە: جنێو بەهاوەڵانم مەدەن، ئەمە وێڕای رێگەنەدان بەجنێودان بەشێوەیەکی گشتی.

لەبەر ئەوە ئەوانەی لەبارەی عەقیدەی ئەهلی سووننەوە نووسیوویانە هاودەنگ بوون لەسەر ئەوەی قسە نەکرێت سەبارەت بەوەی لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویداوەو، گومانی باشیان پێ

---

[1] ـ متفق عليه.

ببرێت و، بۆ نیەتی خۆیانیان بگێڕینەوەو، چونکە ئەوان بەوەی پێشکەشیان کرد گەیشتن و، پێشینەو هەڵویستەکانیان لەسەرخستنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەبێتە تکاکاریان و، ئەم بابەتەیان خستۆتە پاڵ بابەتی عەقیدە، چونکە شیعە قسەوتن بەهاوەڵ و جنێوپێدانیان کردۆتە کرۆکی بیروباوەڕیان.

لەبەر ئەوە جنێوپێدان و زماندرێژی بەرانبەر هاوەڵانی پایەبەرز قەدەغەکراوە، بەڵام توێژینەوەی زانستی بابەتیانەو، شیکارو لێکدانەوەی ئەو ڕووداوانەو، حوکمدان لەبارەیانەوە یاخود لەسەریان بەهێمنی و بابەتیانەو، پەند وەرگرتن لێیان، بەبێ لایەنگری بۆ بەرەیەکیان دژ بەویتریان بەبێ بەڵگە. هێندەی ئەوهەیکە لەتوانادا بێت: هیچ شەرمێکی تێدا نیە، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی چاکەی هەموویان و ڕێزی هەموویان لای خوای گەورە: (وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى) الحديد ١٠.

ئەو فەرموودەیەشی کەئەوانەی بەپێویستی دەزانن قسە لەسەر ئەو ئاشوبە نەکرێت لەنێوانیاندا روویداوە کردویانەتە بەڵگە، هاودەنگی لەسەر (صحیح) بوون و (حسن) بوونی نیە، لەنێو پێشەوایانی فەرموودەدا هەیە بەلاوازی داناوە.

هەیسەمی وتوویەتی: تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو مەسهەری کوڕی عەبدولمەلیکی تێدایە، کە ئیبن حەیان و جگە لەو بەمتمانەپێکراویان داناوەو، ناکۆکی تێدا هەیەو، هەموو پیاوەکانی تری کەسانی (صحیح)ن[1].

---

[1] ـ مجمع الزوائد ٢٠٢/٧.

مەناوی لە(شرح الجامع الصغیر)دا وتوویەتی: حافزی عێراقی وتوویەتی: لەسەنەدەکەیدا لاواز هەیە.

بەیهەقی وتوویەتی: یەزیدی کوڕی ڕەبیعەی تێدایە کەلاوازە، ئیبن رەجەب وتوویەتی: لەچەند روویەکەوە گێڕدراوەتەوە کەسەنەدەکانی هەموویان (مقال)ن.

مەناوی وتوویەتی: بەهۆیەوە ئەو هێمایەی سیویتی بۆ (حسن) بوونی دەزانرێت، لەوانەیە پشتی پێ بەستبێت[١].

لەوانەیە هەر ئەو لەخۆگرتنەی بووبێتە هۆی ئەوەی ئەلبانی بەژمارە (٣٤) راستی بکاتەوەو، لە(صحیح الجامع الصغیر)یشدا بەژمارە (٥٤٥) هاتووە.

**هەڵوێستی زانایانی سوننە سەبارەت بەوەی لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویداوە:**

مامۆستا شەنقیتی هەڵویستی ئەهلی سوننەی لەمەڕ قسەنەکردن یاخود باسنەکردنی ئەو ئاشوبەی لەنێوان هاوەڵاندا روویداوە خستۆتە روو، ئەمەش گەیاندوویەتی بەپێنج هەڵویست یان پێنج ڕێباز:

١- ڕێبازی ئەوانەی بەرەهایی قسە ناکەن لەبارەی ناکۆکیەکانەوە، قسەکارانی گەورەی سوننەش لەسەر ئەم ڕێبازەن، ئەمانەش لەهەموو خەڵک کەمتر لەبارەی ئەم بابەتەوە نووسیوویانە، سەرەڕای لێهاتووییان لەقسەو مشتومڕو داشکاندنەوەی قسە لەشوێنی تردا.

---

[١] ـ مجمع الزوائد ٢٠٢/٧.

٢- ڕێبازی ئەوانەی داوا دەکەن قسەی تێدا نەکرێت، ئەمە سەرەڕای قسەکردنیان تییدا، وەک زەهەبی لە(تاریخ الاسلام)و (سیر أعلام النبلاء)داو، ئیبن کەسیر لە(البدایة والنهایة)داو، قسەکردنیشیان لەبابەتەکەدا بەوە ڕێگەپێدەدەن کەبۆ مەبەستی زانستی بووە، یاخود مەبەست لەقسەکردن لێی لای ئەوان بەشێوەی تانەدان و سەرکۆنەکردن بووە).

٣- ڕێبازی ئەوانەی باسی ناکۆکیەکەیان کردووە لەگەڵ تەئویل بۆ هەر بەرەیەکیان بەوەی کەهەردوولایان موجتەهیدن و پاداشتیان بۆ هەیە، ئەمەش ڕێبازێکی بەناوبانگی بڵاوە، کۆمەڵی پێشەوایان بەدرێژایی سەردەمەکان پەیڕەویان لێکردووە، بەتایبەت ئەوانەی بەئاگانەبوون لەپشتەوەی ڕووداوەکان و مەبەستەکانی).

٤- ڕێبازی ئەوانەی بەبێ تەئویلکردن باسیان کردووە، لەنێو زانایانی تابیعیندا کەسانێکی وا دەرکەوتوون، وەک حەسەنی بەصری و، ڕەبیعی کوڕی نافیع و جگە لەوان...ئیبن تەیمیەش بەم وتەیەی ئاماژەی پێداوە: (سوودەکەی: ئەوەی کەدەکرێت بزانرێت با باشتریش وا بێت قسە نەکرێت لەوەی لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویداوەو داوای لێخۆشبوون بۆ هەردوو بەرەکە هەموویانیان و لایەنگرانیان بکرێت، بەڵام پێویست ناکات لەو بڕوایەدا بین کەهەموو کەسێک لەسەربازان موجتەهیدو لێکدەرەوە نەبووە وەک زانایان، گوناهبارو خراپەکاریان تێدایە، تێیاندایە بەهۆی جۆرێک لەئارەزوویەوە کەمتەرخەم بووە لەئیجتیهاددا، بەڵام ئەگەر خراپەیەک لەنێو چاکەی زۆردا بوو ئەوا بەلانراوەو لێخۆشبوونی بۆ هەیە)[1].

---

[1] ـ مجموع الفتاوى ٤٣٤/٤.

٥- ڕێبازی ئەوانەی زیادەڕەوی دەکەن لەبەرگریکردندا، بەهەڵچوون و کاردانەوەوەو، خەریکی تەئویلکردنن بۆ هاوەڵ و ئەوانەشی کەلەهاوەڵان نەبوون، بەڕەواو بەناڕەوا، ئەمەش بە(شیعەبوونی سونی) ناوم بردووەو، ئیبن عەرەبی و قوتابیە هاوچەرخەکانی نوێنەرایەتی ئەم ڕێبازە دەکەن.

(( ئەم ڕێبازەی کۆتاییان لەئەمڕۆدا دەنگی بڵندترەو، بەهێزترە، لەبەر چەندین هۆکاری سیاسی و مەزهەبی زۆر کەلێرەدا بواری نیە بیانخەینە روو، لەهەمان کاتدا بێئاگایی رۆڵەکانی ئەم ئومەتە لەوردەکاری مێژووەکەی لەم سەردەمەدا بۆتە بەهێزکاری)).

((بەڵام شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە، خۆی نەبەستۆتەوە بەرێبازێکی تایبەتەوە، بەڵکو بەشارەزاییەوە لەبابەتەکە دواوەو، لەهەندێک شوێندا –بەبێ زۆر لەخۆ کردن-لێکی داوەتەوەو، لەشوێنی دیکەشدا بەڕاشکاوی رەخنەی گرتووەو، مافی تەواوی هەریەکەیان و مافی تەواوی مافیشی داوەو، خۆی دوور گرتووە لەگشتگیری وگەورە کردن و، مکوڕ بووە لەسەر ئەوەی بەهۆی پوچەڵێکەوە حەقێک سەرنەخات، یاخود بەهۆی بیدعەیەکەوە بیدەعەیەکی تر رەت نەکاتەوەو... با ڕێبازی ئەوانەی بەشوێن حەقدا دەگەڕێن بەوجۆرە بێت)).

بەڕاستی توێژەر سەرکەوتوو بووە لەپشت بەستن بەتوێژینەوەکانی ئیبن تەیمیە سەبارەت بەوەی لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویداوە، وەک کەسێک لەم ماوەیەی کۆڵیوەتەوە، بەتێڕوانینێکی مێژوویی شەرعی هاوسەنگ، ئیبن تەیمیە بەوە جیا دەکرێتەوە کەتوانای بەسەر ئەوەدا شکاوە زۆر لێزانانە بگاتە رەگ وڕیشەی شەرعی بابەتەکان، هەربۆیە هیچ سەیر نیە هەمان شت لەبابەتە مێژووییەکاندا بکات، لەمەشدا رۆشنبیرییە فراوانەکە هاریکاری

بووە، بەجۆرێک کەتوانا بەسەر هەڵسەنگاندن و راستکردنەوەدا وشک نەکات و، هاوسەنگانە حوکم بەسەر رووداوەکاندا بدات و، روانگەشی بۆ چوونە نێو ئەو وتی وتیە بریتی بووە لە: بەرگریکردن لەهاوەڵان –بەتایبەت ئەوانەی پێشین- لەبەرانبەر بەوەی کەئەوان بێبەرین لێی و، دابڕانیان لەهەموو باشییەک.

هاوڕای شێخ راشید غەنوشی برام نیم لەوەدا کەڕەخنەی لەنووسەر گرتووە–لەپێشەکیەکەی بۆ چاپی یەکەم- بەوەی کەتەنها پشتی بەئیبن تەیمیە بەستووە.

لەپاڵ ئەمەدا، نووسەر رەخنەی مەنهەجی لەئیبن تەیمیە گرتووەو، بەدژیەکی و دوودڵی لەهەندێک هەڵوێستیدا لەمەڕ هەندێک بابەت، بەتایبەت هەڵوێستی معاویەو تەماعی لەخەلیفایەتیدا و، تێپەڕبوونی معاویە بەچەند قۆناغێکداو، هەڵوێستی پێش دانانی دوو ناوبژیکارەکە، هەمان هەڵوێست نەبووە پاش دوو نابژیکارەکە، نوسەر بەپشت بەستن بەهەندێک ڕووداو مشتومڕی لەسەر ئەم لێکدانەوەیەی کردووەو، منیش لەمەدا لەگەڵیم کەئەمە لەناخی معاویەدا هەبووە، لەوانەشە لەگەڵ هەندێک لەهاوەڵانیدا وەک عەمر خۆیان بۆ ئامادە کردبێت، بەڵام ئەوەی بۆ خەڵکی ئاشکرا نەکردووە تا پاش کۆبوونەوەی دوو ناوبژیکارەکە، قسەی ئیبن تەیمیە لەمبارەیەوە هیچ تیکەڵکردنێکی تێدا نیە، نوسەر پەیڕەوی لەم ڕێسایە کردووە: حوکم بەسەر ڕووکاردا دەدرێت و، ئەوەی پەنهانە بۆ خوای گەورە دەمێنێتەوە.

ئەمەش بەو واتایە نیە کە: ئیبن تەیمیە مەعصومەو لەهەڵە بەدەرە، ئەو خۆشی بانگەشەی ئەمەی بۆ خۆی نەکردووەو، ئێمەش نایکەین بۆی، لەهەندێک بابەتیشدا وێڕای سەرسامبوونم پێی بەڵام پێچەوانەی ئەو بووم، بەڵام دەبێت هەموو زاناو

تویژەرێک لەبارەی شەرع یاخود مێژوو نیەتی ئەوە بێت بگاتە حەق و، بۆ ئەمەش پەیڕەوی مەنهەجێکی دروست بکات و، بەگوێرەی توانای لەمەدا ئیجتیهاد بکات، خۆشویستن یان رقلێبوون لەدادپەروەری دوور نەخاتەوەو، هەمان ئەم پاڕانەوەیەی پێغەمبەری ئازیزی لەخوای گەورە بکات: ((اهدنی لما اختلف فیه من الحق باذنک، انک أنت تهدی من تشاء الی صراط مستقیم)) [1]

واتە: بەویستی خۆت لەوەدا رێنوێنیم بکە کەتێیدا جیاوازم تێیدا، چونکە هەرتۆ رێنوێنی هەرکەس دەکەیت کەویستت لەسەر بێت بەرەو شارێگەی ڕاست.

ئەم برایەمان بیست ودوو ڕێسای زانستی داناوە، کەلەخوێندنەوەی فراوانی و، لێکۆڵینەوەی زۆری لەبابەتەکە لەهەموو ڕووەکانی و، لە ڕامانی قوڵی و، هاوسەنگیە بێلایەنەکانی لەنێوان هەڵوێستە جیاوازەکان و، بۆچوون و حوکمە جیاوازەکانەوە وەریگرتوون و، لەمەشدا سوودمەند بووە لەوەی پێشەوایانی ئەم ئومەتە ئەوانەی لەزانستدا قوڵ بوون و بەهاوسەنگی ناسرابوون و مەنقولی راست و، مەعقولی راشکاویان پێکەوە کۆ کردبووەوە نوسیوویانە، بەتایبەت شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە کەزۆری لەوەوە گوازتۆتەوە، پشتی پێ بەستووەو، لەمەشدا لەسەر حەق بووە، باهەندێک تێبینی کەمیشی لەسەری هەبووبێت، چونکە لەزانستدا گەورەیی نیەو، ئەویش بەهەرحاڵ مرۆڤەو مەعصوم نیە.

---

[1] ـ موسلیم گیڕاویەتیەوە ٥٣٤/١ فەرموودەی ژمارە ٧٧٠، دار احیاء التراث العربی- بیروت، تحقیق: محمد فؤاد عبدالباقی.

لەراستیدا ئیبن تەیمیە لەتوێژینەوەو نامەو فەتواکانیدا بایەخی زۆری بەم بابەتە داوە، هەروەک لە(مجموع الفتاوی)دا دەبینرێت، کەگەشتۆتە سی وپێنج بەرگ، هەروەها بەفراوانی و قوڵی لەکتێبی (منهاج السنة)دا لێی دواوە، لەکاتێکدا کەوەڵامی نوسەرێکی شیعەی داوەتەوە، کەلەکتێبی (منهاج الکرامة)دا بەشێوەیەکی نەشیاو قسەی لەبارەی هاوەڵانەوە کردووە، ئیبن تەیمیە تەنها بەوە جیا ناکرێتەوە کەزۆری نوسیوە یاخود بەفراوانی نوسیویەتی، بەڵکو بەوردی جۆرایەتیەکەی کەنووسیویەتی و، توانیویەتی پارێزگاری لەباشەی هاوەڵان وپلەو پایەیان وپیرۆزی ئەو پەیام وبنەماو بەهایانەی کەهێناویانە بکات.

سەرەڕای ئەمانە-هەروەک شەنقیتی دەڵێت- کە((زۆرێک لەوانەی -لەئەمرۆدا- سەر بەقوتابخانەی ئیبن تەیمیە دادەنرێن وبانگەشەی ئەوە دەکەن کەمەنهەجی ئەو لەم بوارەدا پەیڕەو دەکەن، خوێندنەوەیەکی وردی تێگەیشتوانەی ئەم بابەتەیان نەکردووە کە ئەو نووسیویەتیو، لەخەسڵەتی هاوسەنگی و هاوتایی تێنەگەیشتوون کەلە مەنهەجی ئەودا پەیڕەو کراوە، لەبەر ئەوە هەندێکیان لەمشتومڕەکەیدا لەگەڵ شیعەدا رادەی خۆیان تێپەڕاندوەو، هەندێکجار بەپوچەڵ بەرگریان لەحەق کردووەو، هەندێجار وێنەیەکی شێواوی بنەما سیاسیە ئیسلامیەکانیان نیشانداوە، ئەمەشیان لەروانگەی بەرگری لەهاوەڵانی بەڕێز ئەنجام داوە)).

(خودی شێخی ئیسلامیش هۆشداری لەبارەی ئەم شێوازەی بیروڕاگۆڕینەوە داوەو، رەخنەی لەوانە گرتووە کەبەروڕووبوونەوەی شیعە ناڕەحەتی کردوون (پوچەڵیان

بەپوچەڵ و، بیدعەیان بەبیدعە وەڵامداوەتەوە)[1]، لەمەترسیەکانی ئەم مەنهەجە بۆسەر حەق و شوێنکەوتووانی لەڕێی ئاگاداربوونی لەو مشتومڕانەی لەنێوان موسڵمانان و شوێنکەوتووانی پەڕاوە ئاسمانیەکانی تردا دەکرا زانیوەو، وتوویەتی: (شوێنکەوتووانی کتێبە ئاسمانیەکان (اهل الکتاب)حەق و پوچەڵیان لێ تێکەڵ بووە بەهۆی ئەو کەمە حەقەی کەلایانەو.... زۆرێک لەو موسڵمانانەشی کەنەیاریان دەکەن لەوانەن کەجیاوازی ناکەن لەنێوان حەق و باتڵداو، ئەو بەڵگەیە ناهێنێتەوە کەباتڵەکە تێکدەشکێنێت و، ئەو بەڵگەیە روون ناکاتەوە کەخوای گەورە بەپەیامبەرەکانیدا ناردوویەتی و، بەهۆی ئەمەشەوە ئاشوب بەرپا دەبێت) [2].

ئیبن تەیمیە بەڕوونی جیاوازی کردووە لەنێوان خەلافەت و پاشایەتیدا کەهیچ کەس بەر لەو ئەوەی نەکردووەو، رایگەیاندووە کە(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە هەواڵی نەمانی خەلافەتی پێغەمبەری داوە سەرکۆنەی پاشایەتی و نەنگی بۆ ئەو تێدایە) [3]و، پاشایەتی (وازهێنان لەهەندێک پێویستی ئاینی تێدەکەوێت)[4]، ئەوەشی رەتکردۆتەوە ئەو شوینگرتنەوەیەی لەنێوان ئەبوبەکرو عومەردا ڕوویدا وا لێکبداتەوە کەخزمەت بەبیرۆکەی میراتگرێتی دەسەڵات بکات... ئەمەیە جیاکردنەوەی بنەما و کەس و، وەحی و مێژوو).

لەوانەیە هەندێک کەس بۆچوونیان لەبابەتەکانی عەقیدەدا لەگەڵ ئیبن تەیمیە جیاواز بێت، وەک ئەوانەی بەدروستی دەزانن

---

[1] ـ مجموع الفتاوى ٥١٣/٤.
[2] ـ مجموع الفتاوى ١٩٠/٣٥.
[3] ـ مجموع الفتاوى ٢١/٣٠.
[4] ـ مجموع الفتاوى ٢٤/٣٥.

ئایەتەکانی صیفات و فەرموودەکانی صیفات تەئویل بکەن، یان ئەوانەی داواکردن لەپێغەمبەران وپیاوچاکان ڕێگەپێدەدەن، یاخود ئەوانەی لاسایکردنەوەی مەزهەب بەواجب دەزانن و، دەرچوون لێی بۆ زانا یاخود کەسی تر بەدروست نازانن، بەڵام لەم بابەتە زانستیە کە لەسەر مەنهەجیەت و بابەتیبوون و بەویژدانانە ئەنجام دراوە، ئاین و ئاکاریان ڕێگایان پێنادات کەلەگەڵی نەبن.

**بیست ودوو ڕێساکەی شەنقیتی:**

ئەو بنەمایانەم خوێندەوە کەشەنقیتی براماں لەلێکۆڵینەوەکانی ئیبن تەیمیەو جگە لەو دەریهێناون، لەراستیدا چێژم لەخوێندنەوەیان وەردەگرت، داوای سەرکەوتنی زیاترم بۆ دەکرد، هیچ کەسێکی خاوەن زانست و بەویژدان ناتوانێت وای ببینێت ڕێسایەک لەو ڕێسایانە بسڕدرێتەوە، بەڵکو بەتەواوەتی پێکاویەتی، ئەمەش بەرهەمی خوێندنەوەی بەرچاوڕوونانەو، تێڕوانینی هەمەلایەنەو، بیرۆکەی هاوسەنگ و، ویژدان زیندوویی بووە کەچاک وەک چاک و، خراپ وەک خراپ ببینێت.

**چوار ڕێسا پێشنیاز دەکەم زیاد بکرێت:**

من سەرسامم بەوڕێسا مەنهەجیانەی کەنووسەر پێیانەوە پابەند بووە لەلێکۆڵینەوەکەیدا و، بونەتە رۆشنایی بەخشی ڕێنمایکار رووەو گرتنەبەری مەنهەجی ناوەندگیری، کە کەم وزیادی تێدا نەبێت، بەڵام من حەزدەکەم کەچوار ڕێسای تر بۆ ئەو ڕێسایانە زیاد بکات، وایدەبینم کەببێتە تەواوکاری ڕێساکانی خۆی.

**باشبوونی سەدەکانی پێشین (خيرية القرون الاولى):**

ڕێسای یەکەم: باوەڕبوون بەباشێتی سێ سەدەی یەکەم، کەفەرموودەی صەحیحیان لەبارەوە هاتووەو بڵاوەو، ڕووداوەکانی مێژووی دروست ئەوەیان سەلماندووە کە: قورسایی ڕزگاریی ئیسلامی کەوتۆتە ئەو ماوەیەوە، کەڕزگاریی دادو سۆز بووەو، نەک داگیرکاری وچەوساندنەوەو، نەتەوەکانی هێنایە ناو ئیسلامەوە، لەرۆژهەلاتەوە تا دەگاتە چین و هیندستان، لەرۆژئاواشەوە تا ئەندەلوس.

مامۆستا شەنقیتیش پابەند بووە بەمەنهەجی فەرموودەناسانەوە لەچەسپاندن و بەلاوازدانانندا، لەبەر ئەوەی لەسەری پێویستە پابەندیش بێت بەفەرموودە صەحیحەکانی لەبارەی باشێتی ئەو سەدانەوە هاتووە، کەسەردەمی ڕاشیدین و سەردەمی بەنی ئومەییە بەشێوەیەکی گشتی دەگرێتەوە، ئەمە زۆر گرنگە بۆ هەڵسەنگاندنی سەردەمی بەنی ئومەییە بەگشتی و، سەردەمی دامەزرێنەرەکەی بەتایبەتی.

**ئومەتی ئیسلام تەنها بریتی نیە لەفەرمانڕەواکان:**

ڕێسای دووەم: بەو پێیەی کە(ئومەتی ئیسلامی) بریتییە لەجەماوەرو گەلانی موسڵمان، فەرمانڕەواکان بەشێکی ئومەتن و، هەموو ئومەت نین، کەم وکورتی زانستی (مێژووی) تۆمارکراویش ئەوەیە: زیاتر چاوی لەسەر سەرکردەو فەرمانڕەواکان و، لایەنی سیاسیەو، گرنگی بەکۆی ئومەت هەموویان نادات، لەوانەیە فەرمانڕەواکان لابدەن و ستەم بکەن، بەڵام ئەوە تەنها لەسنووری کۆشکی فەرمانڕەواو ئەو کەسانەی لەدەوروبەرینی قەتیس دەبێت، بەڵام تێکڕای ئومەت باشن، فەرمانڕەوایانی ئەو سەردەمەش

دەسـەڵاتیـان نـەبـووە بـەسـەر فێرکـردن و دادگـاو هـەڵس وکـەوتـی خـەڵکیـدا، بگـرە دەسـەڵاتـی زانایـانی بـەهێزتـر بـووەو، بـاڵادەسـتی دەوڵـەت بـەسـەر هـەمـوو تواناکـانی گـەلانـدا لـەخـەسڵەتـەکـانی ئـەم سەردەمەیە، هەروەک فـەیلـەسـوفی بـەریتـانی (برتـرانـد راسـل) وای گوتووە.

زانستی مێژوو لای ئێمە بەویژدان بووە بەرانبەر کەسانێک، ئەو کاتـەی کـەتـەنها باسـی ژیـانی پادشـاو سـەرکـردە سـەربازییـەکـانی نەکردووە، بـەڵکـو باسـی ژیـان و سـەربـوردەی زانایـانی لـەهـەمـوو پیسپۆڕێتیەکان و، پیاوچاکان و زاهیدەکان و، ئەدیبان وشاعیران و، دانایان و، پزیشکان و هەموو چین و توێژەکانی تر کردووە.

**ئیسلام مەرجەعی باڵای ئومەتە:**

ڕێسای سێیەم: جەخت کردن لەسەر ئەوەی کەئیسلام بەردەوام مەرجەعی باڵا بووەو، ئاراستەکاری یـەکـەمـی هـەمـوو ئومـەتـە لـەم سەردەمانەدا، نەک تـەنها لـەسـەردەمـی هـاوەڵان و تابیعیندا بـەس، بەڵکو لەدواتریشدا، ئەو قسەیەشی گوایە ئیسلام لەپاش خەلیفەکانی ڕاشـــیدین یـــان وەک وتـــراوە پـــاش عومـــەر لـــەیاســـادانان و، ئاراستەکردن دوور بووە، قسەیەکی راست نیە، چونکە ئەم ئومـەتـە جگـە لـەئیسلام مـەرجـەعێکـی تـری نـەبـووەو، جگـە لـەشـەریعـەتـی ئیـسلام هـیچ یاسـایەکـی تـری نـەبـووە، کـەهـەر ئـەو لـەدادگاکانیـدا لـەهـەمـوو شـوینەکـان حـوکمی پێکـراوەو، خوێنـدن تـەنها لـەژێـر دەســـەڵاتـــی زانایـــانی ئیـــسلامدا بـــووەو، جـــەمـــاوەری ئومـــەت لـەبـەڕێکردنـی کاروبـارەکانیـدا تـەنهـا بـۆ لای زانایـانی ئومـەت دەگـەڕایـەوەو، ئـەو قسـەیـەشی کـە سـەردەمی (خـەلافـەت) کۆتـایی هاتووەو، بەهاتنی معاویە سەردەمی (پاشایەتی) دەستی پێکردووە،

بەو مانایە نیە کەئیسلام وەلا کەوتبێت، یاخود بڵێسەکەی خامۆش بوبێت.

پێشتر کتێبی (تاریخنا المفترى علیه)م دانا لەوەڵامی پرسیارێکی گەورەدا کەئاراستەی من و جگە لەمنیش کراوە، ئەویش بریتییە لەوەی: ئایا ئیسلام وەک شەریعەت و، مەنهەجی ئومەت و، سیستمی ژیان، پاش سەردەمی خەلیفەکانی راشیدین کۆتایی هات؟ وەڵامەکەش بەرەتکردنەوەیە بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە، هەروەک چۆن لەو کتێبەمدا بەڵگەم بۆ هێناوەتەوە.

**هەڵسەنگاندنی رووداوەکان لەچوارچێوەی سەردەمی خۆیاندا:**

ڕێسای چوارەم: هەڵسەنگاندی ڕووداوەکان یاخود قسە لەسەر کردنیان لەچوارچێوەی سەردەمی خۆیدا بێت، کەتییدا ڕوویداوە، بەپێی ڕێکارو پێوەرە باوەکانی ئەو سەردەمە، نەک بەگوێرەی پێوەرەکانی سەردەمی ئێستامان هەڵسەنگاندنی بۆ بکەین و، ستەم لەحەقیقەت بکەین و، ئەوەی لەسەردەمی خۆیدا لەوانەیە بچوک بێت ئێمە گەورەی بکەین، یاخود ئەوەی لەو سەردەمەدا مەزن بووە ئێستا ئێمە بچوکی بکەینەوە.

ئەگەر بەپێوەری ئەم سەردەمەمان کەتییدا بیرۆکەی (دیموکراسیەت)بڵاوبۆتەوەو، شۆڕشی گەلان لەدژی فەرمانڕەوایەتی ڕەهادا بەرپا بووەو، گەلان ئەو مافەی خۆیان بەدەست هێناوە کەخۆیان فەرمانڕەواو نوێنەرانیان هەڵبژێرن، ئەگەر بەو چاوەوە سەیری بابەتێکی وەک (چەوساندنەوە- استبداد-) بکەین، ئەوا چەوساندنەوە (استبداد) بەتاوانێکی گەورە دادەنێین، بەڵام بەپێوەرەکانی جیهانی ئەو سەردەمانە، سەرکوتکردن و چەوساندنەوە بەسەر زۆرینەی فەرمانڕەوایانی

جیهانی ئەو کاتەدا زاڵ بووە، بگرە خراپەکاری و سەرکوتکردن و خۆبەگەورە گرتن بەناڕەوا لەسەر زەویدا زاڵ بووە.

ئەگەر بەپێی پێوەرەکانی ئەو سەردەمە سەیری (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بکەین، ئەوان دەبینین لەدادپەروەرترین فەرمانڕەواکان بووە، تا دەگاتە ئەوەی ئیبن خەلدون وتوویەتی: دەکرا معاویە بەهۆی باشەی ئەوەی کەهاوەڵ بووەو ژیاننامەی باش بووە بدرایەتە پاڵ خەلیفەکانی راشیدین، بەڵام ئەگەر بەئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلی بیپێوین ئەوا تەرازووەکەی ئابڕوبەرانە دەردەچێت، لەبەر ئەوە ئیبن تەیمیە بەباشترین و دادپەروەرترین ئەو پادشایانەی دوای خۆی هاتوون داناوەو، دەکرێ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەوە هەڵاوێرد بکرێت کەبەخەلیفەی پێنجەمی ئەژمار کردووە.

ئەم ڕێسایەش نزیکە لەڕێسای (وەرگرتن بەپێی ڕێژەیی سەردەمەکە-الاخذ بالنسبیة الزمانیة)، با لەگەڵیشیدا نەبێت.

**ڕخنەگرتن لەپێشەوا ئیبن عەرەبی:**

بەڕاستی سەرسام بووم بەبوێری نوسەر، کاتێ ڕەخنە لەزانا گەورەکانی پێشین و، فەرموودەناسان دەگرێت و، لەم ڕووەوە ڕەخنەی لەعەلامە ئەبوبەکری ئیبن عەرەبی گرتووە، لەسەر ئەوەی لەکتێبی (العواصم والقواصم) لەو بەشەی باسی ڕووداوەکانی نێوان هاوەڵان دەکات.

لەڕاستیدا من لەو کەسانەم کەسەرسامن بەئیبن عەرەبی بەهۆی ئەو هێزو ڕاشکاویەی لەئیجتیهادو خستنە ڕووی بیروبۆچوونیدا لەسەر حوکمەکان و بابەتەکان هەیەتی و، گوێی لەوە نیە بەهۆی ڕاگەیاندنی بۆچوونەکانیەوە ڕووبەڕووی کەسانی

تر ببێتەوە، چەندین فەرموودەی ڕەتکردۆتەوە کەجگە لەو قبوڵیان کردووەو، بۆچوونی وای هەڵبژاردووە کەپێچەوانەیە لەگەڵ مەزهەبی خۆی (کەمەزهەبی مالکیە)، هەروەها بۆچوونی ئەبو حەنیفەی لەپێویستبوونی زەکاتدا لەهەموو ئەوەی لەزەوی دەردەچێت پەسەند کردووەو، لەکاتێکدا ئەم ئایەتەی سورەتی (الانعام) راڤە دەکات: (وَهُوَ الَّذِي أَنْشَأَ جَنَّاتٍ مَعْرُوشَاتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَاتٍ وَالنَّخْلَ وَالزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُتَشَابِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ كُلُوا مِنْ ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَآتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ) الانعام ١٤١، وتوویەتی: بەڵام ئەبو حەنیفە ئەم ئایەتەی کردۆتە ئاوێنەی و حەقی پێ دۆزیوەتەوە[1].

بەڵام نوسەر ڕەخنەی لەوە گرتووە کەلەکتێبی (العواصم)دا هێناویەتی و، عەلامە (محب الدین الخطیب) حاشیەی لەسەر نوسیووە، شەنقیتی ڕەخنەی لەمەنهەجی نوسەرو حاشیەنووس گرتووەو، لەهەندێک جێگادا توندی کردووە لەسەریان و، خۆشی کەوتۆتە هەمان شتی کەڕەخنەی لێ گرتووە، ئیدی سروشتی مرۆڤ وایە.

نوسەر ئەو ڕێسایانەی خۆی خستۆتە ڕوو کەئەو مەنهەجەی پەیڕەوی کردووە بۆمان ڕوون دەکاتەوە، کەپشتی بەئیبن تەیمیەو رەخنەگران لەفەرموودەناسان بەستووە، لەسەر ئەوە تێڕوانین و بۆچوونی خۆی دروست کردووە، پاشان گفتوگۆی لەگەڵ ئەوانەدا ئەنجام داوە کەناوی (قوتابخانەی شیعەگەری سونی) لێناون کەقازی ئیبن عەرەبی و، قوتابیە هاوچەرخەکانی (محب الدین الخطیب و ئەوانەی هاوبۆچوونین) گوزارشتی لێدەکەن.

---

[1] ـ ابن العربی: (احکام القران ٢٣٨/٢) دار الفکر، لبنان، تحقیق: محمد عبد القادر عطا.

شەنقیتی ڕەخنە مەنهەجیانە لەئیبن عەرەبی هەیە ڕوونی کردۆتەوەو، لەهەشت دانەدا دیاری کردووە:

١- سەرکوتکردن و توندی (السطوة والشدة).

٢- ستەمکردن لەوانەی پێچەوانەی بوون (التحامل على المخالفين).

٣- پەلەکردن لەوەڵامدانەوەی فەرمودە صەحیحەکان (التسرع فی رد الاحادیث الصحیحة).

٤- زۆرلەخۆکردن و زۆرکردن لەسەلماندنی بۆچوونی هاوڕاو، ڕەتکردنەوەی بۆچوونی پێچەوانەی (التکلف والتعسف فی اثبات الرأی الموافق، ونفی الرأی المخالف).

٥- بەڕەهایی ڕەتکردنەوەی ئەو بەڵگانەی کەپێی نەگەیشتوون، یاخود نەگەیشتوونەتە وڵاتەکەی (الاطلاق فی نفی الادلە التی لم تصل الیە، أو الی بلدە).

٦- گەورە کردن و موبالەغەکردن(التهویل والمبالغة).

٧- گوازتنەوەی کۆدەنگی لەوبابەتانەدا کەناکۆکیان لەسەرە (نقل الاجماع فی الامور الخلافیة).

٨- توندی سروشتی (حدة الطبع).

بۆچوونی من وایە کەخاڵی یەکەمیان: سەرکوتکردن و توندی (السطوة والشدة)و، خاڵی کۆتاییان توندی سروشتی (حدة الطبع) ناچنە ناو ڕەخنەی مەنهەجیەوە، بەڵام لەخەسڵەتە دەروونیەکانە، باکاریگەری لەسەر مەنهەجیش هەبێت، لەمەشدا نوسەر چەندین بەڵگەی لەسەر هێناوەتەوە، کەهەندێکیان بەدەر نین لەوەی تێبینیان لەسەر بێت.

هەروەها نوسەر قسەی لەسەر حاشیە نوسی سەر کتێبەکە کردووە کەعەلامەی موحەقیق (محب الدین الخطیب)ە، کەسەرقاڵ

بووه بەبەرگری لەهاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێت)و، لەبارەی (ئەوەی یەکەم)ەوە نووسیویەتی و مافی خۆیانی پێداون و، بەرگری لە(هەڵگرانی پێشینی ئیسلام کردووە)و بەویژدان بووە بەرانبەریان، بەڵام نوسەرەکەمان لەزیادەڕەویەکانی لەبەرگریکردن لێیان قسەی لەسەر کردووە، هەتا دەکرێت بچێتە نێو ئەوانەی کەئیبن تەیمیە لەبارەیانەوە وتوویەتی: بەبیدعەیەک بیدعەیەکیان ڕەتکردۆتەوە! لەبابەتی بوون دوور کەوتونەتەوەو، ئەوەی فەرموودەکانی کتێبەکەی تەخریج کردووە شێخ (محمد مهدی الاسلامبولی)بووە.

دەبێت ئەوەش بڵێم کەبانگخوازی گەورەی ئیسلامی شێخ محمد غەزالی هاتۆتە نێو ئەم جەنگەوە کاتێ ڕەخنەی لە (الخطیب) گرتووە بەوەی بۆچوونی ئیبن عەرەبی وەرگرتووە لەوەی کە ئەهلی حەل و عەقد دەکرێت لەیەک کەسدا خۆی ببینێتەوە، شێخ (محب الدین) وەڵامی شێخی غەزالی داوەتەوە کەئەوە حوکمێکی شەرعییە چۆن غەزالی دەتوانێت ڕەتی بکاتەوە؟ غەزالیش بەم وتەیە وەڵامی داوەتەوە: کێ وتوویەتی حوکمی شەرعییە؟

هەروەها نوسەر تێبینیەکانی لەسەر کتێبی (العواصم) خستۆتە ڕوو، بەسەر سێ بەشدا پۆلێنی کردوون: حوکمەکانی لەسەر دەقەکان و، حوکمەکانی لەسەر ڕووداوەکان و، حوکمەکانی لەسەر کەسەکان.

لەپاڵ ئەمەدا نوسەر بەویژدان بووە بەرانبەر ئیبن عەرەبی کاتێک وەک قازی قسەی لەبارەوە کردووە.

**ڕەخنەکانی (غضبان) لەسەر (شنقیطی):**

بەخێرایی ئەوەم خوێندەوە کەبرای لێکۆڵەرم، بانگخوازی پەروەردەکار (د.منیر الغضبان) لە(جولات نقدیة) سەبارەت بەکتێبەکەی شەنقیتی نووسیوویەتی، لەگەڵ خۆشەویستی و ڕێزم بۆ (غضبان)، بینیم لۆژیکی شەنقیتی لەمیانڕەوی و بابەتی بوون نزیکترە، لەوانەیە لەهەندێک لەوتێبینیانەی لەسەری هەیەتی و نمونەی بۆ هێناوەتەوەو کردویەتیە بەڵگە راست بێت، بەڵام لەدروستی هیچ ڕێسایەک لەڕێساکانی مشتومڕی لەگەڵ نەکردووە.

تێبینی ئەوەم کردووە کەزۆرێک لەبرایانی خەڵکی شام بەرگریکردن لەبەنی ئومەیەیان بەمیرات پشتاوپشت بۆ ماوەتەوە، با ئەوە بەشتێک لەزۆر لەخۆکردن و زیادەڕەویشەوە بێت، تەنانەت دکتۆر غەزبان (تورەیە) لەپێشەوا ئیبن تەیمیەو، وا باسی دەکات کەئەو شایستە نیە بۆ ئەوەی حوکم لەسەر بابەتە مێژووییەکان بدات! چونکە ئەو لەئەهلی فیقهە، نەک ئەهلی فەرموودەو مێژوو، باشە ئەبێت کێ ئەهلی فەرموودە بێت؟ ئەمە لەکاتێکدایە کەوتوویانە: هەر فەرموودەیەک ئیبن تەیمیە نەیناسیبێت ئەوا فەرموودە نیە! ئەهلی فەرموودەش لەم سەردەمەماندا بریتین لەشوێنکەوتووانی ئیبن تەیمیە!

ڕاستە ئیبن تەیمیە وەک (ذهبی) یاخود (ابن کثیر) یان (ابن حجر) کتێبی لەسەر مێژوو نەنووسیووە، چونکە ئەو سەرقاڵ بووە بەڕاستکردنەوەی عەقیدەو چەمکەکان و، ڕەتکردنەوەی شتە پڕوپوچەکان لەسەر هەموو ئاستەکان، لەبەر ئەوە تەنها ئەهلی فیقهـ نەبووە، بەڵکو پڕ بەواتای وشەکە پیاوێکی مەوسوعی بووە.

ئەوەی ڕەخنەم لێیەتی لەقسەکانی دکتۆر غەزبان: پێچەوانە بوونی بۆچوونیەتی لەوەی کەشەنقیتی گوازتنەوەی خەلافەتی

ڕاشیدین بۆ پادشایەتیەکی پشتاو پشت خستویەتیە ئەستۆی معاویەو بەنی ئومەیە، کاتێ سیستەمی پشتاو پشتی دامەزراند، بەوەی بەیعەتی بە زۆرو ترساندن بۆ یەزیدی کوڕی وەرگرت، لەکاتێکدا کەلەنێو ئومەتدا هاوەڵانی وەک ئیبن عومەرو ئیبن زوبەیر هەبوون، ئەو تاوانی ئەم کارەی دەکەوێتە ئەستۆ.

بەڵام غەزبان دەڵێت: ئەوە تەنها ئیجتیهادێکی هەڵەیەو بەس! دەیەوێت لەلێکەوتەکانی ئەو کارە مەزنە دەربازی بکات، کەبووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی ڕاشیدین و شوراو، کردیە کیسرایی یاخود قەیسەریی، لەمەدا هیچ بەرپرسیارێتیەکی نەخستۆتە ئەستۆی، بەڵکو خستویەتیە دەروازەی ئیجتیهادی هەڵەوە، واتە ئەو لەسەر ئەو کارە خراپەی کەسیستمی سیاسی ئومەتی تێکداو ئەو جێکەوتانەی لێکەوتەوەو تائێستاش لەنەهامەتیەکانیەکانیدا دەتلێتەوە هێشتا لەسەر ئەم کارە خراپە پاداشتێکی بۆ هەیە.

منیش کتێبێکم نووسوە تییدا بەرگری لەمێژووی ئیسلامیمان دەکەم و، ناوم ناوە (تاریخنا المفترى عليه)، تێیدا وەڵامی ئەوانەم داوەتەوە کەئەو ئاشوب و ململانییانەی لەمێژوومانداا ڕویانداوە گەورەیان کردووەو، ڕووداوەکان و کەسەکان و، پاڵنەرەکانیان شێواندووەو، ئیسلامیان واداناوە کەلەپاش سەردەمی ڕاشیدینەوە یاخود لەپاش عومەرەوە کۆتایی هاتووە، بگرە هەیانە وایداناوە کەبەوەفاتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆتایی هاتووە، تەنانەت بەوەش تۆمەتباریان کردم کە من بەرگری لەبەنی ئومەیە دەکەم، یاخود بریکاری بەنی ئومەیەم!! لەڕاستیدا من بەرگری لەمێژووی ئومەت دەکەم، بەرگری لەسەدە چاکەکانی دەکەم، بەرگری لەو هەڵەو تاوانانە ناکەم کەمعاویە، یاخود عەمری کوڕی

عاص، یان مەروانی کوڕی حەکەم، یان ئەوانەی لەوان باشترن تێی کەوتوون، لەگەڵ ئەمەدا بەهۆی ئەم تاوان و هەڵانەوە، گەورە بێت یان بچوک، ئەوەی لەمێژوودا کردوویانە ناسرِمەوە، لەوباوەڕەدام کەئەمە مەنهەجی ئیبن تەیمیەش بووە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، ئێمە فەرمانمان پێکراوە کەدادپەروەر بین لەشاهێدیداندا، بائەو شاهێدیە لەسەر خۆمان یان دایک وباوکمان یان کەسانی نزیکمان بێت، ڕقبوونمان لەکەسانێک وامان لێ نەکات دادپەروەر نەبین: (رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنْتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ) الاعراف ٨٩.

**یوسف قەڕزاوی**
**سەرۆکی یەکێتی جیهانی زانایانی موسڵمان**
**دەوحە، لەمانگی ذی الحجة ١٤٣١ ک**
**بەرابنەر بە نۆڤەمبەری ٢٠١٠ز**

## پێشەکی شێخ ڕاشد غەنوشی:
## کتێبێکە شایستەی ئەوەیە بخوێنرێتەوە و دووبارە بخوێنرێتەوە

لەو ژمارە کەمە کتێبەی کەلەوڵاتانی عەرەبی چاپ دەبێت (ئەوەی لەهەموو وڵاتانی عەرەبی چاپ دەبێت ناگاتە ئەوەی لەیەک وڵاتی بچوکی ئەوروپی چاپ دەبێت) کەمێکیان دەخوێندرێنەوە، ئەوەشی شایستەی خوێندنەوە بێت لەنێویاندا زۆر کەمە، گومانم لەوە نیە کەکتێبی (ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان) کەلەنووسینی مامۆستا محەمەد موختار شەنقیتییە لەهێڵی پێشەوەی ئەو کتێبانەیە کەشایانی خوێندنەوەن، لەو کتێبە دەگمەنانەیە کەچێژم لەخوێندنەوەی بینیبێت وکەمەندکێشی کردبم بۆ بەردەوامی و تەواوکردنی خوێندنەوەی، هەرکاتێ سەرقاڵیەکانی ژیان لەخوێندنەوەی دایبڕیبم.

سەرەتا وەک ئەرکێکی برایانەو بەدەمەوەچوونی داواکاری نووسەر دەستم بەخوێندنەوەی کرد، کەئەو ڕێزەی لێنابووم پێشەکییەک بۆ کتێبەکەی بنووسم کەتێیدا کتێبەکە پێشکەشی خوێنەران بکەم، بەڵام کەچەند لاپەڕەیەکم لێ خوێندەوە- وەک ئەنجامدانی ئەرکێکی برایانە- بەڵام خوێندنەوەکەم گۆڕاو خودی خوێندنەوە بووە مەبەست، یاخود بڵێین بەهۆی ئەو چێژە ڕۆحییەی بەدەروونی دەدات لەگەڵ خوێندنەوەی هەموو لاپەڕەیەکیدا، بگرە لەگەڵ هەموو بڕگەیەکیدا کەلەم سەرچاوە مەعریفیە سازگارە هەڵیدەمژێت، کاتێ بەشوێن ڕێکخستنە وردە قوڵەکەیدا بۆ بیست و دوو ڕێساکە دەچیت کەکردویەتیە مەنهەج بۆ مامەڵە لەگەڵ قۆناغی

دامـەزرانـدنی شارسـتانیەتـی ئیـسلامی لـەرۆژی سـەقیفـەوە، ئـەو رۆژەی ئـەرکـی ریّنـویّنی مرۆڤایـەتـی لـەقۆنـاغی پیّغـەمبـەری مـەعصومەوە گۆڕا بۆ قۆنـاغی جیّنشینی مـرۆڤ کـەهـەڵـە دەکـەن، سەروەختی بەرجەستەکردنی راسپاردەکەی پیّغەمبەری سـەرکردە (علیـە الـسلام) دەسـتی پیّکـرد کـەلـەرۆژی ماڵئـاوایی کـردن لەئومەتەکەی پیّی فـەرمـوون: (فلیبلـغ الشاهد منک الغائب) –متفق علیە–، واتـە: بـا ئـەوانـەتـان ئامادەن لیّرە ئـەوانـەتـان ئاگـادار بکـات کەلیّرە نین.

هـەروەک چـۆن شـیّخ حـەسـەن بـەننـا سـەرکـەوتـوو بـوو لـەدارِشـتنەوەی ئیـسلام و مـەنهـەجـی گـەیشتن بـەحـەقیقـەتـەکـانی لـەبیـست بابـەتـی تـەواو ڕوون و وردا، ئـەمـیش وەک زنجیـرەی بنەماڵەی شەنقیتی دەستپاک لەخزمەتی ئەم ئاینە–زانست وئاداب و جیهاد–دا سەرکەوتوو بووە لـەباسکردنی قۆنـاغی دامـەزرانـدنی شارستانیەتی ئیسلامی لـەهـەمـوو ڕەهـەنـدەکانیـەوە، ئـەو قۆناغـەی کـەتییـدا یـەکبـوونی موسـڵمانان و کۆمـەڵگـای ئیـسلامی تیّیـدا دوو کـەرت بـوو، هـەتـا ئیّستاش برینـەکـە بـەردەوامـەو، بـەتیپـەڕبـوونی کـاتیش زیـاتر قـوڵ دەبیّـت، بـەتایبـەت بـەهـۆی ئـەو نمونانـەی بوژاندنـەوەی ئاینییـەوە لـەئـەمـڕۆدا هـەن و ئـەو موژدانـەی پیّیانـە، کەبەدەر نین لەزیادەو توندڕەوی و، ئەو ئاگرەی ئاشوب و کوشتار خـامۆش بـووە گـەش دەکـەنـەوە، هـەتـا باشـترین سـەردەم و نزیـک لـەنمونـەیـی ئیـسلامی گـۆڕی –یـاخود وەخـت بـوو بیگۆڕیّـت– بـۆ گۆڕەپـانی ناکۆکییـە بیّکۆتاییـەکـان و، سـەرچـاوەیـەکـی بـەفیڕۆدانـی بیّـسنووری تواناکـانی ئیـسلام و، بناغــەی تیّکـدانی کۆمــەڵگــەی ئیـسلامی.. لـەبـری ئـەوەی ببیّتـە بنچینـەی کـۆدەنگی و، ڕوگـەیـەک کەریّنویّنی سـەرلیّشیّواوان بکـات، ئـەمـەش بـەهـۆی ئـەو مـەنهـەجـە

هەڵانەوە بوو کەباسی ناکۆکییەکانی نێوان هاوەڵانی بەمێژوو گێڕانەوە پاشان بەتەئویلکردن دەکرد، لەخزمەتی مەبەستانێکدا یاخود خۆگونجاندن لەگەڵ نەفامیەکاندا، ئەمەش دوورە لەوەی کەئیسلام لەسەر موسڵمان پێویستی کردووە لەپابەندبوون بەمەنهەجی زانستی و دادپەروەریی پێکەوە.

وادیارە وروژاندنی سەرلەنوێی ئەو ململانێیانەی لەنێو هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێت) ڕوویداوە -ئیدی مەنهەج و مەبەست هەرچییەک بێت- جۆرێکە لەکولاندنەوەی برینەکە، یاخود گەڕانێکی نوییە بۆ سەرخستنی مەزهەبێک یاخود لایەنێک، یان خراپەکاری لەئاست بەرانبەر، ئەمەش وا لەدەروونە باشەکان دەکات کەبەرەهایی خۆ دوور بگرن لەم بوارە، بەهۆی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هەڕەشانەی کە لەئێستادا بەروڕوویان بۆتەوە کەئەوانەی بەسەو زیادیشە لێی، لەوانەش تێیدا جۆرێک لەکات کوشتن و دورکەوتنەوە لەڕووبەڕوبوونەی ئەوەی ئێستاو، کەوتنە نێو گێژاوی ئاشوبی تیدا ببینێت کەتێیدا کەسانی بەتوانا جگە لەکولاندنەوەی برین و پەرتەوازەیی زیاتر لێی دەرنەچوون.. بەجۆرێک کەوادیارە هەڵوێستی هەرە گونجاو ئەوە بێت لاپەڕەی ئەو قۆناغەی مێژوومان بەچاک وخراپییەوە دابخرێت، تەنها بەوە وازبهێنین کەداوای لێخۆشبوون و بەزەیی بۆ هەموویان بکەین: (تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُمْ مَا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٣٤)) البقرة.

لەگەڵ ئەوەدا کەوازهێنان بەرەهایی لەباسکردن یاخود بیرکردنەوە لەوەی کەڕویداوە وەک گریمانەی تیۆری چاوەڕوان نەکراو وایە، چونکە چۆن دەکرێت ئومەتێک دوور بخەیتەوە

لەباسکردنی قۆناغێک دامەزراندنی تییدا بووەو، سەردەمی زێڕینی بووە، تەنانەت ئەگەر ئەوەش لەتوانادا بێت- کەئەوە ناکرێت- سوودی نابێت، بەهۆی ئەو گرێ و ناتەواییە زۆرەی لەبونیاتی کەسێتی شارستانی ئومەتدا بەجێی دەهێڵێت، بگرە ئەوە هەر دروست نیە، چونکە ئێمە فەرمانمان پێکراوە کەبیانکەینە پێشەنگ: (علیکم بسنتی وسنة الخلفاء الراشدین من بعدی) [1]، واتە: سونەتەکانی من و سونەتی خەلیفەکانی راشدینی پاش منتان لەسەر پێویستە.

باسکردنی ڕووداوەکانی دامەزراندن ناتوانیت خۆتی لێ دور بگریت، بەڵکو ئێمە فەرمانمان پێکراوە بەئەنجامدانی بەهۆی ئەو نزیکخستنەوەو سوودانەی لەهەموو کاتێکدا تییدایە بۆمان.

ئەگەر لەمەنهەجیەتی زانستی پتەودا سەرکەوتوو بووین کەهەردوو ڕێسای زانست و دادپەروەری پێکەوە کۆکردبووەوەو، بەئاگاداری تەواوەوە لەبابەتی توێژینەوەکە ئەنجام درا، دڵ لەمەبەستەکان پاک کرایەوەو جگە لەمەبەستی دۆزینەوەی ڕاستی و دەستگرتن پێیەوە، ئەمەش لەمامۆستا شەنقیتیدا هاتووەتە دی و سەرکەوتنی زۆری بەدەستهێناوە لەم کتێبەیدا کەلەڕووی قەبارەوە بچوکە بەڵام سوودو کەڵکی مەزنی دەبێت.

لەرستیدا مامۆستا شەنقیتی خزمەتێکی گرنگی پێشکەش بەنەوەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی هاوچەرخ کردووە لەڕێی دووبارە خویندنەوەی ڕووداوەکانی ناکۆکی نێوان هاوەڵان، کەمێژوومانی تائێستاش بەڕەنگە تایبەتەکەی ڕەنگرێژ کردووە، بەپێی جۆری ئەو خویندنەوە ئایدیۆلۆجیەی کەبۆی دەکرێت، خۆ

---

[1] ـ أخرجه الترمذ وصححه وابن حبان والحاكم، وضعفه ابن القطان الفاسی).

ئەگەر خوێندنەوە ناتەواوەکان ئیدی  بەهۆی کەم وکورتی زانستی بێت یاخود نادادپەروەری یان هەردووکیان پێکەوە، ئەوا تا ڕادەیەکی زۆر بەشدار بووە لەلێدانی هێزی یەکگرتوویی و سەربەرزی ئومەتەکەمان، تەنانەت لەسەردەمێکدا کەدوژمنانیھاوسەنگی هێز بەلایاندا نەشکابوویەوە، باشە ئێستا چۆن بکرێت لەکاتیکدا کەهاوسەنگی هێز لای ئەوان زۆر مەزنترەو، بالأدەستن بەسەرماندا و، لەجەرگەی دارلئسلامدا لێیان داوین و، سەردەمەکانی هەڕەشەو ترساندن هەموو ئەوەی پەیوەست بێت بەعەقیدەو فیکرو ڕۆشنبیری و ئابوری و سیاسی  ئەم ئومەتەوە گرتویەتیەوەو، گەیشتۆتە ئاستێک فشاری چڕ بخرێتە سەر دامەزراوەکانی چاپکردنی قورئان و، دامەزراوەکانی فێرکردنی ئاینیی و، ڕاگەیاندنی خەرجکردنی بودجە بۆ سەپاندنی مەنهەجی عەلمانیەت، هەموو ئەمانە ڕوودەدات وشمشێری داگیرکەریش لەسەر سەرمانە..

لەبری ئەوەی لەم جۆرە کەشەدا رۆشنبیری کۆدەنگی و یەکخستنەوەی ریزەکان لەنیوماندا بلاو ببێتەوە، بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسیەک کەهەڕەشەیە بۆ سەر ئومەتەکەمان بەهەموو پێکهاتەو لایەنەکانیەوە، لەنیوەندەکانی ڕابوونی ئیسلامیدا- کەپاش خوای گەورە پشت بەو دەبەسترێت بۆ ڕووبەڕوبوونەوەی مەترسیەکان- بانگەوازو مەنهەجی زیادەڕەوی و تەکفیر سەرهەڵدەدات وبڵاو دەبێتەوە بۆ حەڵاڵکردنی خوێن و سامانی بێتاوانان و، بڵاوکردنەوەی ترس و کوشتار لەنێوان موسڵمانانداو، بانگکردنی نەتەوەکان تر بۆ سەری.. بێئاگابوون لەو خاکە داگیرکراوانەی کەخەڵکەکەی داوا لەبراکانیان دەکەن بەهانایانەوە بچن وپشتیوانی جیهادی ڕزگاریخوازیان بکەن و، هەروەها خۆ دوور گرتن

لەمافە ونبووەکان لەنیو ئومەتداو ئەو شەریعەتانەی کاری پێناکرێت، کەپێویست دەکات هەموو تواناکان لەپێناوی یەکخستنی ڕیزەکانی جەنگاوەرانی مسوڵمان بخرێتە گەڕ، ئەوەی کەوەحی بەباشە باسی کردووەو هانمان دەدات لەسەری: (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ (٤)) الصف.

بۆ ئەمەش هیچ ڕێگایەکی دیکە نیە جگە لەدووبارە بونیاتنانەوەی متمانەی بەیەکەوە بوون، بەڵگە نەویستە کەزیادەڕەوی زۆر لەوە دوورە کەبتوانێت کەبەم ڕاپەڕینە هەستێت، بگرە لەهەموو ڕوویەکەوە دژیەتی، بەهۆی ئەو ڕۆشنبیری تەکفیرو وەدەرنان و، قۆرخکردنی قسەکردن بەناوی ئاسمانەوە، دوور لەمەنهەجێتێکی مامناوەند کەتەنها ئەو دەتوانێت کۆدەنگی دروست بکات، لەپێناوی ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی کارای ئەو هەڕەشەو مەترسیە ناوخۆیی و دەرەکییە گەورانەی ڕوبەڕوی ئەم ئومەتە بۆتەوە.

بەڕاستی مامۆستا شەنقیتی سەرکەوتوو بوو لەتوێژینەوەو شیکاری ئەو ناکۆکیانەی لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویدا بەپابەندبوون بەڕێسای مەنهەجی ڕوون و وردو ڕەسەنەوە، وەک (جیاکردنەوەی کەسەکان و بنەماکان و، لەنێوان وەحی ومێژووداو، پەسەندکردنی پیرۆزی بنەماکان بەسەر پێگەی کەسەکان لەگەڵ دانان بەچاکەی پێشینەکان لەو سنوورەدا کەبنەماکان ڕێگەی پێدەدا).. کەنارەحەتی لەسەر بڕواداران هەڵبگرێت لەوەی بەهەستکردن بەگوناهباریەوە باسی ئەو قۆناغە بکەن، هەروەها دەبێتە ڕێگر لەبەکارهێنانی سیاسی لەبەرژەوەندی حزبی زیادەڕەوی شیعە، لەبەرانبەر (بەشیعەکردنی سوننەدا) کەهەندێک لەسوننە بەپاساوی وەڵامدانەوەی زیادەڕەوی شیعەپەیڕەوی دەکەن، هەربۆیە پەنایان

بردۆتە بەر بەرەنگاربوونەوەو، چونـەتـە نێو کـاروانێکی سـەختـەوە بۆ بەرگری لـەسـتـەم وچـەوسـاندنەوەو هـەڵگـەڕانـەوەی سیاسـی و، ڕەگ داکوتینی راڤەی پلانـدانان بـۆ مێـژوو، بـەسـەر داروپـەردووی حــەقیقــەتــی مێژوویــی بــەڵگــەدارداو، مــەبــەســتەکــانی ئیــسلام لەدادپەروەری و شورا...

مامۆستا شەنقیتی لەڕاستکردنەوەی تێڕوانینی نـەوەکانی نـوێی ئیسلامدا بـەرانبـەر قۆنـاغی دامـەزرانـدن سـەرکـەوتـوو بـووە، بـەو خزمـەتـە گـەورەیـەی بـەبیـردۆزەی سیاسـی ئیـسلامی کـردووەو، جـەختـی لـەسـەر بـاڵادەسـتی ئومـەت بـەسـەر فـەرمـانڕەواکانیـدا، بەوپێیەی کەجێنشینی خوای گەورەو پێغەمبەرە بۆ گەیاندنی ئاین.

نـوێی هـەرە گرنـگ لـەمـەدا پـشت بـەسـتنیەتـی بـەمـەنهـەجـی فەرموودەناسان لەمامەڵەکردن لـەگـەڵ ئـەو گێڕانـەوانـەی لـەبـارەی ڕووداوەکانی ناکۆکییەوە هاتوون، بـەجۆرێک هـەلی جیاکردنـەوەی لەنێوان ڕاست و ناڕاستدا بۆ ڕەخساندووە، گرنگی ئـەمـەش لـەوەدا خــۆی دەبینێتــەوە کــەزۆرجــار زیــادەڕەوی و تونــدڕەوی لــەم سەردەمەماندا خۆی بەشانازیکردن بـەزانایـانی پیشینەوە پـڕ چـەک دەکـات و، ئـەو پێناسـەیـان بـۆ خـۆیـان قـۆرخ کـردووە و، خـۆیـان بەشێخی ئیسلام و قوتابیەکانی لەزانایان و فەرموودەناسان بەسەر ئەوانەدا دەردەخەن کەپێچەوانەی ئەمـانن، هـیچ دوودڵ نین لـەوەی هەموو کەم و کورتیەکی وەک رۆژئاوایبوون یاخود لاساییکردنەوە یاخود کاڵاکەی لەزانستی فەرموودەدا بێبەهایە بدەنـە پـاڵ ئـەوانـەی سەرپێچی ئەمان دەکەن، بەشێوەیەک کەمتمانە بەهەموو وتارەکەی ناهێڵێت ئەگەر دروستیش بێت و، سـەرخستنی وتـارەکـەیـان ئـەگـەر لـەراستیـشـەوە دوور بێت، ئیـدی ئـەمـە لـەلایـەنـی سـەنـەدەوە بێت یاخود لەلایەنی راستی دەرئەنجامەوە.

ئـەم کتێبـەی قـەبـارەی بچوکـە، لـەواتـا بـەخـشیندا گـەورەیـە، بەسـوورربونی لـەسـەر یـەکلابوونـەوەی لێکۆڵینـەوەی گێڕانـەوە ئـەو کەلێنە پڕ دەکاتەوە، وەک سوربوونی لەسەر پشت بەستنی نیمچە تەواوی لەسەر باسکردنی بابەتەکانی ناکۆکی نێوان هاوەڵان لەڕێی کـەلـەپـوری شـێخی ئیسلام ئیبن تـەیمیـە، بـەتایبـەت لـەمـەوسـوعە بەرزەکەیدا (منهاج السنة).

هەرچەندە شێخی ئیسلام (ڕحمەتی خوای لێبێت) و خوای گەورە بەهەموو چاکەیەک پاداشتی بداتـەوە بایـەخی بەئیسلام و شایستەی هەموو ڕێزو پێزانینێکە لەزۆر ڕووەوە کەداهێنانی تێدا کردووە، لەوانە بابەتەکانی ناکۆکی نێوان هاوەڵان و پێشەوایان، لەگەڵ ئەوەدا هـەندێ لەنـاڕەحـەتیم لـەناخدا بـۆ دروست بـووە بـەهـۆی زۆر چڕبوونـەوەی قسەکردن لەسەر کەلەپورەکەی، وەک ئەوەی بەتەنها لەیەک تـادا بێت و هەموو زانایانی دیکەی ئیسلامیش لـەتایـەکـەی دیکـەدا بن و هێشتا ئەم لەوان سەنگینتر بێت..!! ئەمەش زیادەڕەوییە لەوانەیە سوودبەخش بێت بۆ ئەو مەبەستەی کەمامۆستا شـەنقیتی ویستوویەتی لـەدابڕینی زیادەڕەوی و توندوتیژی کەلەگرنگترین چـەکـەکانین کـەقسـەی خـۆی بـەسـەر ئومـەتـدا پێـدەکـات: چـەکـی زانـستی گێڕانـەوە (الروایـە)و کەلەپوری شێخی ئیسلام ئیبن تـەیمیـە، ئـەگـەر توندڕەوی و تـەکفیـرو تەفسیری پلانگێڕی بەرانبەر مێژوو و بەشەرعیکردنی چـەوساندنەوە لەو دوو چەکانە بن، لەخزمەت کۆدەنگی و میانڕەوی و ناوەندبوون و شـوراو دیموکراسیـەت، ئـەوەش چاکـەیـەکـە بـۆ مامۆسـتا شـەنقیتـی حساب دەکرێت ئەگەر ڕێنمـایی بکرێت بـۆلای: (يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ (٢٦٩)) البقرة.

**ڕاشد غەنوشی**

**لەندەن لە ١٥ی ڕەمەزانی ١٤٢٤ ک**

## پێشەکی نووسەر بۆ چاپی نوێ

سوپاس بۆ خودا، سوپاس و ستایشێکی پڕ واتا، درودو سڵاو لەسەر پێغەمبەری کۆتا، دواتر:

لەڕاستیدا ئاریشەی شارستانێتی ئیسلامی لەکرۆکیدا ئاریشەیەکی دەستورییە، ئارشیەیەکە دەستپێکەکەی لەشەوی (سەقیفە)دا بوو، لە(جمل)یشدا گۆڕا بۆ ئاشوبێکی کوێرانە، لە(صفین)دا جەنگێکی داپڵۆسێنەری لێ کەوتەوە، لە(صفین)دا هێز سەرکەوت بەسەر حەقدا و، زیادەڕۆیی (البغی) بەسەر دادپەروەریدا زاڵبوو، پاشایەتی بەسەر خەلافەتدا، هەتا ئێستاش موسڵمانان دەستەوسانن لەدەربازبوون لەم تەنگەژە دەستوورییە، وێڕای هەبوونی چەندین بنەمای رێنمایکار بۆ چۆنیەتی بونیاتنانی دەسەڵات و بەڕێوەبردنی، سەرەڕای هەبوونی ئەو ئەزمونە مرۆییە هاوچەرخەی لەپەند وەرگرتنی بەسوود لەم بوارەدا. لێرەدا چەخت لەوە دەکەمەوە کەلەپێشەکی چاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسم کردووە، ئەویش بریتییە لەوەی ((ئەم ئومەتە لەم ئاریشە مێژووییەی دەربازی نابێت تا ئەو کاتەی تێنەگات چۆن کەوتۆتە ناوی))، دەرچوون لەم ئاریشە دەستورییە مێژووییە ڕونادات بەبێ لێکۆڵینەوە لەو ناکۆکییە سیاسیانەی لەسەدەی یەکەمی کۆچیدا لەنێوان هاوەڵاندا سەریهەڵدا، پێویستە بەعەقڵێکی بێلایەنانەوە لێی بکۆڵرێتەوەو، پیرۆزی بدرێتە بنەماکان نەک پێگەی کەسەکان، هەروەها بە تێگەیشتنێکی هەستانەوە نەک خەڵک ترسێنەرە(وثاب غیر هیاب) روبەڕوی گرێی بیردۆزەی باوی

بابـەتـەکـە ببێتـەوە، لـەگـەڵ پابـەنـدبوون بـەدروسـتی گوازتنـەوەو سەلماندن لەگێڕانەوەکاندا.

ئەوەی جێی نیگەرانییە بەڕاستی بەربەستانێکی چڕی پیرۆزی خـەیـاڵی هـەتـا ئێستاش لـەنێـوان ئێمـەو خوێنـەرانـی ئـەو قۆناغـەی بناغەدانانی مێژووی ئیسلامدا هەیەو، ئەمـەش وا لـەخـودی تـوێژەر دەکـات لـەنێـوان شـیعە کـەخـراپ مێـژووی هـاوەڵان دەخوێننـەوەو، سونە کەڕێگـە نـادەن ئـەو مێـژووە بخوێنرێتـەوەو، لـەنێـوان ئـەوەی مێژوو خراپ دەکات و، ئەوەی ڕێگرە لەباسکردنی ببـەسـترێتەوەو، لەم نێوەندەشدا بەهۆی دەمارگیری تائیفیەوە ڕاستیەکان ون بوون. ئەمە چاپی نوێی کتێبەکەم ((ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هـاوەڵان: نامەیەک سەبارەت بەپێگەی کەسەکان و پیرۆزی بنەماکان))ە، بەبێ گۆڕانکاری یاخود دەستکاری لەنێوەرۆکی کتێبـەکـەدا، کـە لـەمـاوەی حەوت ساڵی ڕابردوودا چەند چاپێکی دەرچـووەو، لـەلایـەن زانایـان و بـاوەڕدارانـەوە پێـشوازی باشـی لێکـرا و بایـەخـی زۆری پێـدرا، ئەمەش لەفەزڵی خوای گەورەوەیە.

بـەڵام ئـەم چاپـە بـەپێشەکییـەکـی شـێخمان عـەلامـە قـەڕزاوی ڕازاوەتەوەو بۆتـە پێشەکییـەکـی زیـادکراو، بـەوهیوایـەی نیگـەرانـی ئەوانە نەهێڵێت کەبەباسکردنی ئـەم باسـانە نیگـەران دەبـن، چونکە شـێخ قـەڕزاوی بـەوە ناسـراوە -سـوپاس بـۆ خـودا- کـەزانـستی شەرعی و هەڵوێستی شـەرعی پێکـەوە کۆکردۆتـەوە، وابـەناوبانگـە کـەبـەبێ بـەڵگـە بـوێری قسەکردنـی لـەبـارەی ئیسلامەوە نـەبێت، پێشەکییەکەی شێخی قـەڕزاوی دەچێتـە پـاڵ ئـەو پێشەکییـە قوڵـەی مامۆستامان بیرمەندی ئیسلامی راشد غەنوشـی کـەچـاپی یـەکـەمـی ئەم کتێبەی پێ ڕازایەوە.

لەلای منەوە ئەوپەڕی ڕێزو پێزانین هەیە بۆ هەردوو مامۆستا قەرەزاوی و غەنوشی.

ئەو ساڵانەشی کەتێپەڕین، لەپاش کۆتایهاتنم لەنوسین ئەم کتێبە لەساڵی ٢٠٠٣، بەڵگەیە لەسەر بایەخی ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان و، کاریگەری لەسەرداڕشتنەوەی شارستانیەتی ئیسلامی بەوشێوەیەی کەبۆمان ماوەتەوەو، پێویستی بەقەڵەمە بێلایەنەکانە بۆ ڕونکردنەوەی ئەو ناکۆکیانەو پەند وەرگرتن لێیان، چونکە هیچ شتێک نیە یادگەی مێژووی ئیسلامی وەک ئەو ناکۆکیانەی کەلەنێوان هاوەڵاندا سەریهەڵدا دارژتبێتەوە، هیچ شتیکیش نیە وەک ئەو بوببێتە پاڵنەری ئەو گیانی تایفەگەرییە توندەی کە پێکەوە ناشیرینترین ڕوویمان لەسەردەستی شیعەو سوننە لەعێراق بینی – هەروەک چۆن لەسوریا کۆبوونەوەی هەرێمیی شیعەکانم لەڕووی شۆڕشی بەرزی سوریادا بینی– وەک وێنا شێوینراوەکانی ئەو ناکۆکیانەو، خوێندنەوەی بەوجۆرەی لایەک دەیەوێت، بەدەروونێکی جۆشدراوەوە، یاخود یادگەیەکی تۆڵەکردنەوە، بەشیکردنەوەو درێژەدانەوە لەلێکۆڵینەوەیەکی تایبەتدا بەزمانی عەرەبی لەبارەی (الشيعة والسنه بين التواصل والقطعية) باسی ئەم یادگە مێژووییە تەقاوەیەم کردووە، لەلێکۆڵینەوەیەکی فراوانیشدا بەزمانی ئینگلیزی سەبارەت بە(أثر الحروب الصليبية على العلاقات السنية الشيعية) لێی دواوم.. لەبەر ئەوە نامەوێت لەم پێشەکیەدا دووبارە قسەی لەبارەوە بکەم.

هەندێک کەس ڕێزو پێزانینی خۆیان بۆ ئەم کتێبەو ئەو هەوڵە ڕەسەنەی تێیدا کراوە دەربڕیووە، هەندێکیش خۆپارێزیان بەئاست و ڕادەی جیاواز لەتوندی بەرانبەری دەربڕیووە، سوپاس و پێزانینم هەیە بۆ ئەوانە لەسەر گرنگیدانیان بەکتێبەکەو، لەسەر

یارمەتیدانیان بۆم لەسەر زیاتر رامان لەوبۆچوونانەی تییدا هاتووەو، جەخت کردنەوە لەسەر بەتینی ئەو ڕێسا زانستیانەی لەسەری بونیات نراوە، لەگەڵ ئەمەشدا من جگە لەپاساودان بەستەمی سیاسی و، مافدان بەناچاری و سەرشۆڕی و، لاوازی لەگوازتنەوە (نقل) گێڕانەوەو، نەگونجان لەگەڵ لۆژیک و بەڵگەهێنانەوە هیچ شتێکی زیاترم نەبینی، دەمویست بەڕەهایی خۆم لەوەڵامدانەوە دوور بگرم، چونکە ڕقم لەمشتومڕو بگرەو بەردەیەو، نامەوێت کات و هەوڵی خوێنەر بەوەڵام و وەڵامکاریەوە بکوژم، لەگەل ئەمەدا چەندین برای بەڕێز مکوڕیان کرد لەسەر وەڵامدانەی مامۆستای بانگخواز دکتۆر منیر غەزبان کەلەسەر کتێبەکە نوسیبووی، هەربۆیە تێبینیە مەنهەجیەکانم بۆ وەڵامی دکتۆر مونیر وەک پاشکۆیەک لەکۆتایی کتێبەکەدا دانـاوە. من سەرم لەکەسانێک سوڕ دەمێنێت کەزۆر لەخۆیان دەکەن بۆ پاساودان بۆ ئەوانەی بەهۆی چاوچنۆکی سیاسیەوە دەیان هەزار لەباشترینی هاوەڵان و شوێنکەوتووان، کەتێیان لەپێشیانانی بەدریشیان لەنیودایە بکوژرێت، لەکاتێکدا ئەوانە ئەو سەرزەنشتە توندە دەزانن کەپێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم)، سەرکۆنەی کوڕی خۆشەویستەکەی ئوسامەی کوڕی زەیدی پێ کرد کاتێ دەشتەکیەکی کوشت کە شایەتومانی هێنابوو لەچرکەساتەکانی بەر لەکوشتنیدا، لەئوسامەوە دەگێڕنەوە:

((پێغەمبەر خوا(صلی الله علیه وسلم) ئێمەی بۆ حەرقەی لای جەهینە ڕەوانە کردبوو، لەگەڵ ئەو هۆزەدا ڕوبەڕوو بوینەوەو بەسەریاندا سەرکەوتین، دەڵێت: من و پیاوێکی ئەنصاری روبەڕوی پیاوێکیان بوینەوە، کاتێ لێمان ترسا وتی: لا الە الا اللە، دەڵێت: ئەنصاریەکە وازی لێهێناو من بەڕمەکەم لێمدا هەتا کوشتم، کاتێ

ئەو هەواڵە گەیشتەوە بەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێی فەرمووم: ئەی ئوسامە ئایا پاش ئەوەی وتی لا اله الا الله کوشتت! دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو بۆ خۆپاراستن وایوت، دەڵێت فەرموی: پاش ئەوەی وتی لا اله الا الله کوشتت! دەڵیت: هێشتا هەر دووبارەی دەکردەوە بۆم هەتا ئاواتەخوازبووم کەخۆزگە پێش ئەو ڕۆژە موسڵمان نەبومایە (صەحیحی بوخاری، فەرموودەی ژمارە ٦٤٧٨و. صەحیحی موسلیم-فەرموودەی ٩٦)، جا ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم سەرکۆنە ناخۆشەی ئوسامە دەکات بەهۆی کوشتنی دەشتەکیەکی نەناسراو، ئێمەش بێین زۆر لەخۆمان بکەین بۆ پاساو دۆزینەوە بۆ کەسانێک کە نەگەیشتبوونە ئاست و پایەی ئوسامە و لەئاست و پایەشی نزیک نەبووبوونەوەو، دەیان هەزاریان لەهاوەڵ و شوێنکەوتووان کوشت؟!

محەمەدی کوڕی سیرین کەلەشوێنکەوتووانە ژمارەی کوژراوانی جەنگی (صفين)ی بەحەفتا هەزار مەزەندە کردووە، لەمبارەیەوە دەڵێت: ((ژمارەی کوژراوانی رۆژی (صفين) گەیشتە حەفتا هەزار، بەخورما نەبوایە نەدەتوانرە بژمێردرێن، لەسەر هەر یەکێکیان خورمایەک دانرا، پاشان خورماکان ژمێردران)) (مصنف ابن أبی شیبة ٥٤٩/٧)، وردی و تەواوی ئەم ژمارەیە هەرچۆنێک بێت، گومانی تێدا نیە کەکوشتارێکی مەزن بووە لەمعاویەو عەمرو هاوەڵانیانەوە دەستی پێکردووە، جا ئایا بێزاری دەربڕین لەو کارەیان و سەرکۆنە کردنیان، وەک ئەو سەرکۆنەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەرانبەر ئوسامەی کوڕی زەید کردی هەڵەیەکی شەرعییە، لەکاتێکدا جیاوازییەکی گەورە هەیە لەڕووی قەبارەو شێوەو ئامانجی ئەوەی ئوسامە ئەنجامیدا، لەگەڵ ئەوەی

کەسەرکردەکانی سوپای شام لە(صفین)دا کردیان: ئوسامە تەنها یەک کەسی کوشت، لەکارێکدا کەهیچ شوێنەواری بۆ پاش خۆی نیە، لەکاتێکدا سەرکردەکانی سوپای شام لە(صفین)دا دەیان هەزار لەباشترینی موسڵمانانیان کوشت و، پایەکانی خەلافەتی ڕاشیدینیان وێران کردو، سیستەمی پشتاو پشت و ستەمکاری و چەوساندنەوەیان دامەزراند؟! چی لەوە بێزراوترە زۆرلەخۆکاران بەم قسەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لێکدانەوە بۆ ئەوانە بکەن کەبەعەماری کوڕی یاسری فەرمووەو لەڕێسای حەڤدەیەمی ئەم کتێبەدا هێناومانەتەوە: ((ویح عمار، تقتله الفئة الباغية، يدعوهم الى الجنة ويدعونه الى النار) (بخاری ١٧٢/١) واتە: عەمار گروپێکی زیادەڕەوکار دەیکوژن، ئەم بانگیان دەکات بۆ بەهەشت، ئەوان بانگی لێدەکەن بۆ لای ئاگر.

جا ئایا ئەم قسەیەی بۆ ئەوانە دروستە لەکاتێکدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت ئەوان بانگی دەکەن بۆ لای ئاگر کەئەوان ئیجتیهادی تێدا بکەن و پاداشتیان بۆ هەبێت لەسەری؟! ئەگەر وابێت کەواتە چەند کەمنرخە ئیجتیهاد!! ئیفلیجی لەیادگەی مێژووییمان و، کەم وکورتی لەپێوەری زانستیمان و، لادانمان لەپێوەرە رەوشتیەکان، لەنێو ئەو هۆکارانانەدان کەئومەتەکەمان بەهەمەجیەت و چەوساندنەوەوە بەڕێوە ببرێت، پاش ئەوەی هەموو نەتەوەکان بەئازادی و دادپەروەریەوە بەڕێوە دەبرێن، بەلام بەهاری عەرەبی گەشاوە کەلەتونسی سەوزەوە سەرچاوەی گرت ئاسۆی مێژووییەکی نوێی بۆ ئومەتەکەمان کردەوە لەپێناوی گەڕاندنەوەی ئازادی و کەرامەتی و، دابڕان لەکەلەپوری کۆیلەکردن و چەوساندنەوە،

ئومێدەوارم ئەم کتێبە خشتێک بێت لەبونیاتنانی تیۆری و، لەحەقیقەتی مێژووییەوە بگوازرێتەوەو، یادگە شێوێنراوەکە پاک بکاتەوەو، بناغەی شارستانیەتی ئیسلامی لەسەر بنچینەیەکی بەتینی شەرعی سیاسی و سیاسەتی شەرعی دابمەزرێنێت، ئەمەش خشتێکە هیوادارم ببێتە هاندەر بۆ ئەوانەی لەڕووی پێگەیشتنەوە باشتر بۆ هەنگاو هەڵگرتنیان لەپێناو دارشتنەوەی فیقهی سیاسی ئیسلامی سەرلەنوێ بەجۆرێک کەلەئاستی بەهاری ئێستاماندا بێت. هیچ شتێک نیە وەک ئاوێتەبوونی مرەکەبی زانایان و خوێنی شەهیدان شارستانیەت توندوتۆڵتر بکات، خوای گەورەی بێ هاوتا بۆ هەموو کارێکی چاک پشتیوانە.

**محەمەد کوڕی موختاری شەنقیتی**
**دەوحە لە: ١٧ی سەفەری ١٤٣٤ک-٣١**
**دیسەمبەری ٢٠١٢ی ز.**

## پێشەکی نووسەر بۆ چاپی یەکەم

ئەم نامەیە کێشی سووکە و، ناوەڕۆکی سەنگینە، مەبەستی نوێکردنەوەی خوێندنەوەیە لەتوێژینەوەی ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت)و، دەرچوون لەبازنەی مشتومڕوگفتوگۆکردنە لەبابەتەکانی بەباشزانی لەنێوان هاوەڵان و شەرعیەتی خەلافەتی ڕاشیدین -کەئەوانە بابەتگەلێکی تیۆرین عەقڵی موسڵمانی بەبێ هودە بەهەدەر داوە- بەرەو بازنەی ڕەگ و ڕیشەدارو شیکردنەوەو بەهاپێدان، لەم نامەیەدا خەمی جیاکردنەوەی نێوان کەس و بنەما، نێوان وەحی و مێژوو حوکم دەکات، پوختەی ئەمەش بانگەوازە بۆ دووبارە نووسینەوەی مێژووی ئیسلامی بەمەنهەجێکی نوێ، بەجۆرێک کەپیرۆزی بدرێتە بنەماکان و بەسەر پێگەو پایەی کەسەکاندا پێش بخرێت، لەگەڵ داننان بەچاکە و پێگەی موسڵمانانی پێشین لەو سنوورەدا کەبنەماکان ڕێی پێدەدەن، کەهەر ئەو بنەمایانەشە ئەو چاکەو پێگەی بەوان بەخشیووە.

ئەم نامەیە گێڕانەوەی ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان نیە یاخود چوونە نێو قوڵاییانەوە، بەڵکو بریتییە لەکۆمەڵێک ڕێسای مەنهەجی پێشنیازکراو بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو ناکۆکییانە، بەشێوەیەک بگاتە ئەوەی سوودو پەندی تێدا بێت بۆ ئایندەی ئومەتی ئیسلام و ڕۆژانی داهاتووی، درێژەی ئەو ڕووداوانەشی بەڕادەی پێویستبوون، یاخود پشتگیری لێکدانەوە بۆ نمونە هێنانەوە تێدایە، لەوانەیە ئەم ڕێسایانە ببنە بەڵگە بۆ ئەوانەی

زیــاتر پێگــەیــشتوون و توانــای زانــستیان فراوانتــرە لــەبــارەی وردەکاریــەکــانی مێــژووی ئیــسلامی، تــابتوانن بــۆ دووبــارە خوێندنەوەی ئەو مێژووە هەنگاو هەڵبگرن.

هـەرچـەندە ئـەم نامـەیـە زیـاتر بـەلای فیقهـی سیاسـیدا دەچێت لەوەی زانستی مێژوو بێت، ئەمەش وەک پێشەکی مـەنهـەجی وایـە بـۆ ئـەم دوو کتێبـەم ((الـسنة الـسیاسیة))و ((الـشرعیة الـسیاسیة)) کەپشت بـەخـوا دەبـەسـتم بۆ تـەواوکردنیـان و، ئومێدەوارم لێمـان وەربگیرێت و، ئەم نامەیەشیان قبوڵ بکرێت و... بگات.

لێرەدا هەوڵمداوە ڕێبازی زانایانی (جرح وتعدیل) پـەیـڕەو بکـەم، ئەمەش تـەنهـا لـەسـەلماندنی گێڕانـەوەکان و نـەقڵدا نـا، بـەڵکو لـەو سۆنگە فیکرییەیانەوە کەلەسەر باوەڕبوون بە پەسـەندزانی بنـەمـا بــەســەر کــەســدا دامــەزراوەو، بــەجۆرێــک کــەپێــشەوا موســلیم کردوویــەتیــە پاســاو بــۆ (جــرح)ی گیــڕەرەوەکــان لــەپێــشەکــی صــەحیحــەکــەیــدا، کــەئــەوە لــە((باسـکردنی پاشــەملــە (غــەیبــەت)ی حەرامکراو نیە، بەڵکو بۆ پاککردنەوەی شەریعەتی پیرۆز، هەروەها مکوڕ بـووین لـەسـەر داڕشـتنەوەی بۆچـوون بـەپێـی ڕووداوەکـان، نەک داڕشتنەوەی ڕووداوەکان بەقاڵبی بۆچوونـەکان، وەک ئـەوەی باوە لەزۆرێک لەو کتێبانەی سەبارەت بەم بابەتە نووسراون.

لەڕاستیدا فیقهی سیاسی ئیسلامی بەگونجان لەگەڵ ئـەو واقیعـی ستەم و چەوساندنەوەیەدا دامەزرا کەجەنگی (صفین) هێنایە ئـاراو، ئەم گونجاندنە تەنها لـەراقـەی مێژووی سیاسی ئیسلامیدا نـەبوو، بـەڵکـو زیـاتر ڕۆشـت و بیـردۆزەی سیاسـی ئیسلامیـشی گرتـەوە، ئەمەش وادەکات ئەرکی ئەمڕۆ قورسـتر بێت و، لـەسـەر لێکۆڵـەری فیقهی سیاسی و مێژووی ئیسلامی پێویستە ئاگاداری ئەم دیاردەیە بێت و، لەتوێژینەوەو پاکژ کردنـەوەیدا لـەپێنـاو وێنـەیـەکی ڕاسـتی

ئەوەی لەسەرەتای هاتنی ئیسلامیدا ڕویداوە لەئاشوب و ناکۆکییە سیاسیەکان تا ئەمڕۆش کاریگەری لەسەر ئەم ئومەتە ماوەو، گەڕان و بەدواداچوون لەم بوارەدا وەک کاری زانایانی شوێنەوارناس وایە کەلەئەو قۆناغانە دەکۆڵنەوە کەدەستی رۆژگار تێکیداون.

ئەوەی زیاتر ئەم ئەرکەی قورستر کردووە تێکەڵکردنی ناڕاستەوخۆی نێوان وەحی و مێژووە لەمەرجەعیەت بووندا، ئەمەش کارێکی بڵاوە لەفیکری ئیسلامی ئەمڕۆدا، بەهۆی ناتەواوی لەهۆشیاری مێژوویدا کەجیاوازی ناکات لەنێوان وێنەکەو وانەکانیداو، کەمتەرخەمیکردن لەلێکۆڵینەوەی ژیانی پێشین بەشێوەیەکی هەمەلایەن کەهەموو لایەنە ڕۆشن و تاریکەکانی بگرێتەوەو، تەنها بەگێڕانەوەی کارەباشەکان نەوەستێت.

هەرکەس لەدەقەکانی شەرع و چارەنووسی نەتەوەکان ڕابمێنێت تێدەگات کەتێکەڵکردنی نێوان بنەماکان وکەسەکان لەخراپترین کەرەستە فیکریی و کردارییەکانە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمان پێکردووین بەڕەهایی شوێنی سوننەتەکانی بکەوین، چونکە بێگوناهە (مەعصومە): ((عليكم بسنتي ..))، پاشان فەرمانمان پێدەکات بەشوێنکەوتنی ئەو خەلیفانەی پاش ئەو دێن، بەڵام کۆتی کردووە بە(رشد): ((وسنة الخلفاء الراشدين من بعدي))، لەمەشدا وانەیەکی بەنرخ هەیە لەجیاکردنەوەی نێوان کەس وبنەما، تەنانەت گەر ئەو کەسە یەکێک لەخەلیفەکانی راشیدینیش بێت، بەڵام دەردی بەرجەستەکردنی بنەماکان لەکەسەکاندا -بەداخەوە- لەخوێندنەوەی ژیانی پێشیندا بڵاوە، بەجۆرێک تەنانەت ئەوانەی لەنێویاندا کەڕاشیدینیش نین، بەمەش حاڵی بەرگریکردن

لەهاوەڵانەوە گۆڕا بۆ بەرگریکردن لەستەمی سیاسی و، پاساودان بەناچارکردن و سەرشۆڕی.

لێرەوە لەم توێژینەوەیەدا سوربووین لەسەر پەیڕەوکردنی بیرۆکەی لەتوانادابوونی مێژوویی (الامكان التأريخي)، ئەم بیرۆکەیە لەو سۆنگەیەوەیە کەگۆڕانە مێژووییەکان –بەو پێیەی کەکردەیەکی مرۆیی ویستییە- هەمیشە ئەگەر هەڵدەگرێت و، ئەوەی لەواقیعی ژیاندا ڕودەدات، بریتی نیە لەهەموو لەتوانادا بوویەک (مومکینێک)، بەڵکو بریتییە لەلایەک لەچەندین لەتوانادا بوودا، کەڕەوشی کرداری مرۆیی وایکردووە دەربکەوێت، بەمەش بیرۆکەی لەتوانادا بوونی مێژوویی ئامرازێکی مەنهەجی کارایە، لەڕێی ئەوەوە جیاوازی نێوان ئەوەی بووەو ئەوەی لەتوانادا بوو ببێت دەردەکەوێت و، بەمەش بەگەڕانەوە بۆ ئەو جیاوازیە هەڵسەنگاندن بەردەست دەبێت.

بەلام ((جەبریەتی ئەمەوی))و ((کەربەلاییەتی شیعە)) هەتا ئێستاش لەتوێژینەوەکانی مێژووی سەرەتای ئیسلامدا باون، ئەم دووانەش دوو ڕوی یەک فەلسەفەن، لەو سۆنگەیەوە سەرچاوە دەگرن کەئەوەی ڕوویدا بریتییە لەسنووری ئەوەی کەلەتوانادا بووە، لەبەر ئەوە بواری ڕخنە یاخود پێداچوونەوە نیە، بەبالادەستی ئەم دوو مەنهەجەش فیکری ئیسلامی بیرۆکەی لەتوانادابوونی مێژوویی لەدەستداو، خودی عەقڵی موسڵمان لەخوێندنەوەی مێژووەکەیدا لەکارخست.

ئەو هەڵچوونە باوەی لەبەرگری لەپێشین بڵاوە بۆتە هۆی لەدەستدانی پیرۆزی بنەماکان بەهۆی سووربوون لەسەر پێگەی کەسەکان و، وەلامدانەوەی زیادەڕۆیی بەزیادە ڕۆیی، لەگەڵ

گـشتاندن وتۆقانـدن كـەوادەكـات عوسـمان و مـەروانـی كـاتبی بەردەستی و، عەمارو ئەبو غادیەی بكوژی یەكسان بێت، بۆمان دەركـەوتـووە كـەگـەنجـی هاوچـەرخـی مـەسڵمان بۆتـە قوربـانی مـەنهـەجی ئیبن عـەرەبی لـەكتێبی ((العواصـم والقواصـم))، پاشـان قوتابخانـەی ((شـیعەگـەری سـوننی))هاوچـەرخ كـەلێكۆڵـەری كتێبـی ((العواصم)) شێخ محب الدین خەتیب و قوتابیەكانی سـهركردایـەتی دەكەن، لەبەر ئەوە ئەم نامـەیـەمـان بـەگـەنگەشـەی مـەنهـەجی ئـەو قوتابخانەیەو هەندێک لەهەڵخلیسكانەكانی كۆتایی پێهێناوە.

ئەم ڕۆشنبیرییە مێژووییە دەردەدارەمـان بـەشـێكە لـەم تـەنگانـە بەردەوامەمان.

پـەیـوەنـدی نێـوان رۆشـنبیریی دەردەدارو چـەوسـاندنەوەی سیاسـی پـەیـوەنـدیی بـوون و نـەبوونـە، لـەبـەر ئـەوە سـەیـر نیـە كـەجادوگـەریـی ڕۆشـنبیری میـسریەكـان بووبێـت لـەسـەردەمـی فیرعەونەكاندا، بەرهەمی ئەو ڕۆشنبیرییە دەردەدارەمـان چـەندین لێكـەوتـەی نامۆیـە، لـەڕوكـارەكانیـشی ئـەوەیـە كـەقوربانیـانی چەوساندنەوە لەجیهانی ئیسلامیدا ئەمڕۆ بەهێزترینی ئەو كەسانەن كـەلـەڕووی فكریـەوە بـەرگـری لێـدەكـەن، لـەڕووی ئاكاریـشەوە لەهـەمـووان زیـاتر پاسـاوی بۆ دەهێننـەوەو ... ئاگاشـیان لـەخۆیـان نیەو هەستی پێناكەن!!

كۆمـەڵگـای ئیـسلامی یـەكـەم سـەركـەوتـوو بـوو بـەسـەر ئـەو هەڵگەڕانەوە عەقیدەییەدا كەلەدەوروبەری هەڵگیرسا، بەڵام شكستی هێنا لەبـەردەم ئـەو هـەڵگـەڕانـەوە سیاسـییەی كەلـەناوجـەرگـەیـەوە سـەرچـاوەی گـرت، هـەڵگـەڕانـەوەش —وەک ئیـبن تـەیمیـە دەڵێـت-

لەوانەیە لەهەموو ئاین بێت، یاخود لەهەندێکی، ئەو هەڵگەڕانەوە سیاسیەش خۆی لەگۆڕانی خەلافەتدا بۆ پاشایەتی بینیەوە کەئەوەش رەوتی شارستانیەتی ئیسلامی وئەوەی بەسەریهات کێشاو، تائیستاش بەسەر ژیانی موسڵماناندا حوکم دەکات.

ئەگەر لەڕابردوودا لەپێشبوون لای هەندێک لەزانایانی سوننە بریتی بووبێت لەئاشکرا کردنی (ئابڕوچوونەکانی باتنیەکان)و(وەڵامدانەوەی شیعەو قەدەریەکان)، چونکە بیدعەکاران و لەو رۆژەدا دەسەڵاتدار و دەوڵەت بوون، وەختە لەسەر رۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامی و رۆژئاوای جێبەجێ بکرێت .. چونکە ئەوەی ئەمڕۆ لەپێشە بریتییە لەئاشکراکردنی ئابڕوچوونەکانی ستەمکاران و، دابڕانیان لەهەر شەرعیەتێکی ئەخلاقی یاخود مێژوویی، سەرەڕای ئەوەی کەبیدعە سیاسیەکان مەترسییەکەیان لەبیدعەی عەقیدەیی کەمتر نیە، وەک ئەوەی پەندو وانەی چواردە سەدەی مێژووی ئیسلام شاهێدی دەدات.

بەڵام ئاشکراکردنی ئابڕوچوونەکانی ستەمکارانی هاوچەرخ لەتوانادا نیە بەهۆی ئەوەی قسەکردن لەبارەی ئەو لادانە سیاسیانەی کەلەسەردەمی هاوەڵانەوە دەستی پێکردووەو مۆری پاساو بەرگری لێکردنیان لێدراوە، نەک مۆری توێژینەی بێلایەنانە کەئامانجی بەهاپێدان بێت، هەروەها بەهۆی ئەوەی قسەکردن لەبارەی ئەو ئاشوب وناکۆکییە سیاسیانە فیقهی خۆپارێزی حوکمی تێدا دەکات، نەک فیقهی هەڵسەنگاندن.

لەبەر ئەوەی گشتگیری و بەدواداچوون لەسروشتی بنەمای ئەخلاقین و، لەتوانادا نیە ستەمی سیاسی لەسەر پێشین حەرام

بکرێت و، بۆ پاشین ڕێگەی پێبدرێت، بەبێ کەوتنە دژیەکیەکی فیکری و ئەخلاقی.

لەڕاستیدا هەستکردن بەگوناهـ لەقسەکردن سەبارەت بەناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان ئاشکراو بڵاو بووە لای زانایانی ئومەت و پیاوچاکانی، بەڵام ئەمە نەبۆتە ڕێگر لەوەی بۆمەبەستی فێرکردن و ڕەسەنایەتی و بەهاپێدان قسەی لەبارەوە بکەن، لەمبارەیەوە هەیسەمی لە(مجمع)ەکەیدا دەروازەیەکی پڕ مانای تەرخان کردوووە بۆ ئەمەو، وتوویەتی: (( باب فيما شجر بين أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم، ولولا أن الامام أحمد رحمه الله وأصحاب هذه الكتب أخرجوه ما أخرجته))، واتە: دەروازەیەک لەبارەی ئەوەی لەنێوان هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕوویداوە، ئەگەر پێشەوا ئەحمەدو خاوەنی ئەو کتێبانە نەیانهێنایە ئەوا منیش نەمدەهێنا، مەبەست لە (خاوەنی ئەم کتێبانە) خاوەن ئەو مەسنەدانەیە کەهەیسەمی لەکتێبەکەیدا کۆی کردونەتەوە، وەک تەبەرانی و بەزازو ئەبی یەعلی... هەیسەمی لێرەدا کێشەکە دەخاتە ڕوو: ناکرێت تەنها بۆ بەسەربردنی کات و کات بەفیرۆدان قسە لەم بابەتە بکرێت، بەڵام قسەکردن تێیدا هەندێک کات پێویستیەکی زانستی و کردارییەو، بیدعەیەکی داهێنراو نیە، بەڵکو گەورە زانایانی ئەهلی سوننەو فەرموودە، وەک پێشەوا ئەحمەدو جگە لەویش لێی دواون.

هەرچەند ناڕازییەک ناڕەزایەتی دەرببڕێت یاخود مشتومڕکارێک مشتومڕ بکات لەبارەی ئەوەی کەنووسین لەسەر بابەتی ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان کولاندنەوەی برینێکی

ڕابـردووی دوورو، جـەدەلێکـی تیـۆری بـێ ئـەنجـام و، کردنـەوەی دەروازەی زماندرێژییە بەرانبەر گەورە هاوەڵان... ئەوا ئەم ئومەتـە لەم ئاریشە مێژووییەی دەربازی نابێت تا تێنەگات چۆن کەوتۆتـە ناوی.

هیچ کـەس حـەز بـەباسکردنی ئـەو کوشـتارە ناکات کـەلـەنێوان نـەوەی یـەکـەمـی موسـڵمانانـدا بـەرپـا بـوو، هـیچ کـەسـیش چێـژ لەهەڵدانەوەی برینی ئومەت نابینێت، بەڵام پزیشک دەرمـانی تـاڵیش دەنووسێت و، کـەتـەرەکـەی بـەکـار دێنێت لـەکاتیکدا کـەپێی خـۆش نیە... بەڵام هەندێکجار ئەوە تاکە ڕێگایە بۆ نەهێشتنی نەخۆشیەکە.

خوای گەورە یارمەتیدەرە بۆ هەموو چاکەیەک و ڕێنمایکارە بـۆ ڕێگای هەرەباش.

**محەمەد کوڕی موختار شەنقیتی**
**١ی ڕەمەزانی پیرۆزی ١٤٢٤ک**
**بەرابنەر ٢٧ ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣ز**

## دەروازەی
## ڕیشەدارکردن لەڕووی شەرعییەوە و بەئاگایی مێژوویی
## (التأصيل الشرعی والوعی التاريخی)

هۆشیاریی مێژوویی بەشێکی سەرەکییە لەڕۆشنبیری هەر نەتەوەیەک کەسوربێت لەسەر بونیاتنانی ئایندەی بەپێی بەها تایبەتەکانی، ئەم بەهایە لەئومەتەکەماندا کەئومەتی ئیسلامییە بەهۆی پەیوەستی شارستانیەتەکەی بەهۆشیارییەوە جەختی لەسەر کراوە و، بەهۆی ئەو میراتییە مێژووییە زۆر گەورەی و، بەهۆی هۆشیاری ڕاستەوە نەوەکانی ئومەت دەگەنە بەدیهێنانی سێ کار:

- دانانی هێڵی جیابوونەوە لەنێوان وەحی و مێژوودا، بەجۆرێک کەپەیوەست ببێت بەوەحییەوە کەهاتۆتە خوارەو کتاب و سوننەتە، پەندیش لەئەزموونی مێژوویی وەربگیرێت، بەبێ ئەوەی بکرێتە بناغەیەک و لەسەری بونیات بنرێت، یاخود پێوەرێک و لەسەری دادگایی بکرێت.

- دانـانی سـنووری یـەکلاکردنـەوەی نێـوان بنـەماکـان و هۆکارەکانی بەرجەستەکردنە مێژووییەکانی، بەشێوەیەک دەرگا ئاوەڵا بێت لەبەردەم نوێکردنەوەی هۆکارەکان دور لەشێواندنی بنەماکان و، چەق نەبەستریێت لەسەر چەند هۆکارێکی دیاریکراو، تەنانەت ئەگەر سوودمەندبوونی لەڕابردوودا سەلمێنرا بێت.

- دانـانی هێڵـی جیاکردنـەوە لـەنێـوان پێگـەی کـەسـەکـان و پیرۆزی بنەماکاندا، چونکە کەسەکان پێگەکانیان لەخزمەتکردنی ئەو بنەمایانەوە بەدەست دەهێنن، جا ئەگەر پاراستنی ئەو پێگەیە گۆڕا بۆ وەلانانی بنەماکان، یاخود ڕوون نەبوونی لەمێشکی خەڵکیدا، ئەوا لەمەبەستەکەی خۆی لادراوە.

قۆناغی دامەزراندنیش لەمێژووی هەر نەتەوەیەکدا بەگرنگی تایبەتی جیا دەکرێتەوەو، هۆشیاری مێژوویی لەبارەیەوە دەبێتە پێویستیەکی گرنگ، ئەمەش بەهۆی ئەو بەیەکدا چوونەی نێوان بنەماکان و هۆکارەکان وکەسەکان لەم قۆناغەدا، لەبەرئەوەی بەزۆری قۆناغی دامەزراندن لەمێشکی نەوەکانی دواتردا دەگۆڕێت بۆ ((قۆناغێکی پیرۆز)): کەتەنها بنەماکان پیرۆز راناگیرێن- کەئەمە کارێکی پێویستە- بەڵکو هۆکارەکانی ئەو قۆناغەو کەسەکانیشی پەپیرۆز سەیر دەکرێن.

لەم ڕوانگەیەوە، ئەم نامەیە ئامانجی یارمەتیدانە لەسەر بونیاتنانی هۆشیاریەکی مێژوویی هاوسەنگی ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان کەسانی نەوەی یەکەم –بەتایبەت هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێت- لەگەڵ ڕامان لەسەر ئەوەی کەشێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە و هەندێک لەفەرموودەناسان لەمبارەیەوە خستویانەتە ڕوو، ئەوەی ڕایکیشام بۆ نووسینی ئەم بابەتە چەند هۆکارێکە، لەوانە:

- هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بێـت نـەوەی دامـەزرێنـەری مێژووی ئیسلامن، ئەو نـەوەیـەن کـەپشتیوانی پێغـەمبـەری خوایـان (صلی الله علیه وسلم) کردو سەریانخست، ئەو نەوەیەن کـەبناغـەی دەوڵەتی یەکەمی ئیسلامیان دامەزراندو سنوورەکەیان فراوان کرد، لەبەر ئەوەی هەر شتێک ئەو نـەوەیـە ئـەنجامی دابێت وەک بنچینـە (أساس) –بەئاشکرا یان نائاشکرا- لای نـەوەکانی دواتـری ئیسلام وەرگیـراوە، لـەبـەر ئـەوە ئـەوەی پێکابێتیـان بـەهـای دامـەزرانـدنی هەیەو، هەڵەشیان کردبێت مەترسی تایبـەتـی خـۆی هـەیـە، بـەهـۆی ئـارەزومـەنـدی خـەڵکـی بـۆ ئاسـانی لاسـاییکردنەوەی گـەورەکـان لەهەموو شتێکدا.
- ئـەو ناکۆکییـە سیاسـیانەی کـەلـەنێـوان هـاوەڵانـدا (رەزای خوایان لێبێت) بەرپا بوو باڵی بەسەر هەموو قۆناغەکانی مێژووی ئیسلامدا کێشاوە، بگرە شارستانیەتی ئیسلامی بەڕەنگ و جۆرێکی تایبـەت ڕەنگرێـژ کـرد، لـەسـەدەی یـەکـەمـی کۆچییـەوە تـا ئـەمـڕۆ، چونکـە ئـەو قۆناغـە –لـەڕاسـتیدا- کلیلـی مێـژووی ئیـسلامی و کۆمەڵگای ئیسلامییەو، ئیبن تەیمیە بەو قسەیـەی گوزارشتی لـەمـە کردووە: ((... ئەو بەیـەکدا پژانـە بـەزمـان و دەسـت بنچینـە بـوو بـۆ ئەوەی کەدواتر لەنێوان ئومەتدا ڕویدا، دەبا کەسی عاقڵ پەندی لـێ وەربگرێت)) [١].
- تێگـەیـشتن لـەو قۆناغـە مێژووییـە هـەسـتیارە لـەڕێـی لێکۆڵینەوە لەبارەیەوە بـەشـێوەیـەکی وردو فراوانـی بـەهاپێدەرەوە دەتوانرێت ئەو لێکەوتە خراپانـەی کـەتائێستاش کاریگـەری لـەسـەر فیکرو واقیعی ئومەتەوە هەیە تێبپەڕێنرێت، ئەو پەنـد وەرگرتنـەشـی

[1] ـ ابن تيمية: (مجموع الفتاوى) (٥١/٣٥).

ئیبن تەیمیە داوای دەکات نایەتەدی بەبێ لێکۆڵینەوە لەو قۆناغە مێژووییە بەلێکۆڵینەوەی ورد لەبەر ڕۆشنایی بنەما ئیسلامییە ڕێنمایکارەکانداو، چۆن پەند لەشتێک وەردەگیرێت کەحەقیقەتەکەی نەزانین و، دەممان لەئاست قسەکردن لەبارەیەوە داخستبێت.

- زۆریک لەوانەی خۆیان لەقەرەی لێکۆڵینەوە لەم قۆناغە داوە ڕێگایەکی ڕێک و ناوەندگیریان نەگرتۆتە بەر کەپیرۆزی بنەماکان و پێگەی کەسەکان پێکەوە کۆ بکاتەوە، بەڵکو کاردانەوە کاریگەری لەسەریان هەبووە، بەو هۆیەوە کەوتونەتە زیادەڕەوی، مەبەستم زیادەڕەوی شیعە نیە-چونکە ئەمەیان وەک رۆژی ڕووناک دیارەو، زۆرکەس وەڵامیان داوەتەوە- بەڵکو مەبەست زیادەڕەوی هەندێک لەپەیڕەوانی سوننەیە کەوەڵامیان داونەتەوە، کەئەمەیان زیادەڕەویەکی شاراوەی وردە، چونکە بەناوی بەرگری لەهاوەڵانی بەڕێزەوە ئەنجام دراوە.

**جەدەلیەتی نمونەی باڵاو نمونە**

- پەیوەندی نێوان ڕیشەدارکردنی شەرعی و هۆشیاریی مێژوویی بەڵگەدارترە لەوەی کە زۆرکەس پێشبینی دەکەن، چونکە هەموو مرۆڤێک وێنەیەکی خەیاڵی هەیە لەژیانیدا ڕێنمایی دەکات و، لەسێ بەش پێکهاتووە:
- نمونەیەکی باڵای هەیە لەشێوەی بنەمای موجەرەد کەئارەزووی پابەندبوون پێیەوەو ڕۆشتن لەسەر ڕێگاکەی هەیە.
- نمونەیەکیشی هەیە لەشێوەی کەسەکان کەتوانیویانە لەو بنەمایانە نزیک ببنەوە، دەیەوێت شوێنپێیان هەڵبگرێت.

- لەگەڵ ئەو هۆکارانەی کە ئەو کەسانە بەهۆی کارپێکردنیانەوە بەسەرکەوتووانە لەخزمەتی نمونەکەدا بوون، ئەمیش دەیەوێت پشت بەو هۆکارانە ببەستێت.

مێژووی مرۆڤایەتی گۆڕانی نمونەی باڵای بۆ نمونە بەشێوەیەکی ڕەها بەخۆیەوە نەبینیوە-ناشیبینێت-، چونکە ئەوە لەتوانای مرۆڤدا نیە.

تەنانەت ئەو کاتەی پێغەمبەرانیش هەبوون -کەئەوان لوتکەی تەواومەندی مرۆڤن- لەبەر ئەوەی سنووری کات و شوێن ڕێگەیان پێنادات نمونەی باڵا بگۆڕن بۆ نمونە لەکۆمەڵگاکانیانداو، بەرزکردنەوەی ئاستی ئایینداری بۆ ئاستی ئاین بەشێوەیەکی ڕەها، چونکە ئاین ڕێنمایی خواییەو تەواومەندەو، ئاینداریش بەدەستهاتوویەکی مرۆیی ناتەواوە، لەوانەیە لەوەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)یشدا کەئارەزووی دەکرد (بەیت) لەسەر بناغەکانی ئیبراهیم دروست بکاتەوە نمونەی ئەمە بێت. خۆ کەسانی تر کەپێغەمبەر نین ئەوا هەڵەو گوناهەکانیان کەلێنی نێوان ئاین و ئایینداری فراوانتر دەکات، لەبەر ئەوەی مەعصوم نین.

بەڵام هەموو مرۆڤەکان هەمان ئاستی خۆدابڕین (تجرید)یان نیە کەبتوانن جیاوازی بکەن لەنێوان بنەماو کەسی هەڵگری ئەو بنەمایەدا، لەنێوان بنەماو هۆکارەکانی گوزارشت لێکردنی لەڕووی کاتەوە، لێرەدا دەردی ((بەرجەستەکردن)) دێتە ئارا: بنەما بەرجەستەکراوەکان لەکەسەکاندا ئیدی هەرچەندە مەزنیش بێت خۆ مەعصوم نیە، لەهۆکارەکانیشدا ئیدی هەرچەند سەرکەوتوو بێت لەڕۆژانی دامەزراندندا لەگەڵ ئەوەدا لەڕووی کات و شوێنیەوە سنووردارە.

بـــەهـــۆی دەردی بـــەرجـــەســـتەکردنـــەوە دوو دەردی تـــر سەرهەڵدەدات: ناچاری و چەقبەستن (الجبرية والجمود)، سـەبارەت بەناچاریی ئەمەیان باوڕهێنانە بەوەی لەتوانادا نیە باشترە لەوەی بـووە ئـەنجـام بـدرێت و، سـەیرکردنـی ڕووداوەکـانی ڕابـردووە کەکارێکی چەسپاو بووەو هەردەبوو ڕوویدات، بەهۆی ئەمەوە ملکـــەچبـــوون بـــۆ رووداوەکـــانی ڕابـــردوو دروســـت دەبێـــت کەلەئێستاشدا درێژەی هەبێت و، دەرگاکانی ویستنی تێگەیشتن و ڕاستکردنەوە دادەخرێن، بەڵام چەقبەستن بریتییە لەخۆگێلکردن و بەسبوونی ئەو هۆکارانەی کەلەڕابردوودا سەرکەوتوو بووە، بەڵام بۆ کاتی ئێستا گونجاو نیەو، بۆ ئاینەدەش دەست نادات، بەجۆرێک دەبێتە هۆی دواکەوتنی بنەماکان لەژیان، لەکاتێکدا کەپێشتر ڕێنمایکارو جڵەوگیری بووە.

چارەسـەر بریتییە لەهۆشیاریی مێژوویی کەبیرۆکەی زەمەن دەخاتـە نـاو لێکۆڵینـەوەی بنـەماکـان، بـەوەش جیاکـاری لـەنێـوان نمونـەی بـاڵاو نمونـەدا ڕونتـر دەبێـت: لـەنێـوان بنـەمـاو هـەڵگریـدا، لـەنێوان بنـەمـاو هۆکـارەکـانی خزمـەتکردنیدا زیاتر دەردەکـەوێت، بەمەش دەروازەکانی هەڵسەنگاندنی دروستی ڕابردوو دەکرێنەوە، کەڕێنمایکار دەبێت بۆ دروست بونیاتنانی ئایندە.

بـەمجـۆرە ڕیـشەدارکردنـی بنـەماکـانی ئیـسلام لـەسیاسـەت وفەرمانڕەوایدا-بۆ نمونە- بەتەنها بەس نین، ئەگەر تـەنها لـەدەقی فـەرمـوودەیـەکدا سـەبارەت بـەشـوراو بـەیعـەت و دادپـەروەری .... هاتبوو بەبێ شیکاری مێژوویی قۆناغەکانی بەرزو نزمی و دورو نزیکی ئـەو بنـەمایانـە لـەمێژوویـی ئومـەت، بـەتایبـەت لـەقۆنـاغی دامـەزراندنـدا کـەهـەمـووان وەک بنچینـەو مـەرجـەع وەریـدەگـرن، توێژەر هەرچەند خۆی ماندوو بکات لەڕیشەدارکردنی دادپەروەری

لەفەرمانڕەوایی و دابەشکردندا، ئەوا کەسێک دەبینیت لەتوشبوان بەنەخۆشینی بەرجەستەکردن کەبەقسە یان کردەوەیەکی هەندێک لەهاوەڵانی گەورە دینێتەوە کەخۆ نەویست بوون و لەدەسەڵات و ساماندا کەسانی تریان پێش خۆیان دەخست، توێژەر هەرچەند خۆی ماندوو بکات لەقسەکردن سەبارەت بەمافی ئومەت لەهەڵبژاردنی سەرکردەکانیدا، ئەوا کەسێک بەلگەی قسە یان کردەوەی هەندێک لەهاوەڵانی پایەبەرزی بۆ دێنێتەوە کەدەسەڵاتیان داوەتە منداڵەکانی خۆیان.

هیچ چارەسەرێک نیە بۆ ئەم ئاریشە فیکری و کردارییە جگە لەپابەندبوون بەراسپاردەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەبو زەڕ ( خوا لێی ڕازی بێت) کەفەرمووی: ((قول الحق وان كان مرا)) [1] واتە: حەق بڵێ با تاڵیش بێت. هەربۆیە ناولێنانی هەڵەکان بەناوی خۆیەوە بەناڕوونی، بەتایبەت هەڵەکانی گەورە هاوەڵان ئەوانەی کەپێشەنگ و نمونەن بۆ نەوەکانی ئومەت.

لەڕاستیدا ئەوەی ئەو هاوەڵە پایەبەرزانە لەخزمەتی بەرز پێشکەشی پەیامی ئیسلامیان کرد، پاداشتەکەیان لای خوای گەورەیەو، بیانوشیان هەر لای خوای گەورەیە، بەڵام بنەماکان ئەمەیان زیندووەو هەردەمێنێتەوە، هەربۆیە پاریزگاری لێکردنیان ئەرکەو، ڕوونیان لەمێشکی خەڵکیدا پێویستەو، پێویستی خەڵکیش بەنمونەیەکی باڵا زیاترە لەپێویستیان بۆ هەر نمونەیەکی مرۆیی تر ئیدی هەر ناوێکی هەبێت، پاش ئەوەی خوای گەورە پێغەمبەرانی مەعصومی بۆ ناردن.

---

[1] ـ مجمع الزوائد ٢٦٥/٧ هەیسەمیش وتوویەتی: (تەبەرانی لە (الصغير، والكبير)دا بەو جۆرە گیڕاویەتیەوەو کەسەکانی جگە لەسەلامی کوڕی مونزر کەسانی (صحيح)ن، ئەو متمانە پێکراوەو، بەزازیش گیڕاویەتیەوە .

## پەند وەرگرتن لەچیرۆکەکانی قورئان

زۆرێک لەزانایانی موسڵمان لەڕابردوو ئێستادا بەمەنهەجی گیڕانەوەو باسکردنی باشەو کارەچاکەکانیان لەسەر ژیانی هاوەڵان ومێژوویی پێشینانیان نووسیووەو، بەقسەکردن لەسەر ئەو هاوەڵانە (خوا لێیان ڕازی بێت) مەحکوم بوون کەزۆر نەناسرابوون و دان بەهیچ باشەیەکی لەپێشبوونیاندا نەنرابوو، سەرەڕای سوودی ئەم مەنهەجە لەهەستانەوەی هیمەتی راوەستاویان و، لەوەڵامی ئەوانەی کەنکوڵیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەدا چەندین لایەنی ناتەواوی مەنهەجی تێدایە، گرنگترینیان ژیانی هاوەڵان و پێشینانی یەکەم لەسروشتە مرۆییەکەیان دەردەهێنێت: سروشتی ململانێ لەنێوان نمونەو واقیعداو، گرفتی دەروونی لەپێناوی گەیشتن بەئاستی بنەماو، رووکاری کەوتن و هەستانەوەو، گوناهـ وتەوبەکردن و، بێئاگابوون و پاشگەزبوونەوە... ئەمە کرۆکی ئەزموونی باوەڕدارە لەهەموو سەردەمێکدا، ئەگەر مێژوو ئەوەی لەدەستدا ئەوا لەمێژووییەکی زیندووەوە دەگۆڕێت بۆ مێژوویەکی مردووی پیرۆز، کەهەست دەوروژێنێت بەڵام ئەزموونی لێ وەرناگیرێت، هیمەت دەجوڵێنێت بەڵام وانەی لێ وەرناگیرێت، کەمتەرخەمی پاشین (خلف) دەردەخات بەڵام بێئومێدیان ناکات لەشوین پێ هەڵگرتنی پێشین..

ئەمەش مەنهەجی قورئانی پیرۆز نەبووە لەخستنە ڕووی چیرۆکە دێرینەکان و، سەربوردەی پێشینەکاندا، تەنانەت کاتێ قورئانی پیرۆز بەوەحی باسی پێغەمبەرانی کردووە کەمەعصوم بوون، وێنەیەکی تەواوی نیشان داوە، کەخاڵی بەهێزو لاوازی لەخۆ گرتووە، تا ئەوکەسی لێی ڕادەمێنێت پەندی لێ وەربگرێت و، مێژوو وا بمێنێتەوە کەمێژووی مرۆڤە کەلەگۆشت و خوێنن، نەک مێژووی فریشتە کەلەسەر گوێڕایەڵی بەبێ هەوڵ یاخود ماندوو

بوون دروست کراون، ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە سەبارەت بەئادەم (سەلامی خوای لێبێت) بخوێنەرەوە: (**وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى**) [1]، لەبارەی نوح (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموویێت: (**قَالَ رَبِّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْأَلَكَ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ**)[2]، سەبارەت بەداود (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموویێت: (**وَظَنَّ دَاوُودُ أَنَّمَا فَتَنَّاهُ**)[3]، سەبارەت بەسولەیمان (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموویێت: (**وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَانَ**)[4]، سەبارەت بەیوسف (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموویێت: (**وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا**)[5]، سەبارەت بەموسا (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموویێت: (**قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي**)[6]، لەکۆتایدا لەبارەی کۆتا پێغەمبەرو ڕێزدارترین دروستکراو لەسەر حەق محەمەد (صلى الله عليه وسلم)دەفەرموویێت: (**عَبَسَ وَتَوَلَّى (١) أَنْ جَاءَهُ الْأَعْمَى**) [7]، لەئایەتێکی تردا دەفەرموویێت: (**عَفَا اللَّهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنْتَ لَهُمْ**)[8].

ئەم شێوازە خستنەڕووە قورئانیە وادەکات وێنەکە تەواو، بەڵگەکە بەهێز بێت، ئەگەرنا چۆن پێمان دەکرێت شوێن پێی کەسانێک هەڵبگرین کەلەخەسڵەتی مرۆڤبوون داماڵرابن؟! خودای ئافەریدەکاری دانای دادپەروەر داوای ئەوەی نەکردووە لێمان،

---

[1] ـ سورەتی طه: ١٢١.
[2] ـ سورەتی هود: ٤٧.
[3] ـ سورەتی ص: ٢٤.
[4] ـ سورەتی ص: ٣٤.
[5] ـ سورەتی یوسف: ٢٤.
[6] ـ سورەتی القصص: ١٦.
[7] ـ سورەتی عبس: ١-٢.
[8] ـ سورەتی التوبة: ٤٣.

لەبەر ئەوە مرۆڤانێکی بەپێغەمبەر ناردووە، نەک فریشتە بکاتە پەیامبەر، ئەمەشی بەمەبەست و لەداناییەوە بووە: (قُلْ لَوْ كَانَ فِي الْأَرْضِ مَلَائِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِمْ مِنَ السَّمَاءِ مَلَكًا رَسُولًا) ١.

پوختەی سودمەندبوون لەم مەنهەجە قورئانییە ئەوەیە کەلێکۆڵینەوە لەمێژووی پێشین –هاوەڵان بن یاخود هاوەڵ نەبن- پێویست دەکات وێنە تەواومەندەکە بخرێتە ڕوو، بەهەموو لایەنە ڕۆشن و تاریکەکانیەوە، هیچ مێژوویەک نیە هەمووی باشە یاخود هەمووی خراپە بێت و، پەند وەرگرتن لەهەڵەو کەمتەرخەمی یەکسانە بەراستی و هەستانەوە، بەڵکو هەندێجار لەوەش زیاترە.

لەژیانی هەموو باوەڕدارانیشدا پەندو وانە هەیە، ئیدی هەیانبێت ستەمی لەخۆی کردبێت، یان کەمتەرخەم بوبێت، یان پێشەنگ بوبێت بەکاری چاکە بەویستی خوای گەورە.

**وانەیەکی مەزن لەعەمارەوە**

ئەو مەنهەجەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا بانگەشەی بۆ دەکەین و، وایدەبینین کەشێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەو هەندێک لەئەهلی فەرموودە هەرکەسیان سەرپشک کردووە لەسەیرکردن و جێبەجێکردنی، ئەویش مەنهەجێکی بەرکار لەسەر هاوسەنگی نێوان ڕێزگرتنی پێگەی کەسەکان و خۆبەستنەوە بەپیرۆزی بنەماکانەوە، ئەوەشی ڕەچاو کردووە کەهەندێک کات پەسەندزانی (ترجیح) دەبێتە پێویستیەکی شەرعی و کرداریی، کاتێ کە کۆکردنەوەی نێوان دوو کارەکە دەستەبەر نابێت، لێرەدا بەبێ دوودڵی بەلای بنەماکاندا دەشکێتەوە.

---

[1] ـ سورەتی الاسراء: ٩٥.

مەزنترین وانەش لەمبارەیەوە بینیبێتمان وانەیەکە لەعەماری کوڕی یاسرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) لەڕۆژی جەنگی (جمل)دا: ((لەعەبدوڵڵای کوڕی زیادی ئەسەدیەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: کاتێ تەڵحەو زوبێرو عائیشە چوون بۆ بەسرە، عەلی عەماری کوڕی یاسرو حەسنی کوڕی عەلی ناردو، ڕۆشتن بۆ کوفە، چونە سەر دوانگەیەکی بەرزو، عەمار لەخواری حەسەنەوە ڕاوەستا، لێیان کۆبووینەوە، گوێم لەعەمار بوو دەیوت: عائیشە چووە بۆ بەسرە، سوێند بەخوا ئەو هاوسەری پێغەمبەرەکەتانە (صلی الله علیه وسلم) لەدونیاو قیامەتدا، بەڵام خوای گەورە تاقیتان دەکاتەوە تا دەربکەوێت ئایا گوێڕایەڵی ئەم دەبن یان ئەو)) [1]، لەگێڕانەوەیەکیشدا: ((... ئەمجا وتی: من نازانم هاوسەریەتی لەدونیاو قیامەتدا، بەڵام خوای گەورە تاقی کردونەتەوە تاشوێنی بکەون یان شوێنی ئەو بکەون)) [2]، لەگێڕانەوەیەکی تردا: ((عائیشە هاوسەری پێغەمبەرتانە لەدونیاو قیامەتدا، بەڵام بەهۆیەوە تاقی دەکرێنەوە)) [3]، لەگێڕانەوەی دیکەشدا: ((عەمار وتی: میری باوەڕداران ئێمەی ناردووە بۆلاتان تا ئاگادارتان بکەینەوە، چونکە دایکمان چووە بۆ بەسرە...)) [4]، لەدەربڕینێکی سابتدا: خوا شاهێدە کە ئەو هاوسەریەتی..)) [5]، ((لەعەمری کوڕی غالبیشەوە: پیاوێک لای عەمار قسەی بەعائیشە وت، عەمار وتی: ونبە لەبەرچاوم پیاو

---

[1] ـ البخاري: ٢٦٠٠/٦.

[2] ـ بخاری: ١٣٧٥/٣ و ئەحمەد ٢٦٥/٤.

[3] ـ بخاری: التاریخ الصغیر ٨٣/١، هەروەها بڕوانە: نعیم بن حماد: کتێبی (الفتن)٨٦/١.

[4] ـ فتح الباري: ٥٨/١٣.

[5] ـ الذهبي: سير أعلام النبلاء ١٧٨/٢.

خراپ، ئایا ئازاری خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) دەدەیت؟))[١].

ئیبن حەجەر دەڵێت: ((مەبەستی عەمار لەم چیرۆکە کەعەلی لەسەر حەقەو، عائیشە لەگەڵ ئەوەشدا لەئیسلام دەرنەچووەو، لەوەش دەرنەچووە کەهاوسەری پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) بێت لەبەهەشتدا، ئەمەش لەبەویژدانی عەمارو زۆر خۆپارێزی و جوان دەربڕینی قسەی حەقیەوەیە)) [٢]، ((ئیبن هبیرە دەڵێت: لەم گێڕانەوەیەدا عەمار راستگۆ بووە لەدەربڕینداو، ململانێ وای لێ نەکردووە کەلەبەرانبەرەکەی کەم بکاتەوەو، شاهێدی بۆ چاکەی تەواوی عائیشە داوە لەکاتێکدا کەجەنگیان لەنێواندا بووە)) [٣].

دیارترین ئەوەی بکرێت لێرەدا بخرێتە ڕوو بریتییە لەداڕشتنەوەی عەمار لەو هەڵوێستە ناخۆشەیدا کەبەشێوەیەکی ورد دەریبڕی کەتەنها ئەو کەسانە دەتوانن کە لەهاوکێشەی پەیوەندی نێوان کەس و بنەما تێگەیشتوون، ئەو سەرەتا بەخستنە ڕووی چاکەکانی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەستی پێکرد کەئەوەش دانان بوو بەپێگەیداو ئامۆژگاریش بوو بۆ ئامادەبووان و، بەوەش کۆتایی هێنا کەداوای کرد خۆیان لێ دوور بگرن، ئەمەش بەویژدانیە بەرانبەر بنەماو پەسەندزانیەتی بەسەر پێگەی هەر کەسێکدا، تەنانەت گەر ئەو کەسە عائیشەی دایکی باوەڕدارانیش بێت، شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێت: ((عەمار شاهێدی ئەوەی بۆدا کەلەئەهلی بەهەشتە، هاوسەری پێغەمبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)، لەگەڵ ئەمەشدا داوای

---

[1] ـ سير أعلام النبلاء ١٧٩/٢، زەهەبی وتویەتی: ((صححه الترمذي)) لەهەندێک نوسخەشدا: هذا حديث حسن)).

[2] ـ فتح الباري ٥٨/١٣.

[3] ـ فتح الباري ٥٩/١٣.

لەخەڵکەکە کرد خۆیانی لێ دوور بگرن بەوەی کەلەتوانادایە لەجەنگ و هەر شێوەیەکی تر)) [١]، گرنگتر لەمە ئەوەیە کەعەمار تاقیکردنەوەکەی بۆ خەڵکی ڕوون کردەوە، بڕواداری بەرچاوڕوون پێویستی بەوە هەیە کەلێی تێبگات و خۆی بۆ ئامادە بکات، ئەوەش بەڵایەکە پێویستی بەکۆکردنەوەی نێوان پیرۆزی بنەماکان (نەکەن گوێڕایەڵی بن) لەگەڵ پێگەی کەسەکان (یان ئەوەتا)کەهەندێکجار فەرمانە بۆ ڕێگریکردن و، هەڵبژاردن و بەپەسەندزانی دەکاتە کارێکی پێویست، پاش ئەوەی کەکارەکە لەنێوان (أما) و (أم)دا قەتیس بوو، وایلێهات گوێڕایەڵی دروستکراو (مخلوق) لەبەرانبەر گوێڕایەڵی دروستکار (خالق)دا بێت، گوێڕایەڵیش هەر بۆ خودایەو ئیبن جەوزی دەڵێت: ((... لەئوصولدا لاسایی نەئەبوبەکر دەکرێتەوە نەعومەر، ئەمە بنچینەیەو پێویستە لەسەر ئەمە کار بکرێت، لەبەر ئەوە باسکردنی مەزنێک لەدەرونتدا نەتترسێنێت)) [٢].

خۆ ئەگەر ئەو توێژەرانەی لەناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان دەکۆڵنەوە لەم گۆشەیەوە -گۆشەی تاقیکردنەوە بەبەڵا- سەیری کارەکەیان بکردایە ئەوا سەرکەوتوو دەبوون لەمەنهەجی باسکردنەکەدا، چونکە لەم حاڵەتەدا لەو سنوورەی کەبنەماکان ڕێی پێبدات پارێزگاری دەکەن لەپێگەی کەسەکان، بەڵام لەکۆتاییدا بنەما دەکەنە حوکمدەرو پێوەر، بەبێ ئەوەی گیرۆدەی نەخۆشی بەرجەستەکردن ببن.

وانەکەی عەمار گرنگیەکەی تەنها لەوەوە وەرناگرێت کەئەهلی عیلم بۆی چوون کەتێگەیشتوو بەویژدان و خۆپارێز بووە، بەڵکو لەشاهێدی پێغەمبەرەوەیە (صلی الله علیه وسلم) کەلەو

---

[1] ـ منهاج السنة ٢٥٨/٦.

[2] ـ ابن الجوزي: سيد الخاطر، ص٨٩.

ناکۆکییانەدا ئەو لەسەر حەقە، وەک ئەوەی دواتر دەیبینین، بگرە لەو ڕووداوانەدا نەیارەکانیشی شاهێدیان بۆ عەمار دا، لەنێویاندا عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت)، ئیبن حەجەر دەڵێت: ((تەبەری بەسەنەدێکی (صحیح) لەئەبو یەزیدی مدینی هێناویەتی، وتویەتی: عەماری کوڕی یاسر کاتێ لە(جەنگی) جەمەل بوونەوە بەعائیشەی وت: ئەم ڕێرەوە چەندە دوورە لەو بەڵێنەی خرابووە ئەستۆتان، وەک ئاماژەیەک بۆ ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (**وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ**)، عائیشە وتی: ئەبو یەقزان؟ وتی: بەڵێ، عائیشە وتی: سوێند بەخوا ئەوەی زانیومە ئەوەیە کەتۆ قسەی حەق دەکەیت، وتی: سوپاس بۆ خوا کەلەسەر زمانی تۆوە بڕیاری بۆ دام)) [1].

مەنهەجی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە لەم کتێبەدا لەوە بەدەر نیە کەدرێژەپێدەری وانەکەی عەمار بێت، لەبەر ئەوە مەزنترین خەسڵەتی مەنهەجەکەی لەم بوارەدا بریتییە لەخەسڵەتی هاوسەنگی ومامناوەند بوون کەجەخت لەوە دەکاتەوە هەموو کەسەکان مافی خۆیان بدرێتێ، حەقی حەقیش بدرێت و، حەق بخرێتە سەرووی کەسەکانەوە ئیدی ئەو کەسانە هەرچەند بەرز بن، مەنهەجەکەشی لەم دەستەواژە پڕ مانایانەدا ڕاڤە کردووە، وتی: ((..ڕێگای مامناوەندبوونی گرتەبەرو ئەو کەسەی شایستەی مەزنی بوو مەزنی ڕاگرت و خۆشی ویست و پشتی گرت و، حەقی حەقیشی دا و، حەق مەزن ڕادەگرێت و، بەزەیی بەخەڵکدا دێتەوەو، دەزانێت کەهەر تاکێک چاکەو خراپەشی هەیەو، جێی سوپاسکردن و سەرکۆنەکردنەو، پاداشت و سزای بۆ هەیە و، لەڕوویەکەوە خۆشەویست دەبێت و لەڕویەکیشەوە مایەی ڕق لێبوون دەبێت)) [2].

---

1 ـ فتح الباري ٥٩/١٣.

2 ـ منهاج السنة ٥٤٤/٤.

**بۆچی ئیبن تەیمیە؟**

لەڕاستیدا لەم توێژینەوەیەدا مکوڕ بووین لەسەر درێژەدان بەوەی کەشێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەو ئەهلی فەرموودە سەبارەت بەناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) نووسیویانە، لەوانەیە ئەو پرسیارە بوروژێنرێت نهێنی هەڵبژاردنی ئیبن تەیمیە بۆ باسکردنی ئەم بابەتە لەنێو هەموو زانا دیارەکانی تری ئیسلامدا چییە، لەکاتێکدا ئەوان چەندین بەرگ کتێبیان لەبارەیەوە نووسیووە، وەڵامەکە بەمشێوەیە کورت دەکەمەوە:

- هەوڵەکانی شێخی ئیسلام لەڕووی چەندایەتیەوە جیاوازە، چونکە ئەو سەبارەت بەمشتومڕی ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) نووسیویەتی کەجگە لەو بەوجۆرە نەیاننووسیوە، ئاگادار نیم هیچکام لەزانایانی ئیسلام کتێبێکی بەقەبارەی ((منهاج السنة النبوية)) کە نۆ بەرگە نوسیبێت، یاخود بەقەبارەی بەرگە زۆرەکانی ((الفتاوى)) کەئیبن تەیمیە تایبەتی کردووە بەم بابەتە، ئەمە وێڕای ئەو کتێب ونامانەی تر و ئەو بەشە زۆرانەی کەلەکەلەپوری گەورەی زانستیدا هەیە.
- بریتییە لەجیاوازبوون –بەهەمانشێوە– لەڕووی چۆنایەتیەوە، لەڕاستیدا شێخی ئیسلام توانیویەتی تاڕادەیەکی زۆر بەرگری لەپێگەی هاوەڵانی بەڕێز (خوا لێیان ڕازی بێت) و، بەرگری لەپیرۆزی بنەما ئیسلامییە بەرزەکان پێکەوە کۆ بکاتەوە، ئەمەش هاوکێشەیەکە زۆرێک لێی بێئاگابوون: یان ئەوەتا لای بنەماکانیان گرتووە بەسەر کەسەکاندا، یاخود بەپێچەوانەوە کەسەکانیان داوە بەسەر بنەماکاندا، کەئەمەیان زیاترە.
- زۆرێک لەوانەی خۆیان سەر بەقوتابخانەی شێخی ئیسلام –لەم ڕۆژانەدا– دەزانن وڕایدەگەیەنن کەپەیڕەوی مەنهەجی ئەو

دەکەن لەم بوارەدا، لێکۆڵینەوەیان لەبارەی ئەمەوە نوسیوویەتی بەشێوەیەک کەبیانەوێت بگەنە ئەنجامێکی وەرگیراو ئەنجام نەداوە، لەخەسڵەتی هاوسەنگی و مامناوەندبوون نەگەیشتوون کەمەنهەجەکەی ئەو پێی ناسرابوو.

هەندێکیان هاتوون لە مشتومڕەکانی لەگەڵ شیعەدا دوور کەوتونەتەوەو، هەندێجار بەناڕەوا بەرگریان لەحەق کردووەو، هەندێکجاریش وێنەیەکی شێواوی بنەما سیاسیە ئیسلامیەکانیان نیشان داوە، ئەمەش لەڕوانگەی سوربوونیانەوە بووە لەسەر بەرگریکردن لەکەسایەتی هاوەڵانی بەڕێز.

خودی شێخی ئیسلام هۆشداری داوە سەبارەت بەم شێوازە لەوتوێژ کردنداو، ڕەخنەی لەوانە گرتووە کەڕوبەڕووبونەوە لەگەڵ شیعە بێزار بوون و((بەناڕەوا ڕووبەڕوی ناڕەوا بونەتەوەو، بەبیدعە وەڵامی بیدعەیان داوەتەوە)) و لەمەترسیەکانی ئەم مەنهەجە لەسەر حەق و خەڵکەکەی لەڕێی بەدواداچوونی بۆ ئەو مشتومڕەی لەنێوان موسڵمانان و پەیڕەوانی ئاینە ئاسمانیەکاندا بووە تێگەیشتووەو، وتوویەتی: ((شوینکەوتووانی پەیامە ئاسمانیەکان بەهۆی ئەو حەقە کەمەی پێیانە حەقیان بەناڕەوا داپۆشیووەو... زۆرێک لەموسڵمانان کەڕوبەڕوویان دەبنەوە بەچاکی ڕەواو ناڕەوایان لەیەکتر بۆ جیا ناکرێتەوەو، ئەو بەڵگەیە ناهێننەوە کەناڕەواکەیان پوچەڵ دەکاتەوەو، ئەو بەڵگەیەی خوای گەورە ڕوون ناکاتەوە کەبەپەیامبەرەکانیدا ناردوویەتی و، بەوهۆیەشەوە ئاشوب دروست دەبێت)) [1].

---

[1] ـ مجموع الفتاوى ٣٥/١٩٠.

ئیبن تەیمیە بەڕوونی جیاوازی کردووە لەنێوان خەلافەت وپاشایەتیدا کەهیچ کەس لەوانەی پێش ئەو بەوجۆرەیان نەکردووەو، ڕایگەیاندووە کە: ((پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) هەواڵی داوەتێ کەبەکۆتیاهاتنی خەلافەتی پێغەمبەریێتی سەرکۆنەی پاشایەتی و نەنگیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە)) [1]، پاشایەتیش ((وازهێنان لەهەندێک واجبی ئاینی تێدایە)) [2] و، ئەوەشی رەت کردۆتەوە کەراڤەی ئەو جێنشینیایەتیەی ئەبوبەکرو عومەر بەجۆرێک بکات کەخزمەتی بیرۆکەی میراتگرێتی دەسەڵات بکات وەک دواتریش دەیبینین... ئەمەش جیاکردنەوەی نێوان کەسەکان و بنەماکان و، نێوان وەحی و مێژووە کەمەبەستمانە.

**ئەهلی فەرموودە بۆ؟**

هەمان پرسیار دێتە ئارا سەبارەت بەهۆی هەڵبژاردنی ئەهلی فەرموودە جیاواز لەوانی ترو، درێژەدان بەفیقهەکەیان بەدەر لەوانی تر لەم بابەتەدا، وەڵامی ئەم پرسیارەش لەسێ خاڵدا کورت دەکەینەوە:

لیکۆڵەرەوانی فەرموودەناس لەسەر مەنهەجی (جەرح و تەعدیل) ڕاهاتوون و، زانستی (جەرح وتەعدیلیش) زانستێکە لەسەر بەهادان بەپیرۆزی بنەما شەرعیەکان بەسەر پێگەی کەسەکاندا دامەزراوە، ئیدی کەسەکان هەرچەند بەرز بن، لەبەر ئەوە فەرموودەناسان نەنگییەک لەئاشکراکردنی درۆی درۆزنەکان و وەصفیان بەجۆرەها تانە بەمەبەستی پاراستنی سونەت لەخراپەکاریان و، لەمەشدا دوودڵ نین لەئاشکراکردنی فێڵی فێڵکاران وتێکەڵکاری تێکەڵکاران و،

[1] ـ مجموع الفتاوی ٢١/٣٥.

[2] ـ مجموع الفتاوی ٢٤/٣٥.

لەنێویشیاندا کەسانی گەورە لەپەرستش و دونیانەویستیدا، پێشەوا موسلیم لەپێشەکی (صحیح)ەکەیدا بەم قسەیە گوزارشتی لەمە کردووە: ((باب: بيان أن الاسناد من الدين، وأن الرواية لاتكون الا عن الثقات، وأن جرح الرواة جائز، بل واجب، وأنه ليس من الغيبة المحرمة، بل من الذنب عن الشريعة المكرمة)) [١].

واتە: ((دەروازەی: خستنەڕووی سەنەد لەئاینەوەو، گیڕانەوە تەنها لەکەسانی جێ متمانەوە دەبێت و، (جرح)ی گێڕەرەوەکانیش دروستە، بگرە پێویستەو، ئەوە باسکردنی پاشەملە نیە کەقەدەغەکراوە، بگرە بۆ پاککردنەوەی شەریعەتی پیرۆزە)).

- زانایانی فەرموودەناس لەکەسانی تر زۆر وردترن لەوەرگرتنی هەواڵە مێژووییەکان و، لەمێژووی هاوەڵاندا (خوا لێیان ڕازی بێت)، لەبەر ئەوە دەبێت پشت بەزانستی فەرموودە ببەسترێت، چونکە زانستی مێژوو ((متمانە پێکراو نیە لەهەواڵی مردووانـدا)) هەروەک شاعیر محەمەد -بەحەق- لەو کۆپلە شیعرانەیدا وتویەتی کەلەپێشەوەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا دامانا، هەروەها زۆرێک لەزانایانی فەرموودەناس کەپشتمان بەشیکاریەکانیان بەست لێرەدا-وەک زەهەبی و ئیبن حەجەر- بەهەمان شێوە زۆر شارەزا بوون لەزانستی مێژووداو، هەردوو کارەکەیان پێکەوە کۆکردبوویەوەو لەهەردوو زانستەکەدا بەتوانابوون، لەبەر ئەوە ئەوان شایستەن کەسەنەدیان بدرێتە پاڵ و پشتیان پێ ببەسترێت.

- لەکۆتایشدا ئەو تێڕوانینە باوەی هەیە گوایە زانایانی فەرموودەناس بەگشتی -لەنیویاندا ئیبن تەیمیە بەتایبەتی-

---

[1] ـ صحيح مسلم ١٤/١.

پابەندبوون بەمەنهەجی خۆپاریزی و پاساو هێنانەوە لەکاتی قسەکردنیان سەبارەت بەئاشوب و ناکۆکییە سیاسیەکانی نیوان هاوەڵان و، قسەکردنیان لەم بابەتەدا لەگێڕانەوە زیاتر یاخود لەبەرگری بێ بەڵگەو شیکاری زیاتر نیە، لەبەر ئەوە ئەم نامەیە بەڵگە لەسەر پێچەوانەبوونی ئەو تێڕوانینە هەڵەیە دەخاتە بەردەم خوێنەرو، خوێنەری بەئاگا لەمیانی قسەکانی فەرموودەناساندا کەلێرەدا خستومانەتە ڕوو ئەوە دەبینێت کەئەم بۆچوونە پوچەل بکاتەوەو، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کەزۆرێک لەفەرموودەناسان بەبوێری و لێهاتوویەوە قسەیان سەبارەت بەم بابەتە کردووەو، بڵاو بوونەوەی ئەو تێڕوانینە تەنها شوینەوارێکە لەشوێنەوارە خراپە زۆرەکان کەبەهۆی سەرنج نەدانی پێویست لەنوسراوەکانی ئیبن تەیمیەو فەرموودەناسان دروست بووە.

**مەنهەجی زانست و دادپەروەری**

ئیبن تەیمیە مەنهەجەکەی خۆی لەباسکردنی ئەو بابەتانەی جێی ناکۆکین وبونە هۆی پەرتەوازەی ئومەت خستۆتە ڕوو، ئەویش بریتییە لەمەنهەجێک بنچینەکەی زانست ودادپەروەرییەو، داوا لەموسڵمانانیش دەکات ئەم مەنهەجە پەیڕەو بکەن و، ئەوەش لای شێخی ئیسلام شاراوە نەبووە-کەماوەیەکی زۆر لەنێو ئەو ناکۆکییانەی ئومەتدا ژیاوەو نەهامەتیەکانی بینییوە-کە دەردی ئەوانەی بەشداری ئەم ناکۆکییانە دەکەن لەدوو شتدا خۆی دەبینێتەوە:

بێئاگایی لەبابەتی ناکۆکییەکەو، کەمتەرخەمیی لەگەڕان و تاوتوێکردنیدا وەک پێویست، کەخاڵی جێی ناکۆکی بدۆزنەوەو، لەڕاستگۆیی ئەوەی گێڕاویەتیەوە بکۆڵنەوەو، لەهۆکارو پاڵنەرەکانی

ڕووداوەکان ئاگاداربن و، بەشداریکردنی بێئاگایانەش پێچەوانەی ئەم هۆشدارییەی خوای گەورەیە کەدەفەرموویت: ((وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ[1]))، هەروەها پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) سەبارەت بەسێ قازی، کەقازی بێئاگای لەپێڕی ئەوانەدا باسکردووە کەدەچنە ئاگرەوە[٢].

-ستەمکردن لەلایەک لەدوولا ناکۆکەکە، بەدەمارگیری و سنووربەزاندن، یاخود بەچاوپۆشی لەلایەکی تر و موجامەلەکردنی، هەرچەندە خوای گەورە هۆشداری داوە پێمان کەلەگەڵ ئارەزووی دوژمنایەتی نەبێتە پاڵنەر، یاخود ڕکابەرایەتی نەمانترسێنێت و، سنووری ڕاگەیاندنی حەق و وەرگرتنی نەبەزێنین، هەروەک چۆن فەرمانمان پێدەکات بەشاهێدی دادپەروەرانە، بائەو شاهێدیە لەسەر خۆمان یاخود دایک و نزیکانمان بێت، لەمبارەیەوە خوای گەورە دەفەرموویت: ((وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى)) [٣]، لەئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ إِنْ يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَاللَّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلَا تَتَّبِعُوا الْهَوَى أَنْ تَعْدِلُوا وَإِنْ تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا)) [٤].

ئەمە ئەو واتایانەیە کەئیبن تەیمیە وەری گرتوون و، ڕاسپاردەی ئەوەیە کەهەرکەس زانستی پێویست و دادپەروەری تێدا نەبوو خۆی لەقەرەی ئەم بابەتە نەدات، بابابەتەکە بۆ کەسانی

---

[1] سورەتی الاسراء: ئایەتی ٣٦.

[2] ـ دواتر تەخریجی فەرموودەکە دەنووسین.

[3] ـ سورەتی المائدة: بەشێک لەئایەتی ٨.

[4] ـ سورەتی النساء: ئایەتی ١٣٥.

شارەزای بوارەکە بەجێ بهێڵێت و، ناکۆکییەکان بخاتەوە بەردەم پەروەردگاری بەندەکان کەحاکمی دادپەروەرەو، ئیبن تەیمیە بابەتی ((وازهێنان لەوەی کەلەنێوان هاوەڵاندا ڕوویداوە)) نەکردۆتەوە بابەتێکی عەقیدەیی -وەک ئەوەی هەندێک لەوانەی جیاوازی ناکەن لەنێوان وەحی و مێژوودا کردوویانە- بەڵکو ڕوونی کردۆتەوە کۆکەرەوەی هەموو کارەکە بریتییە لەزانست و دادپەروەری، ئەگەرنا با باسی ئەو چاکەو ئایندارییەیان بکات کەدەیزانێت و، ئەو ناکۆکی و ململانێیەشی ڕوویداوە لەنیوانیاندا ئەوا فەرمان لەسەردانی لای خوای گەورەیە)) [١].

شێخی ئیسلام لەچەندین کتێبیدا جەختی لەسەر هەبوونی زانست ودادپەروەری لەم بابەتەدا کردووە:

- ئەوەی ڕاگەیاندووە کە ((ئاین هەمووی زانین و دادپەروەرییە)) [٢]و، ((خوای گەورە ئەوقسەکردنەی پێخۆشە کەبەزانین و دادپەروەریەوە بێت و، هەموو خاوەن مافێک مافی خۆی بدرێتێ و، هەمووکەس لەپێگەی خۆی دابنرێت)) [٣]، بەڕاستیش لەمەدا ڕاستی فەرمووە، چونکە بۆ زانین و داپەوەریو لەپێناوی ئەو دووانەدا پەیامەکان و، پەیامبەرانی ناردووە تاخەڵکی فێری زانین و دانایی بکەن و، ڕێگای ئەنجامدانی دادپەروەری نیشانیان بدات، خوای گەورە دەفەرموویێت: ((**هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ**)) [٤]، هەروەها

---

[1] ـ منهاج السنة ٦/٢٥٤.

[2] ـ مجموع الفتاوى١٧٩/٢٨.

[3] ـ مجموع الفتاوى ٢٠٥/١٢.

[4] ـ سورەتی الجمعة، ئایەتی ٢.

دەفەرموویت: ((لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ)) [١].

- سونەتیش بونیاتەکەی لەسەر زانین و دادپەروەرییە، ئەمەش مەنهەجی ئەوانەیە کەبەڕاستی سەر بەم مەنهەجە بن نەک تەنها بەبانگەشە، دەڵێت: ((خوای گەورە لەقورئاندا نەهی کردووە لەئاژاوەو پەرتەوازەیی و، فەرمانی کردووە دەست بگرن بەپەیامەکەیەوەو، ئەمەش بابەتێکە لەسەر بڕوادار پێویستە دامەزراو بێت تێیداو، دەست بەڕێبازی خواوە بگرێت، چونکە سونەت لەسەر زانین و دادپەروەری و، شوێنکەوتنی قورئان و سونەتی پێغەمبەر ڕاوەستاوە)) [٢] و دەڵێت: ((..بەڵام پەیڕەوکارانی سونەت ئەوا هەموو بڕواداران لەخۆ دەگرن و، بەزانین و دادپەروەریەوە قسە دەکەن، لەبێئاگایان و، پێڕی هەواو هەوەس نین و، خۆیان بێبەری دەکەن لەهەموو ڕێبازی رافزی و ناصبی و، شوین پێشینانی یەکەمین دەکەون و، ڕێزو بەهاو چاکەی هاوەڵان دەزانن و، ڕەچاوی مافەکانی ئال وبەیت دەکەن کەشەرع بۆی بڕیار داون و، بەوە ڕازی نابن کەموختار (کوڕی ئەبو عوبەیدە)و هاوشێوەکانیان ئەنجامیانداو بەدرۆزنیان دادەنێن و، بەوەش ڕازی نابن کەحەجاج (کوڕی یوسف)و ستەمکارانی هاوشێوەی ئەنجامیاندا)) [٣]، بەمجۆرە ((ئەهلی سوننە بەزانین ودادپەروەری قسە دەکەن و، مافی هەموو خاوەن مافێک دەدەن)) [٤]، ئیبن تەیمیەش لێرەدا باسی ئەوە دەکات کەدەکرێت وا بکرێت، بەڵام

---

[1] ـ سورەتی الحدید، ئایەتی ٢٥.

[2] ـ مجموع الفتاوی ٣/٤٠٩.

[3] ـ منهاج السنة٢/ ٧١.

[4] ـ منهاج السنة٤/ ٣٥٨.

ئەوەی بەکرداری هەیە، ئەوا هەندێک لەوانەی شوێنکەوتەی سوننەتن پابەند نەبوون پێیەوە، هەروەک لەم توێژینەوەیەدا لەڕێی قسەکانی خودی ئیبن تەیمیەو، لەڕێی ئەو نمونانەی دەیخەینە ڕوو لەکۆتایی لێکۆڵینەوەکەدا ڕوونی دەکەینەوە.

- زانین وداپەروەری ئەگەر لەلقە لاوەکیەکاندا داواکراو بن، ئەوا هەردووکیان لە((بابەتەکان –مقالات))ی –پەیوەنددار بەئوصلی ئاینەوە و هەمەکیەکانی شەریعەت- لەپێشترن و، خەڵکیش لەمانەدا زیاتر پێویستیان پێیەتی، لەمبارەیەشەوە وتوویەتی: ((لەسەر مرۆڤ پێویستە زانین ودادپەروەری هەبێت لەو قسانەی بۆ خەڵکی دەکات، چونکە حوکمدان بەزانین و داپەروەرییەوە لەوەدا لەپێشترە لەکاروبارە بچوکەکان، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((القضاة ثلاثة: قاضیان فی النار، وقاض فی الجنة، رجل علم الحق وقضی به فهو فی الجنة، ورجل قضی للناس علی جهل، فهو فی النار، ورجل علم الحق وقضی بخلافه فهو فی النار))، واتە: قازیەکان سێ جۆرن: دوو جۆر قازیان دەچنە ئاگرەوە، جۆرێکیشیان دەچێتە بەهەشت، یەکێکیان حەقی زانیوەو حوکمی پێ کردووە ئەمەیانە لەبەهەشتایە، یەکێکیشیان بەپێی نەزانی حوکمی بەسەر خەڵکیدا داوە، ئەمەیان لەئاگردایە، یەکێکیشیان حەقی زانیوەو بەپێچەوانەیەوە حوکمی کردووە، ئەمەشیان لەئاگردایە))، ئەگەر ئەمە بۆ ئەو کەسانە بێت کەحوکم لەبارەی درهەم و پۆشاکەوە دەدەن، ئەبێت بۆ ئەوانە چۆن بێت کەحوکم لەبارەی ئوصولەکانەوە دەدەن کەقسەکردن سەبارەت بەخوای گەورەو دروستکراوەکانی و، فەرمان و بەڵێن و تۆڵەکردنەوەکانی –أمره ووعده ووعیده-))[1]، لەمەشدا

---

[1] ـ ابن تیمیة: درء تعارض العقل والنقل ٤٠٩/٨، فەرموودەکەی ((سێ قازیەکانن سیانن..)) بەدەربڕینی جۆراو جۆر گێڕدراوەتەوە: حاکم ١٠١/٤ و، بیهقی لە الکبری

ئامۆژگاری بۆ ئەو کەسانە هەیە کەبوێری دەکەن بەبێ زانین و بەبێ دادپەروەری قسە لەم بابەتانەدا دەکەن و، ئەوانەشی کەبەبێ بیرکردنەوەو بەبێ لێکدانەوە یان ڕامان قسە لەوبارەیەوە دەکەن.

- ئەمە مەنهەجی پێشەوایانی ئومەتە کەلەزانستدا ڕۆچوون و، دەڵێت: ((هەرکەس لەئومەت خاوەن قسەی ڕاستگۆیانە بێت، بەجۆرێک کەلەنێو کۆمەڵی خەڵکیدا بەباشی و ستایشەوە باسی بکرێت، ئەوانە پێشەوایانی ڕێگا ڕۆشنکاروچرای (مصباح الدجی) بوون، بەراورد بەڕاستەکانیان هەڵەیان کەم بووەو، بەگشتیش لەبابەتەکانی ئیجتیهاددا کەلەوەشدا پاساویان هەیە تێیداو، ئەمانەش ئەو کەسانەن کەشوێن زانین و دادپەروەری کەوتوون، ئەوان لەنەزانی و ستەمەوە دوورن، لەشوێنکەوتنی گومان و ویستەکانی ئارەزووەوە دوورن)) [١].
- گەنگەشەی زانستی لەبابەتی ناکۆکیدا بەبێ ئەم دوو بنەمایە گونجاو نیە، ئەمەیە ئەو ((گەنگەشە دادپەروەرانەی کەمرۆڤ تێیدا بەزانین و دادپەروەرییەوە قسە دەکات نەک بەنەزانی وستەمەوە)) [٢]، هەرکەس پابەند نەبوو بەمەوە ئەوا لەبیدعەوە نزیکتر لەوەی لەسونەتەوە نزیک بێت ئیدی هەرناوێکی هەبێت، چونکە سوننە ڕێبازو مەنهەجە، نەک تەنها دروشم وبانگەشەو، وتوویەتی: ((قسەکردن لەبارەی خەڵکیەوە پێویستە بەزانین و دادپەروەرییەوە بێت، نەک بەنەزانی و ستەمەوە، وەک ئەوەی بیدعەچیەکان دەیکەن)) [٣].

---

١١٧/١٠ و، لە الشعب ٧٣/٦و، ترمذی ٦١٣/٣ و، طبرانی لە الاوسط دا ٣٩/٧ و لە الکبیر ٢١/٢دا.

[1] ـ مجموع الفتاوی ٤٣/١١.

[2] ـ منهاج السنة ٣٤٣/٢.

[3] ـ منهاج السنة ٣٣٧/٤

• قسەکردن بەزانین و دادپەروەری سەبارەت بەوەی لەنێوان هاوەڵانی پایەبەرزدا (خوا لێیان ڕازی بێت) کارێکەو هەر دەبێت وا بێت، ئەمەیان لەپێشترەو پێویسترە لەوەی قسە لەبارەی ناکۆکییەکانی موسڵمانانی تر بەگشتی بکرێت، وتویەتی: ((لێرەدا مەبەست ئەوەیە ئەگەر وا پێویست بێت کەسەبارەت بەوەی لەنێوان باوەڕداران بەگشتی ڕوویداوە بەزانین ودادپەروەری بێت و، ئەوە بگەڕێنرێتەوە بۆ لای خوداو پێغەمبەر، ئەوا ئەمە لەکاروباری هاوەڵاندا لەپێشترە)) [1]، ((ئاشکرایە ئێمە ئەگەر قسەمان لەبارەی ئەو کەسانەوە کرد کەلەهاوەڵان نین، وەک پادشایان کەناکۆکیان لەسەر پاشایەتی هەبووە، زانایان و گەورەکان کەلەبابەتی ئاین و زانستدا ناکۆک بوون، لەسەرمان پێویستە بەزانین و دادپەروەریەوە قسە بکەین، نەک بەنەزانی و ستەم، چونکە دادپەروەری لەسەر هەر کەس لەهەموو حاڵەتێکدا بەرانبەر بەکەسانی تر پێویستەو، ستەمیش بەڕەهایی حەرامکراوەو بەهیچ شێوەیەک ڕێگای پێنادرێت)) [2].

• لەکۆتایدا لادانی پەڵە لەهاوەڵانی پایەبەرز نابێتە پاساو بۆ دەرچوون لەم دوو بنەمایە، بەڵکو ((ئەگەر بیدعەچییەک دەرکەوت کەبەبەتاڵ پێیدا هەڵدەدان، ئەوا پێویستە ئەو قسانەی کەڕاست نین لێیان لابدرێت و، بەبەڵگەکانی زانین و دادپەروەرانە پوچەڵ بکرێنەوە)) [3]، لەبەر ئەوە پێویستە لەقسەکانی بەرانبەر دڵنیا ببیتەوە کەناڕەوایە، پێویستە کەبەرگریمان بەپێی هەردوو ڕێسای زانین و دادپەروەری بێت، ئەگەرنا ئەوا بەنەزانی و ستەمەو، وەڵامدانەوەی پوچەڵە بەپوچەڵ.

---

[1] ـ منهاج السنة ١٣٣/٥.
[2] ـ منهاج السنة ١٢٦/٥.
[3] ـ منهاج السنة ٢٥٤/٦.

**بنەمای مەنهەجی**

ئـەوەی لـەم توێژینـەوەیـەدا دەمانـەوێـت تـەنها قـەتیـسکردنی قسەکانی ئیبن تەیمیەو شیکردنەوەکانی بۆ ناکۆکییە سیاسیەکانی نێـوان هـاوەڵان نیـە –ئـەوە کارێکـە لـەدەرەوەی بایـەخدانمانـەوە– بەڵکو دەمانـەوێت هـەندێک ڕێسای مـەنهـەجی دەربهێنین کـەئیبن تەیمیە لەنووسینەکانیدا بەڕاشکاوی باسی کردوون، یاخود بکرێت لەڕێی ئاماژەدانەکانیـەوە لـەشیکاری بۆ ناکۆکییـەکان دەربهێنـرێن، لەبەر ئەوە ئەم توێژینەوەیە پەیوەستە بەبنەما مەنهەجیە گشتیەکان لەمامەڵە لەگەڵ ئەو ناکۆکییانەدا، نەک درێژەی ئەو ناکۆکیانەوبەشە وردەکانی، ئەوەی وایکردووە ئەمە بکەین بۆ ئەو لادانە مەنهەجییە دەگـەڕێتـەوە کـەلـەلای هـەندێک لـەوانـەی قسـەیـان لـەبـارەی ئـەم بابەتەوە کردووە یاخود گەنگەشەیان سەبارەت بەم بابەتە کردووە لـەگـەڵـی ژیـاوین و بینیومانـە کـەلـەسنووری زانین و دادپـەروەری دەری کردوون، سەرەڕای ئەوەی کەبەزۆری نیـەتـان بـاش بـووە و مەبەستیان دروست بووە.

ئیبن تـەیمیـە گرنگـی ئـەو ئوصـولە گشتی و بنـەمـا مـەنهـەجیـە گـشتیانەی لـەپابـەنـدبوون بـەزانـین و دادپـەروەرییـەوە ڕوون کردۆتەوەو، وتوویەتی: ((دەبێت مرۆڤ ئوصـولی گشتی لا بێت تـا بەشـەکیەکانی بۆ بگێڕێتەوە، بۆ ئـەوەی بـەزانین ودادپـەروەرییـەوە قسە بکـات و، پاشـان بزانێت چـۆن ئـەو بـەشـەکیانـە ڕوویانـداوە، ئەگەر وانەکات ئەوا لەدرۆو نەزانی نێو ئـەو بـەشـەکیانـەو، نـەزانـی وسـتەمـی لـەگـشتەکیـەکانـدا دەمێنێتـەوەو بـەو هۆیـەشـەوە خراپەکاریەکی مەزن دێتە ئارا)) [1].

---

[1] ـ منهاج السنة ٨٣/٥، هەروەها بڕوانە هەمان واتا لە (الفتاوى) ٢٠٣/١٩.

ئەم هەمەکییە مەنهەجیانە بەبۆچۆنی ئێمە بەنرخترینی ئەوەیە کەئیبن تەیمیە لەم بوارەدا پێشکەشی کردووە، کەئەوانیش ئەو هەمەکیانەیە کەهیچ تویژەرێک لەمێژووی ئیسلامی و فیقهی سیاسی ئیسلامی دەستبەرداریان نابێت.

ئەو بەشەکییانەشی کەئیبن تەیمیە پێشکەشی کردوون و هەندێک لەهەڵە بچوکەکانی گیڕانەوە یاخود شیکردنەوەی گرتۆتەوە، ئەوا لەمیانی ئەم لێکۆڵینەوەیدا نمونەیان لێ ڕوون دەکەینەوە، چونکە ئێمە خۆمان بەتەواوی بەقسەکانی ئیبن تەیمیەوە نەبەستۆتەوەو، هیچ نارەحەتیەک لەڕەتکردنەوەی هەندێکیاندا نابینین، ئەگەر هاتوو لاوازی سەنەدەکەیان دەرکەوت، یاخود زۆری لەخۆ کردبوو لەخستنە ڕوویدا، کەئەمەش بەهەرحاڵ کارێکی دەگمەنە.

هەرچۆنێک بێت ئەم نامەیە توێژینەوەیەکی پێویست نیە بۆ هەموو ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان و، باسکردنی هەموو ئەوە نیە کەئیبن تەیمیە سەبارەت بەم بابەتە نووسیوویەتی، بەڵکو تەنها ڕێسا مەنهەجیەکانەو هەوڵمانداوە لەنووسینە سیاسیەکانیەوە وەریان بگرین، کەخوای گەورە ئەو فەزڵەی لەگەڵ کردین ماوەیەک لەگەڵ ئەو نووسینانەی ژیاین.

لەوانەیە هەندێکجار شیکاری هەندێک لەزانایانی فەرموودەناس زیاد بکەین، وەک هەردوو زانای پایەبەرز زەهەبی و ئیبن حەجەر، دەخوازین ئەو ڕێسایانەش ببنە یارمەتیدەری لێکۆڵەر لەگەڕان بەشوێن ڕاستی و، ئەوانەی دەیانەوێت ڕەهەندەکانی ئەو ناکۆکییانەو هۆکارەکانی پشتیان بزانن و، گرنگی ئەوەیان بۆ دەربکەوێت لەپێناوی بونیاتنانی ئایندەی ئەم ئومەتە.

## ڕێسای یەکەم
## دڵنیابوون لەنەقڵ وگێڕانەوەدا
## (التثبت فی النقل والروایة)

دەردی زۆرێک لەوانەی باسیان لەناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان کردووە بریتییە لەدڵنیا نەبوون لـەنـەقڵدا، بـەم هۆیـەشـەوە نــەوە موسـڵمانەکـان میراتێکـی گـەورەی گێڕانـەوەی دژیـەکیـان سـەبـارەت بـەو ڕووداوانـە بۆمـاوەتـەوە، لـەمـەشـدا خواسـت و ئـارەزووەکـان کـاری خۆیـان کـردووەو، وایلێهـاتووە زۆرینـەی لێکۆڵەران ئەو گێڕانـەوانـە وەردەگرن کەلـەگـەڵ دیدو تێڕوانینیاندا دەگونجێت، بەبێ ئەوەی پشت بەپێوەرێکی بابەتی لەنەقڵدا ببەستن.

لەم بوارەشدا هیچ پێوەرێک نیە باشتر بێت لەمـەنهـەجی ئـەهلی فەرمـوودە لـەنـەقڵدا، چونکـە مـەنهـەجێکی بابـەتییـەو لـەدەرەوەیـەوە حوکم بـەسـەر گێڕانـەوەکـەدا دەدات و، گرنگـی بـەوە نـادات کـەئـەم تێڕوانینە یان ئەو بۆچوونە پشتیوانی دەکات یان نـا، ئـەگـەر هـاتوو بـەسـەنـەدێکی نـەپچـڕاو لـەگێـڕەرەوە دادپـەروەرەکانـەوە هـاتبوو، هەروەها لەڕیز دەرچوون یاخود ناتەواویەکی خراپی تێدا نەبوو.

ئـەوەی سـەیـرەو جێگـەی داخـە لـەئێستادا ئـەوەیـە کـەهـەندێک لـەنووسـەرانـی هاوچـەرخ کـەبـەپابـەندبوون بـەمـەنهـەجی ئـەهلی فەرموودە ناسـراون –بـەهـۆی پـەیـڕەوکـردن و پسپۆڕبوونیانەوە– بەڵام لەتوێژینەوەکانیاندا سەبارەت بەناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هـاوەڵان خۆیـان تـەنهـا لـەڕووی تیۆریـەوە پابـەنـد کـردووە بـەو مـەنهـەجـەوەو، دێن هێرش دەکـەنـە سـەر ئـەوانـەی کـەبـەدرۆزن و

ئاسانكار لەنەقڵدا ناسراون، پاشان ڕێگە بەخۆیان دەدەن کەهەموو جۆرێک لەئاسانکاری ئەنجام بدەن ئەگەر هاتوو هەندێک لەگێڕانەوەکان پشتیوانی تێڕوانینەکەیانی لەخستنە ڕوو شیکردنەوەدا دەکرد، لەکۆتایی ئەم نامەیەدا لەکاتی قسەکردن لەسەر مەنهەجی ئیبن عەرەبی و قوتابییە هاوچەرخەکانی لەمیانی بڕگەی: ((وتوێژ لەگەڵ قوتابخانەی شیعەگەرایی سونیدا)) باسی نمونەی لەمجۆرە دەکەین.

چەندین لێکۆڵینەوەی ژمارەیەک لەتوێژەری هاوچەرخمان بینییوە، نوسەرانیان کۆششی باشیان کردووە لەرەخنەگرتن لەگێڕانەوەکانی مێژوونووسان سەبارەت ئاشوب –بەتایبەت تەبەری– و خستنەڕووی ئەوەی ڕاستە، ئەمەش هەوڵێکە توێژەرانی خاوەن توانای شیکردنەوە پێویستیان بەوەیە سوودی لێ ببینن، ئەگەر ویستیان سوود لەو مێژوونوسانە وەربگرن.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم لێکۆڵینەوانە لەدوولاوە ناتەواویان تێدایە:

یەکەمیان: نوسەرانیان هەوڵی زۆریان نەداوە بۆ بەدواداچوون و زانینی ئەو گێڕانەوانەی لەکتێبەکانی فەرموودەدا هاتوون، خۆ ئەگەر ئەوانەیان بەفراوانی پێویستەوە ئەنجام بدایە، ئەوا پێویستیان بەگێڕانەوەی مێژوونووسان –لەنێویشیاندا تەبەری– زۆر بەکەمی دەبوو، ئەمەش کەمتەرخەمییەکی نەشیاوە، بەتایبەت لەلایەن پسپۆڕانی زانستی فەرموودەوە.

دووەمیشیان: ئەوان خۆیان پابەند نەکردووە بەو مەنهەجەی کەبانگەشەیان بۆ کردووە، ئەوەتا هەرکاتێ لەڕەخنەگرتن لەگێڕانەوەکانی مێژوونووسان دەبنەوە و، دەستدەکەن بەشیکردنەوەی ڕووداوەکان، هەموو ڕێساکانی فەرموودە لەیاد دەکەن و، ئەوەی مێژوونووسان هێناویانەو پاڵپشتی

شیکارییەکەیان دەکات –لەنێویشیاندا هاوچەرخەکان- دەهێنن بەبێ ڕەخنەو پێداچوونەوەو، ئەو گێڕانەوانەش ڕەت دەکەنەوە کەلەگەڵ شیکاریەکەی ئەماندا یەکناگرێتەوە بەبێ بوونی بەڵگە لەڕێساکانی فەرموودەدا کەئەو کاری لەسەر دەکات.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەم لێکۆڵینەوانە بەهایەکی زانستی مەزنیان لەبواری جیاکردنەوەی گێڕانەوە ڕاست و لاوازەکان لەمێژووی تەبەریدا هەیە، لەوانەیە توێژەرانی تر سوود لەو هەوڵە زانستییە شیکاریانەی ئەو ڕووداوانە وەربگرن زیاتر لەوەی کەنوسەرانی ئەو لێکۆڵینەوانە خۆیان لێی سوود مەند بوون، بۆی هەیە ئەو کەسەی پێی ڕادەگەیەنرێت بەئاگاداتر بێت لەو کەسەی کەبیستویەتی.

هەرچۆنێک بێت ئەو کەسەی دەیەوێت لەسەر ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵا بنووسێت –بەبێ سەرکەشی لەنەقڵدا- پێویستی بەوەیە کەئارامگر بێت، بەکتێبە (صحاح)و(سنن)و(مسانید)ەکاندا بەبێماندوو بوون بگەڕێت، پاش ئەوە بەرەو کتێبەکانی (تراجم) بچێت کەئەهلی فەرموودە نووسیوویانە، کەڕاستکردنەوەی زۆرێک لەگێڕانەوە مێژووییەکان و، تانەدان لەکەسانی مشەخۆرو نەخۆشیان لەخۆ گرتووەو، لەو کەسانە بن کەتوانای مەنهەجی ڕێککردنیان هەیە بەجۆرێک بتوانن ئەو هەواڵە پەرتەوازانە لەیەک سیاقدا بهێنن و، یەک وێنەی تەواو لێیان-بەبێ ئەوەی پێویستی بەچۆنیەتی ڕیکخستنی ئیشینەکان و بایەخدانەکانیان هەبێت- دروست بکەن، پاشان هەستیت بەهەڵێنجانی گوزارشتی ئەو وێنەیە لەڕابردووداو پەندو وانەکانی بۆ ئایندە.

کارەکە هەرچۆنێک بێت، کتیبەکانی فەرمووده زۆری لەوه تێدایه، لێکۆڵەر بەمامەڵەی لەگەڵیداو، بەچوونە نێو گەنجینەکانیەوه، دەگاتە ئەو بڕوایەی کەبەدرێژی سەبارەت بەژیانی سەردەمی یەکەم بەجۆرێک دواوه کەبەسه بۆ هەرکەس ویستی لەوه بێت، خۆ ئەگەر فراوانکردنی ویست ئەوا لەکتێبی مێژوونووساندا تەنها درێژەی سادە هەیە کە کەلێنەکانی نێو ئەو بۆچوونەی بۆ پڕ دەکاتەوه کەلەسەر گێڕانەوە ڕاستەکان بونیاتی ناوه، لەوانەیە هەر پێویستی بەوەش نەبێت.

باشترینی مێژوونووسانیش ئەوانەن کەئەهلی فەرموودەن، زۆرێک لەزانایان دوو زانستیان پێکەوه تێدا کۆبۆتەوه، لەدوو پیشەدا شارەزا بووه، لەوانەش زەهەبی و ئیبن کەسیرو ئیبن حەجەرو جگە لەوان... ئەو زانایانە باپابەندیش نەبن بەمەنهەجی (جرح وتعديل) لەکتێبە مێژووییەکانیاندا، لەگەڵ ئەوەدا بەهۆی کارکردنیان لەگەڵ ڕاست و لاوازداو، بەهۆی ئەزموونیان لەڕەخنە لەئەوەی گوازراوەتەوه بەشێوەیەکی بەراوردکاری، وادەکات بەزۆری ئاگاداربن لەگێڕانەوەی ناتەواو و لەڕیزدەرچوو درۆکان، کەسەرپێچی گیڕانەوه ڕاستەکان دەکات وەک ئەوان شارەزاینی و، ئەوانیش لەبارەی خراپی یاخود لەریزدەرچوونی یان ناڕاستیانەوه هۆشداری دەدەن، ئەمەش یارمەتیدەری باشە بۆ ئەو تویژەرانەی سوورن لەسەر پابەندبوون بەدروستی گوازراوەکان.

## ڕێسای دووەم
## لەبەرچاوگرتنی باشەی هاوەڵان
## (استصحاب فضل الاصحاب)

لەڕاستیدا زۆرێک لەوانەی باسی ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵانیان کردووە زیادەڕەویان کردووە لەچاوپۆشی لەهەندێکیان بەرەواو نارەوا، تەنها بەوە وازیان نەهێناوە کەئەم هەڵەیە یان ئەو هەڵەیە بدەنە پاڵ ئەم یان ئەو هاوەڵە، بەڵکو باشێتیەکان و پێشینی و جیهادی ئەو هاوەڵانەیان لەیاد کردووەو، زمان درێژیان بەخراپە بەرانبەر کردوون و، تۆمەتیان داوەنەتە پاڵ.

ئیبن تەیمیە بەرەنگاری ئەوانە-لەسەرووی هەموویانەوە شیعە ڕافزیەکان- بۆتەوەو لەوەڵامدانەوەیاندا ئەم کتێبە پڕ بەهایەی نووسیووە: ((منهاج السنة النبوية في الرد على الشيعة والقدرية))، کەبەهەمان شێوە بەناوی ((ميزان الاعتدال في نقض كلام أهل الرفض والاعتزال)) ناسراوەو، فەرهەنگێکی بیروباوەڕو سیاسی گشتییە، بگرە لەوانەیە بەرەهایی فراوانترین کتێب بێت کەلەبارەی فیقهی خەلافەتەوە نووسرابێت، بەهەمان شێوە بوارێکی فراوانی فەتواکانیشی تەرخان کردووە بۆ ئەم بابەتە.

لەبەهێزترین بەڵگەکانیش کەلەم بوارەدا ئیبن تەیمیە هێناویەتیەوە خستنەڕووی باشێتی هاوەڵانە بەسەر تێکڕای نەوەکانی موسڵماناندا، بەو پێیەی کەهەڵگری ئاین و ڕاگەیەنەری بوون بەوانەی پاش خۆیان هاتوون، لەمبارەیەشەوە وتویەتی:

((هەموو ئەوانەی باوەڕیان بەخودا هەیە، ئەوا فەزڵی هاوەڵانیان تا ڕۆژی قیامەت لەسەرە)) [1].

بێویژدانییە -وێڕای پێزانینی کاری جوانیان- بەرانبەر ئەوانە خراپ بیت کەپەیامی خوای گەورەو ڕێگای حەقیان گەیاندووە پێت، ئەم پاساوە بەسادەیی و جوان دەربڕینەکەیەوە بەسە بۆ ئەوەی سەرنجی هەرکەسێکی بەویژدانی عاقڵ رابکێشێت.

ڕێزگرتنی هاوەڵانی پابەرز بەزیادەڕەویکردن لەبارەیانەوە نابێت، یاخود سیفەتێکیان بدرێتە پاڵ کەهی مرۆڤ نەبێت، بەڵکو بەپابەندبوون بەڕێسا شەرعیەکانەوە دەبێت، کەپێشینە بوونی بەباشێتی داناوەو، ڕێگری دەکات لەوەی ئەو باشێتیە تەنها بەهۆی ڕوودانی لادانێک یان گوناهێک لەلایەن ئەم هاوەڵ یاخود ئەو هاوەڵەوە بەهەدەر بدرێت، بەرگریکردن لەلادان و پاساو بۆهێنانەوەشیان لەشەرعدا جێی نابێتەوە، بەڵام بەهەدەردانی باشەی گەورە هاوەڵان بەهەمان شێوە جێی نابێتەوە، لێرەدا دوو نمونە دەخەینە ڕوو:

**نمونەی یەکەم:** میستەح کوڕی ئەساسە (خوا لێی ڕازی بێت)، پیاوێکە لەموهاجیەرەکان و بەشداری بەدری کردووە، لەڕووداوی ئیفکدا دژی عائیشەی دایکی باوەڕداران (خوا لێی ڕازی بێت) بەلاڕێدا چوونێک لێی ڕوویدا، عائیشە باسی ڕووداوی ئیفک دەکات کەیەکەمجار ئاوا گوێی لێبووە، لەفەرموودەیەکی درێژدا کەچەند بڕگەیەکی لێ وەردەگرین کەپەیوەندداره بەبابەتەکەوەو دەڵێت: ((... ئەمجا من و دایکی میستەح بەڕێکەوتین...دایکی میستەح هەڵکەوت و، وتی: لەناوبچێت میستەح، منیش پێم وت: خراپترین قسەت کرد، ئایا قسە بەپیاوێک دەڵێیت کەبەشداری بەدری کردووە؟...

---

[1] ـ منهاج السنة ٣٧٦/٦.

خوای گەورە (قورئانی) بۆ بەرائەتی من نارد، ئەبوبەکری صدیق- خەرجی میستەحی کوڕی ئەساسەی دەکێشا بەهۆی خزمایەتی و هەژاریەوە- وتی: سوێند بەخوا پاش ئەوەی لەبارەی عائیشەوە وتی ئیتر هیچی بۆ خەرج ناکەم، ئەمجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی قورئانی ناردە خوارەوە: (وَلَا يَأْتَلِ أُولُو الْفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةِ أَنْ يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ)، ئەبوبەکری صدیق وتی: بەڵێ سوێند بەخوا، زۆرم پێخۆشە خوای گەورە لێم ببورێت، هەربۆیە گەڕایەوە بۆلای میستەح و خەرجی دەکێشاو، وتی: سوێند بەخوا هەرگیز لێی ناگرمەوە..)) [١]، ((لای تەبەرانی وا گێڕدراوەتەوە کەلەوە بەدوا دووهێندەی پێشتری پێدەدا)) [٢].

ئەم چیرۆکە دوو وانەی پڕ بایەخی پەیوەندار بەبابەتەکەمانی تێدایە:

- وەڵامی عائیشە بۆ دایکی میستەح و، نیگەرانبوونی لەقسەپێوتنی ئەو پیاوە موجاهیدەی بەشداری بەدری کردووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر داننان بەچاکە پێشینداو ئەوانەی لەساتەوەختە نارەحەتەکاندا ئاینیان سەرخستووە کارێکی شەرعی پێویستەو، هاوەڵان ئەمەیان دەزانی ولەبەرچاویان دەگرت.

- ئەو فەزڵ ولەپێشبوونە دەبێتە تکاکار بۆ خاوەنەکەی و، لەسەر بڕواداران پێویستە چاوپۆشی لەهەڵەی بکەن، خوای گەورە خالقی بونەوەر فەرمانی کرد بەئەبوبەکری صدیق کەپەیوەندی

---

[1] ـ البخاري ١٥٢١/٤، سەبارەت بەفەرموودەی ئیفک بەشێوەیەکی گشتی بڕوانە: البخاري ١٤١٥/٤ و مسلم ٢١٢٩/٤ وبیهقی لە (الكبرى)دا ٢٩٥/٥ وعبدالرزاق ٤١٠/٥ و هیثمیٚ: مجمع الزوائد ٧٤/٧.

[2] ـ ابن حجر: فتح الباري ٤٧٨/٨.

لـەگـەڵ ئـەو بـڕواداره موهـاجیرەدا نـەپچڕێـت کـەلـەپێنـاوی خـوا هیجـرەتـی کـردووە، بـەهـۆی هـەڵـەیـەکـەوە (هفـوة) لیّـی ڕوویـداوە، یاخود بەهەڵەداچوونێک (عثرة) تووشی بووبێت، لەکۆتاییدا ئەویش مرۆڤەو هەڵە دەکات.

**نمونــەی دووەم:** حاتــەبـی کـوڕی ئـەبـی بـەلتعـە کـەهـەوڵیـدا هەواڵەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و جوڵـەکانی سـوپاکەی دزە پێبکات بۆ بێباوەڕەکان، دیارە ئەمە هەڵـەی بچوک نیـە لـەکاتی جەنگدا، بەپێی ئەوەی بوخاری چیرۆکەکەی لـەژێرناونیشانی ((بـاب الجاسوس)) [1]دا هێناوەو، ئەبوداودیش لـەژێر ناونیشانی ((بـاب فـی حکم الجاسوس اذا كان مسلما)) [2]، بەڵام پێغـەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) پاسـاوەکـەی حاتـەبـی قبـوڵ کـردو، پێـشینەبـوون و بەشداریکردنی لەجیهاددا بوونـە تکاکـار بـۆی، پاش ئـەوەی عومـەر ویستی لەگەردنی بدات ((عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خـوا ڕێمبدە لەگەردنی بدەم، پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) فـەرمووی: ئـەو بـەشـداری بـەدری کـردووە، تـۆ چوزانیـت لـەوانـەیـە خـوای گـەورە بەبەشداربووانی بەدری فەرمووبێت: چیتان دەوێت ئـەنجامی بـدەن مـن لێتـان خۆشـبووم، عـەمـری کـوڕی دینـار وتـی: ئـەم ئایـەتـەی لەبارەوە هاتە خـوارەوە: ((**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ**)) [3]، ئەم فەرموودەیەش وەک فەرموودەکەی پێشوو وانەیەکی

[1] ـ صحيح البخاري ١٠٩٤/٣.
[2] ـ سنن ابى داود ٤٧/٣.
[3] ـ صحيح البخاري ١٠٩٥/٣ و١٨٥٥/٤.

مەزنی داننان بە باشەی پیاوچاکان و، بەهەدەر نەدانی ئەوچاکەیان بەهۆی هەڵە یاخود کەوتنێکەوە کەئەنجامی دابێت.

بەڵام لێرەدا دەبێت ئاگاداری شتێک بین کەزۆرێک لەزیادەڕۆکاران لەهەموو سەردەمێکدا لێی بێئاگا بوون، ئەویش داننانە بەچاکەو پێشینبوونی خاوەن چاکەکان، ئەوە لەخۆ ناگرێت بەهەڵەکانیان ڕازی بین، یاخود ببێتە هۆی ڕاگیرانی حوکمەکانی ئیسلام بەگشتی بەرانبەریان و، دووفاقەیی لەحوکمی شەرعیدا دروست ناکات، بەجۆرێک بەسەر هەندێکدا جێبەجێ بکرێت وبەسەر هەندێکی تردا جێبەجێ نەکرێت، پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) حەدی بوختانکردنی (القذف) بەسەر هەموو ئەو کەسانەدا جێبەجێ کرد کەلەئیفکدا بەشداربوون، لەنێویشیاندا میستەحی کوڕی ئەساسە کەموهاجیربوو بەشداری بەدریشی کردبوو[1]، قورئانی پیرۆزیش هاتە خوارەوەو هۆشداریدا لەبارەی پشتگیری دوژمنانی خواو دوژمنانی باوەڕداران پاش ئەوەی حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتعە کەموهاجیربوو، بەشداری بەدریشی کردبوو ئەو کارەی ئەنجامدا..

---

[1] ـ بڕوانە: فتح الباري ٤٨٢/٨.

## ڕێسای سێیەم
## جیاوازیکردن لەنێوان گوناهی لێخۆشبوو و هەوڵی سوپاسگوزاردا
## (التمييز بين الذنب المغفور والسعي المشكور)

چەندی دەق لەپێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) هاتووە شاهێدی چوونە بەهەشت دەدات بۆ هەندێک لەهاوەڵانی پایەبەرز، لەوانە دە مژدە پێدراوەکەو، بەشداربووانی بەدرو، بەشداربوونی پەیمانی ڕەزوان، وەک فەرموودەکەی حەتەب کەپێشتر خستمانە ڕوو، لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: ((لن يدخل النار أحد شهد بدرا)) [1]، واتە: هیچ کەس لەوانەی بەشداری بەدریان کردووە ناچنە ئاگرەوە، لەفەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرمووێت: ((لايدخل النار أحد بايع تحت الشجرة)) [2]، واتە: ناچێتە ئاگرەوە کەسێک لەژێر درەختەکەدا بەیعەتی دابێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەخوای گەورە ئەوانەی لەو ڕووداوە بەرزانەدا بەشداربوون لێیان خۆشبووەو لەگوناهەکانیان بوراوەو، لەتێگەیشتنی ئەم دەقانەدا دوو پێڕ لەخەڵکی بەهەڵەدا چوون:

---

[1] ـ ئەحمەد بەپشتبەستن بەمەرجی مسلم گێڕاویەتیەوە، بڕوانە مباركفوری: تحفة الاحوذي بشرح جامع الترمذي ١٤٢/٩و ابن عبدالبر: التمهيد لما فى الموطأ من المعانئ والاسانيد ٣٥٥/٦ وفتح الباري ٣٠٥/٧.

[2] ـ مسلم (بەدەربڕینیی جیاواز) گێڕاویەتیەوە ١٩٤٢/٤ و ابن حبان ١٢٨/١١و ترمذي ٦٩٥/٥و ابوداود ٢١٣/٤و نسائي ٤٦٤/٦.

- پێڕێک وا لەو موژدەیەی بەهەشت تێگەیشتوون بەشێوەیەکی ناڕاشکاو جۆرێک لەبێگوناهی (مەعصومی) دەگەیەنێت، خاوەنەکەی پاش ئەوە گوناه ناکات مەگەر هەڵەیەکی لەسەرهەڵگیراو (خطا مرفوع) کەتەئویلی تێدا بکرێت و، ئەوە ڕەت دەکەنەوە کەشتەکان بەناوی خۆیانەوە ناوبنرێن، زۆریان لەخۆیان کردووە لەلێکدانەوەی هەندێک هەڵە کەئەوانەی تێکەوتووە، یان گوناه کەئەنجامیانداوە.

- پێڕەکەی تریش گوناهەکانیان وا لێکداوەتەوە کەپەیوەندییان بەموژدەی بەهەشتەوە نیە، لەسەر ئەمەش ئەو بەڵێنانەیان بەبەڵگە هێناوەتەوە لەدەقەکانی فەرموودەدا کەواقیعی نیەو، ئەو کەسانە ناگرێتەوە، بەهۆی ئەو موژدەدانە تایبەتەی لەبارەیانەوە هاتووەو، کەوتوونەتە هەڵەوە لەتێگەیشتنداو، سەرپێچی دەقی ڕاستی ڕاشکاویان کردووە.

ئیبن تەیمیە هەڵەی هەردوو مەنهەجەکەی دیاری کردووەو دەڵێت: ((ئەو خەڵکەی لەم ڕووەوە لایانداوە دوو پێڕن: تانەدەران (قادحون) ئەوانەی تانە بەجۆرێ لەکەسێک دەدەن کەخوا لێی خۆش ببێت و، پیاهەڵدەران کەئەو کارانەی لێخۆشبوونیان بۆ هەیە والێدەکەن کەلەبەشی هەوڵی سوپاسگوزار (من باب السعی المشکور) بێت، ئەمەیان زیادەڕەوی دەکات لەکەسێکدا بەشێوەیەک هەتا چاکەکانیشی دەکاتە خراپە، ئەوەشیان بەجۆرێک ستەمی لێدەکات تا یەک خراپەی بکاتە لەناوبەری چاکەکانی)) [١]، پاشان ئەم ڕێسا بەرزە لەقسەکردنی سەبارەت بەدە موژدە پێدراوەکەو

---

[1] ـ منهاج السنة ١٩٨/٦.

بەشداربووانی بەدرو بەشدارانی پەیمانی ڕەزوان جێبەجێ دەکات و، دەڵێت: ((ئیمە شاهێدی ئەوە نادەین کەهەر یەکێک لەوانە گوناھ ناکات، بەڵکو شاهێدی دەدەین کەیەکێک لەوانە ئەگەر گوناهی کرد ئەوا خوای گەورە لەرۆژیی دواییدا سزای نادات و، نایخاتە ئاگرەوە، بەڵکو بێگومان دەیخاتە بەهەشتەوەو، سزای ڕۆژی دوایی بەهۆی تەوبەکردنیەوە، یاخود بەهۆی چاکە زۆرەکانیەوە، یان بەهۆی ئەو نارەحەتیانەی کەدەبنە کەفارەتی، یا بەجگە لەوانە لادەچێت)) [١]، ((مەبەست تەواومەندی (کمال)ی کۆتاییە نەک کەم وکورتی سەرەتا)) [٢].

ئەمەش هەمان لێکدانەوەیە کەئیبن حەجەر پێی گەیشتووە، کاتێ هۆشداریدا کەمەبەست ئەوەیە ((ئەوانە گوناھ دەکەن، بەڵام بەستراوەتەوە بەلێخۆشبوونەوە، وەک باڵازانیەک بەسەر کەسانی تردا، ئەمەش بەهۆی ئەو هەڵوێستە مەزنەوە)) [٣].

ئیبن تەیمیە لێرەدا جیاوازیی کردووە لەنێوان ئەو گوناهەی لێخۆشبوونی بۆ هەیەو ئەو هەوڵەی سوپاسگوزاری بۆ هەیە ئەمەش کارێکی وردی دروستەو، بایەخ وگرنگیەکی زۆری هەیە.

چونکە هەندێک لەو پەرۆشانەی کەپابەند نەبوون بەمەنهەجی زانین ودادپەروەرییەوە لێرەدا گوناهی لێخۆشبوویان گۆڕیووە بۆ هەوڵی سوپاسکراو، ئەمەش کارێکی مەترسیدارە، چونکە کاریگەری دەبێت لەسەر ڕوونی ڕێساو بنەمای شەرعی لەمێشکی

---

[1] ـ منهاج السنة ٢٠٥/٦.

[2] ـ منهاج السنة ٢٠٩/٦..

[3] ـ فتح الباري ٤٨٠/٨.

نەوەی موسڵماناندا، مەنهەجی دادپەروەرانە وادەخوازێت کەهەڵە یاخود گوناھ بەناوی خۆیەوە ناو ببرێت بەبێ هەڵخەڵەتاندن، پاشان ئەو مـوژدەیـە ڕوون بکرێتـەوە کـەلێخۆشـبوونی تێدایـە بـۆ ئـەو کەسانەی دەیانگرێتەوە، بەمەش دەرگا بەڕووی ئەوانەدا دادەخرێت ئاسانکاری دەکەن بۆ شوێنکەوتنی هەڵەو گوناهی گەورەکان، بەڵام ئەوانەی کەدەیانەوێت تانەیان لێ بدەن (قدح فیهم) و زماندرێژی بەرانبەریان بکەن و، بەویژدانەوە مامەڵە لەگەڵ کەس و بنەما هەردووکیان دەکرێت.

## ڕێسای چوارەم
## جیاکردنەوەی مەنهەجی ڕیشەدارو مەنهەجی مێژوویی
## (التمییز بین المنهج التأصیلی والمنهج التاریخی)

ئەو ناکۆکییەی لەبارەی هەڵسەنگاندنی زۆرێک لەهەڵوێستەکانی هاوڵان وکەسێتیان هاتۆتە ئارا هۆیەکەی جیانەکردنەوەی مەنهەجی ڕیشەدارە لەگەڵ مەنهەجی مێژووییدا، چونکە مەنهەجی ڕیشەدار لەبنەماوە سەرچاوە دەگرێت و خەڵکی بۆ دەگەڕێنرێتەوە، خەمی خاوەنانی بریتییە لەبەرگری لەبنەماکانی ئیسلام کەتێکەڵ بەکاری خراپە بکرێت، یاخود شێوینەرەکانی مێژوو بیشێوینێت.

بەڵام مەنهەجی مێژوویی لەوەصفی ئەزموونی مرۆیی کردارییەوە سەرچاوە دەگرێت و، هەندێکیان لەسەر هەندێکی تریان پێوانە دەکات و، خەمی خاوەنەکانیشی بریتییە لەبەرگریکردن لەپیاوانی ئیسلام کەکارەکانیان بشارێتەوە، یاخود شکۆیان

لەدەروونەکاندا بشکینێت، ئەگەر ئێمە ئەم جیاکردنەوەیەمان کرد، ئەوا بۆ هەڵسەنگاندنی بەویژدانانە سوودی دەبێت بۆمان.

با ئێستا ببینین کەئیبن تەیمیە چۆن ئەم ڕێسایەی جێبەجێ کردووە لەهەڵسەنگاندنی کەسێتی معاویەی کوڕی ئەبوسوفیاندا (خوا لێی ڕازی بێت).

بنەڕەتی حوکمدان لەسەر کەسێتی معاویە لەسەر ناکۆکی نێوان دوو مەنهەج بونیات دەنرێت:

- ئەوانەی کاریان بەمەنهەجی مێژوویی کردووە ئەوا پاشایەتیەکەی معاویە بەو پاشاو فەرمانڕەوایانە دەپێون کەدوای ئەو هاتوون یان هاوسەردەمی ئەو بوون، ئارەزوویان بەلای ئەوەدایە بەرگری لێبکەن، ئەمەش کارێکی لۆژیکییە، چونکە معاویە لەفەرمانڕەوایەکەی وبەشەکەی و بەرگریکردنی لەوەی لەژێر دەسەڵاتی موسڵمانانو خاکی ئیسلامدا بووە، بەدڵنیاییەوە لەهەموو ئەوانە باشتر بووە.

- ئەوانەشی پەیڕەویان لەمەنهەجی ڕیشەداری کردووە بەپێی بنەما ڕەسەنە ئیسلامیەکان کەدەوڵەتی پێغەمبەرو خەلافەتی راشیدینی لەسەر دامەزرابوو دادوەری دەکەن و، ئارەزوویان بەلای ڕەخنەلێگرتنیدایە، ئەمەش بەهەمانشێوە کارێکی لۆژیکییە، بەهۆی ئەو کۆسپە گەورانەی لەسەر دەستی ئەو هاتە نێو سیستمی حوکمڕانی ئیسلامی.

کارەکە-وەک ئەوەی ڕوونە- بۆ ناکۆکی لەلۆژیکی مەنهەجدا دەگەڕێتەوە، هەریەک لەو دوو هەڵسەنگاندنە لەسنووری لۆژیکی خۆیدا ڕاستە، ئەگەر وابەستە بوبێت بەدروستی نەقڵ و سەلامەتی لێکدانەوەوە، بەڕاستی ئیبن تەیمیە ئەم ڕیسایەی جێبەجێ کردبوو، گەیشتبووە هەڵسەنگاندنێکی بەویژدانانەی کەسێتی معاویەو،

لـەناکۆکییـەکـە دەربـازی بـووەو، دەڵێـت: ((لـەپادشـایانی موسـڵمان کەسیان لەمعاویە باشتر نەبـوون، هـیچ کـەسـێکی سـەردەمـەکـەشـی لەپادشایانی سەردەمی معاویە لەو باشتر نەبوون ئەگەر رۆژگـاری ئەو درایە پاڵ رۆژانی ئەوانەی دواتری، بەڵام ئەگەر سەردەمی ئەو بدرێتـە پـاڵ سـەردەمـی ئـەبوبـەکـرو عومـەر ئـەوا بـەباشـزانین دەردەکـەوێت و، معاویـە -بـەگوناهـەکانیـەوە- پادشـای وەک خـۆی لەپاش ئەو نەهاتووە)) [١]، ((ئاشکرایە کەئـەو لـەعوسـمان وعـەلییـەوە نزیک نیە، چ جای لەئەبوبەکرو عومـەرەوە)) [٢]، لـەفتواکانیـشیدا ئیـبن تـەیمیـە جـەخـت لـەسـەر ئـەم مانایـە دەکاتـەوەو دەڵێـت: ((زانـاین یـەکدەنگن لـەسـەر ئـەوەی معاویـە باشـترین پادشـای ئـەم ئومـەتـە بووە، چونکە ئەو چوارەی بەر لەئەو خـەلیفـەی پێغـەمبـەر بـوون و، ئەویش یەکەم پادشا بووە)) [٣].

## ڕێسای پێنجەم
## دانانان بەسنووری تەواوەمەندی مرۆڤدا
## ((الاعتراف بحدود الكمال البشرى))

ئـەگـەر هـەمـوو لێکۆڵـەرێکـی بـەویـژدان تێبگـەشـتایە کـەچینـی هـاوەڵان-بـەگـشتی نـەک دانـە دانهیـان- گـەیـشتبوونە ئـەوپـەڕی تـەواوەمـەنـدی مرۆیـی و، هــەمــوو بڕواداریێکـی ڕاسـتگۆ کـەخـوا بپەرستێت خۆشی دەوێن و رقی لـەوانـەیـە کـەڕقـی لێیانـە، بـەڵام – ئـەگــەر لــەزیــادەڕەوی دوور بــوو- ئــەوا دەبێــت کــەتێبگــات

[١] ـ الذهبي: المنتقى ص٤٠٢، ابن تيمية: منهاج السنة ٢٣٢/٦.
[٢] ـ المنتقى ص ٤٠٣.
[٣] ـ مجموع الفتاوى ٤٧٨/٤.

تەواومەندیەکەیان تەواومەندی مرۆییە، لەبەر ئەوە سەیر نابێت کەهەندێک حاڵەتی لاوازی کەلەسروشتی مرۆڤن لێیان ڕوودات:

لەوانەیە مرۆڤ تەقوادار بێت، بەڵام بەهۆی شەیتانەوە داڵغەیان توش ببێت، ئەمەش بەپێی دەقی قورئان: ((إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ)) [1].

- لەوانەی موهاجیر بێت لەپێناوی خوا -بەشاهێدی قورئان- وەک میستەحی کوڕی ئەساسە، بەڵام بەشداری ئیفکیش دەکات و، لەتۆمەتکاران دەبێت.

- لەوانەیە پیاوچاکیش بێت-وەک سەعدی کوڕی عوبادە- بەڵام عائیشە لەهەڵویستێکدا واباسی سەعدی کردووە کەئەو ((پیاو چاک بووە بەڵام پەتا لەبیری بردۆتەوە)) [2].

- لەوانەیە موجاهیدیش بێت لەپێناوی خوادا-وەک ئەهلی بەدرو ئوحود بێت- بەڵام ئارەزووی شتێ لەماڵی دونیا بکات: ((مِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الْآخِرَةَ))٣، ((تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الْآخِرَةَ))٤.

ئەوەتانێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) سزا (حەد)ی شەرابخواردنەوەی لەسەر نعیمان کوڕی عەمری ئەنصاری [5] جێبەجێ

---

[1] ـ سورەتی الاعراف: ئایەتی ٢٠١.

[2] ـ صحيح مسلم ٢١٣٤/٤، مسند احمد ١٩٦/٦، لەگێڕانەوەیەکیشدا: ((بەڵام تووشی تا بووە))، البخاري ٩٤٤/٢، ابن حبان ١٨/١٠، النسائي ٢٩٨/٥، البيهقي ٤١/١٠، احمد ١٩٧/٦، ابويعلي ٣٢٩/٨، لەوانەیە یەکێک لەگێڕانەوەکان ڕاستکردنەوەی ئەویتریان بێت و، مانایان نزیکە لەیەکەوە.

[3] ـ سورەتی ال عمران، ئایەتی ١٥٢.

[4] ـ سورەتی الانفال، ئایەتی ٦٧.

[5] ـ صحيح البخاري ٢٤٨٨/٦.

کرد، هەروەک چۆن عومەری کوڕی خەتاب لەسەر قدامەی کوڕی مەزعون[1] جێبەجێی کرد، هەریەک لەنعیمان و قدامەش لەو کەسانە بوون کەبەشداری بەدریان کردبوو، ئیدی مرۆڤ بەمجۆرەیە: هەرچەند بەهێز بێت لاوازە، هەرچەند تەواومەند بێت ناتەواوی تێدایە، تەنها پێغەمبەران ونێردراوان نەبێت کەخوای گەورە مەعصومی کردوون، ئەگەر ئەمە بەرانبەر ئەو پێشینانە ڕاست بێت کەپاش تاقیکردنەوەو ناڕەحەتی زۆر لەقوتابخانەی پێغەمبەر دەرچوون، ئیدی ئەبێت بۆ دەشتەکیەکان و ئەوانە چۆن بێت کەزۆر دواتر موسڵمان بوون، وەک ئەوانەی لەفەتحی مەکەدا موسڵمان بوون.

ئیبن تەیمیە لایەنەکانی لاوازی مرۆڤی لای زۆرێک لەگەورە هاوەڵان ڕوون کردۆتەوە، ئەو بەوە پاساوی بەیعەتنەدانی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بەئەبوبەکری صدیق لەشەش مانگی یەکەمی جێنشینیەکەیدا بۆ ئەوە گێڕاوەتەوە کە عەلی ((بەرپرسیارێتیەکەی بۆ خۆی دەویست)) [2]و، ئامادەنەبوونی سەعدی کوڕی عوبادەش بۆ بەیعەت پێدانی ئەبوبەکری صدیق جارێک بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەئەنصاریەکان ((دیاریان کردبوو بۆ فەرمانڕەوایەتی و، ئەویش ئەوەی لەدڵی مرۆڤدا دەمێنێتەوە لەدڵیدا مابوویەوە)) [3]، جارێکیش بەوە لێکی دەداتەوە کە((بەهۆی ئەوەی کەداوای فەرمانڕەوایەتی دەکرد)) [4]و، جارێکیش بەلایەنگری بۆ هۆزەکەی: ((سەعد مەبەستی ئەوە بوو کەپیاوێکی ئەنصاری بکرێتە فەرمانڕەوا)) [5]، لەجێگایەکی

---

1 ـ سنن البيهقي ٣١٥/٨.
2 ـ منهاج السنة ٤٥٠/٧.
3 ـ منهاج السنة ٥٣٦/١.
4 ـ منهاج السنة ٥١٨/١.
5 ـ منهاج السنة ٣٣٦/٨.

دیکەشدا ئیبن تەیمیە دەڵێت: ((سەعد دواکەوت و هۆکارەکەی زانرا، چونکە داوای دەکرد بکرێتە فەرمانڕەواو، فەرمانڕەوایەک لەموهاجیرەکان و فەرمانڕەوایەک لەئەنصارەکان دابنرێت)) [١].
شێخی ئیسلام خۆی ماندوو نەکردووە لەزۆرلەخۆکردن بۆ پاساو هێنانەوەی ئەو کارەی سەعد ئەنجامی داوە یان بەتەئویلکردن بۆی، بەڵکو وتوویەتی: ((سەعد با پیاوێکی چاکیش بووبێت، خۆ مەعصوم نیە، بەڵکو گوناهی هەیەو خوای گەورە لێی خۆش دەبێت و، موسڵمانان یەکیان ناسیوە)) [٢]، زەهەبیش بۆ هاوشێوەی ئەمجۆرە لێکدانەوەیە چووە سەبارەت بەسەعد کە ((گەورەیەکی بەڕێزی گوێڕایەڵ بوو، لەرۆژی وەفاتی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) لەدەوری کۆبوونەوە تابەیعەتی پێ بدەن، لەکاتێکدا تووشی تا بوبوو، هەتا ئەبوبەکرو کۆمەڵەکە هاتن، لەبۆچوونەکەی خۆیان پاشگەزیان کردنەوە، ئەوە بۆ سەعد نەبوو)) [٣].
لەداننان بەسنووری تەواومەندی مرۆڤدا پاکخوو نەکردنی کەسانی نامەعصومە لەئارەزوو ویستی دونیایی هەرچەند پایەی بەرز بێت و، سەری بەرز بێت، ئیبن تەیمیە وتوویەتی: ((ئەوەی پەیوەنددار بێت بەم بەشەوە ئەوەیە کەبزانرێت پیاوانی مەزن لەزانین و ئایندا لەهاوەڵان و شوینکەوتووان وئەوانەی پاش ئەوان هاتوون تا ڕۆژی قیامەت، ئەهلی بەیت و جگە لەوانیش، لەوانەیە هەندێک ئیجتیهاد کەگومانی تێدا بێت لێیان و، جۆرێک لەئارەزووی نادیاری تێدا بێت ڕووبدات، بەهۆی ئەمەشەوە شتێ ڕوو بدات کەناکرێت تێیدا شوێنی بکەویت، با لەئەولیا تەقوادارەکانی خوداش بێت، نمونەی ئەمانە ئەگەر

---

[1] ـ منهاج السنة ٣٣١/٨.
[2] ـ منهاج السنة ٣٢٦/٦.
[3] ـ سير أعلام النبلاء ٢٧٦/١.

کەوتن ئەوا ئاشوب لەنێوان دوو دەستەدا دروست دەبێت: دەستەیەک بەمەزن سەیری دەکەن و، دەیانەوێت ئەو کارەی پەیڕەو بکەن و شوێنی بکەون و، دەستەیەکیش سەرزەنشتی دەکەن و، ئەوە دەکەنە نەنگی پاکێتی و تەقواداریەکەی، بەڵکو چاکەو ئەوەی کەلەئەهلی بەهەشت بێت، بگرە لەئیمانیشیدا، تەنانەت لەئیمانداریش دەری دەکەن، ئەم دوو دەستەیە هەردووکیان کارەکەیان خراپەو، خەواریجەکان و رافزیەکان و ئارەزوو ویستانی جگە لەوانیش ئەمەیان لەناخدا بۆ دروست بووە)) [1]، ئیبن تەیمیە ئەم بنەمایەی لەسەر هەڵوێستی سەعد لەشەوی سەقیفەدا جێبەجێ کردو، دەڵێت: ((گومانی تێدا نیە کەکۆدەنگی بەهادار لەپێشەوایەتی بەهۆی دواکەوتنی کەسێک یاخود دوان یان چەند کەسێکی کەم زیانی پێناگات، ئەگەر ئەوە بەهادار بوایە ئەوا نەدەتوانرا کۆدەنگی لەسەر پێشەوایەتی دروست ببێت، چونکە پێشەوایەتی کارێکی دیاریکراوە (دانراوە)، لەوانەیە کەسێک بەهۆی ئارەزوویەکەوە کەئاگاداری نیە دوا بکەوێت، وەک دواکەوتنی سەعد، چونکە ئەو نزیک بوو لەوەی لەلایەن ئەنصاریەکانەوە بکرێت بەفەرمانڕەوا، بەڵام ئەوە ڕووینەدا، ئەوەش لەدەروونیدا وەک ئارەزوو مایەوە، هەرکەسیش واز لەشتێک بهێنێت لەبەر ئارەزوو ئەوا وازهێنانەکەی کاریگەری نابێت)) [2]، کاتێک ئیبن تەیمیە قسەی لەبارەی بەشدارانی (صفین) دەکات دەڵێت ((گوناهکارو خراپەکارو کەمتەرخەم لەجیهادیان بەهۆی جۆرێک لەئارەزووەوە تێدا بوو))، دواتر هەموو قسەکانی لەوبارەیوە دەخەینە ڕوو.

---

[1] ـ منهاج السنة ٥٤٣/٤-٥٤٤.

[2] ـ منهاج السنة ٣٣٥/٨.

## ڕێسای شەشەم
## دانانان بەسەنگینی میراتی نەفامیدا
## (الاقرار بثقل الموروث الجاهلى)

خوای گەورە محەمەد (صلى الله عليه وسلم) لەکۆمەڵگایەکی نەفامیدا ڕەوانە کرد خەسڵەتی جیاوازی هەبوو، لەوانە:

-بەرز ڕاگرتنی بەهای خوێن وڕەچەڵەک و، مانەوەی پێگەی کۆمەڵایەتی دوور لەپێوەرە بابەتیەکانی توانای کەسیی یان بەهای ڕەوشتیی، عەمری کوڕی کەلسوم لەموعەلەقەکەیدا گوزارشتی لەمە کردووەو دەڵێت:

**اذا بلغ الفطام لنا صبى**
**يخر له الجابرة ساجدينا**[1]

-سوارچاکی وگیانی سەربازی، عەرەبی ئەو کاتە سەرسامبوو بەسوارچاکی وشمشێر وەشاندن و، شارەزای جەنگ و زۆرانبازی بوو، ئەگەر دوژمنێک هەبوایە لەدژی دەجەنگان، ئەگەر نەبووایە لەنێو خۆدا دوژمنایەتی دروست دەکردو لەدژیان دەجەنگان، وەک یەکێکیان ئاوا باسی دەکات:

**وأحيانا على بكر أخينا**
**اذا ما لم نجد الا أخانا**[2]

-نەمانی پێودانگە ڕەوشتیەکان، جگە لەهەندێک ڕێسای پەیوەندار بەپاراستنی شەرەف وناموس، ئەمەش بووە هۆی

---

[1] ـ خزانة الادب ٤٢٣/١.
[2] ـ ديوان الحماسة ١٣٠/١.

ئەوەی لۆژیکی شمشێرو یاسای دارستان سەروەر بێت، عەمری کوڕی کەلسوم سەبارەت بەم ڕێسایەی نەفامی دەڵێت:

**ونشرب ان وردنا الماء صفوا**

**ويشرب غيرنا كدرا وطينا**

ئیسلام هات و واتایەکی نوێی بەخشی بەهاریکاری کۆمەڵایەتی، کەلەسەر بنەمای بیروباوەڕو هزر بێت، ئەوانە شوێنی پەیوەندی خوێن و ڕەچەڵەک بگرنەوە، سپاردەپارێزی و هێزی کردە پێوەری لێوەشاوەیی سیاسی لەبری مێراتگری و پێگەی کۆمەڵایەتی و، ئەو گیانە سەربازییەی ڕووەو جیهاد لەپێناوی خوادا ئاراستە کرد، لەجێی ئەوەی لەململانێی ناوخۆیدا بێت، پێودانگی ڕەوشتی وای بەخشییە مرۆڤەکان کەلەزیادەڕەویە خودی و هۆزایەتیەکان پاکیان بکاتەوە و، یەکسانی لەنێوان خەڵکیدا بڕیاردا، بەمجۆرە ئیسلام هۆزی گۆڕی بۆ ئومەت، یاخیگەری گۆڕی بۆ جیهاد، چینایەتی بۆ یەکسانی و، میراتگری بۆ لێوەشاوەیی.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو میراتیەی نەفامی قورس بوو، موسڵمانانی پێشین لەدەربازبوون لێی و، داماڵران لەپێوەرە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی بەشێوەیەکی تەواو لەیەک ئاستدا نەبوون، هەروەک لەهەندێک ڕووداوی سەردەمی پێغەمبەردا دەبینرێت، لەوانە: ئەو ڕووداوەی لەکاتی گەڕانەوە لەغەزای (مریسیع) لەنێوان دوو دەستە لەباوەڕدارانـدا ڕوویدا، تاپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ی ناچار کرد بگاتە ئەوەی پێیان بفەرمووێت: ((ما بال دعوى الجاهلية؟!))[1]، واتە: چیتان داوە لەبانگەشەی نەفامی؟!، هەروەها

---

[1] ــ مسلم ١٩٩٨/٤، ابن حبان ٥٤٤/١٤، النسائي ٢٧١/٥، الترمذي ٤١٧/٥، احمد ٣٨٥/٣، عبدالرزاق ٤٦٨/٩، ابويعلي ٣٥٦/٣.

ئەوەی لەئەبو زەڕ (حوا لێی ڕازی بێت) ڕوویدا  تاپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: ((انک امرؤ فيک جاهلية)) [1]، واتە: تۆ پیاوێکیت هێشتا نەفامیت تێدا ماوە.

ئەوەی لێرەدا لەمیراتی سەردەمی نەفامی مەبەستمانە رووکاری بیروباوەڕی بتپەرستی نیە، چونکە بەهاتنی ئیسلام خوای گەورە دوورگەی عەرەبی لێ پاک کردەوە، بەڵکو مەبەستمان پێوەرە سیاسی و کۆمەلایەتیەکانیەتی، کەئەوەش ئەو مانایەیە کەبوخاری لەدانانی ناونیشانی ئەم دوو فەرموودەیەدا دایناوەو، وتوویەتی: ((باب المعاصى من أمر الجاهلية، ولايكفر بها صاحبها الا بالشرك)) [2] واتە: دەروازەی گوناهەکانی نەفامی، لێرەدا مەبەست لەنەفامی ئەو گوناهانەیە کەلەنێو عەرەبدا لەسەردەمی نەفامیدا بەناوبانگ بووەو خاوەنەکەی پێ بێباوەڕ نابێت مەگەر هاوبەش بڕیار بدات، بەتایبەتی لەبواری ستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتیداو، پاشان بەدرێژایی سەردەمەکان لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامیدا پاشماوەی ئەو ئاکارانەی نەفامی ماوەتەوە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قورسایی ئەم شێوە میراتیەی نەفامی ڕوون کردۆتەوە، کاتێ کەباسی ئومەتەکەی دەکات کەناتوانێت لەهەندێکی ڕزگاری ببێت و، دەفەرمووێت: ((أربع فى أمتى من أمر الجاهلية لايتركوهن: الفخر فى الاحساب، والطعن فى الانساب... تا کۆتایی فەرموودەکە)) [3]، واتەچوار کاری نەفامی لەنێو

---

[1] ــ البخاري٥/٢٢٤٨، مسلم ٣/ ١٢٨٢، ابوداود ٤/ ٣٤٠، البيهقي ٧/٨، عبدالرزاق ٤٤٧/٩.

[2] ـ البخاري ٢٠/١.

[3] ــ مسلم ٦٤٤/٢، الحاكم ٥٣٩/١/ ابن حبان ٤١٢/٧، احمد ٢٩١/٢، البيهقي ٦٣/٤، عبدالرزاق ٥٥٩/٣ بەدەربڕینی جیاواز و، دەربڕینەکەی ئێرە لەموسلیمەوەیە.

ئومەتەکەمدا ماوەتەوەو ناتوانێت وازیان لێ بهێنێت: شانازیکردن بەڕەچەڵەکەوەو، تانەدان لەنەسەب ...

هیچ سەیر نیە لەسەرەتاکانی کۆمەڵگای ئیسلامیدا پاشماوەی سەردەمی نەفامی بمێنێت و، خەڵکی وەک یەک لەپێوەرە کۆمەلایەتی وسیاسیەکانی رزگاریان نەبێت، لەکاتیکدا لەنێو موسڵماناندا کەسانێکی پێشین هەبن کەلەڕۆژانی پڕ نەهامەتیدا موسڵمان بووبن و باوەڕیان هێنا بێت و چاویان لەپاداشتی خوا بێت و، کاتێکی زۆریان بەیاوەری پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) بەسەر بردبێت ودەروونیان پاک بوبێتەوە و، موسڵمانیش هەبووە درەنگ ئیمانی هێناوەو لەنێو ئەو فەوجانەدا موسڵمان بووە کەپاش فەتحی مەکە دەهاتنە ناو ئیسلامەوە، هەیانبوو لەو عەرەبە دەشتەکیانە بوون کە بۆ پاکبوونەوەو تەزکیەی دەروونی ماوەیەکی پێویست لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) نەژیا، پێشەوا بوخاری ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە کەموسڵمانبوونی زۆرێک لەعەرەبە دەشتەکیەکان خۆبەدەستەوە دانێکی سەربازی بووە، نەک موسڵمانبوونێکی بیروباوەڕی و، لەمبارەیەوە دەڵێت: ((باب اذا لم یکن الاسلام علی حقیقته، وکان علی الاستسلام أو الخوف من القتل، لقوله تعالی: ((قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا))، فاذا کان علی الحقیقة، فهو علی قوله جل ذکره: ((إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ)) [١]، بەهەرحاڵ ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەئەو عەرەبە دەشتەکیانە دووڕوبوون، بەڵکو هەندێکیان بڕواداریەکەیان تەواو بوو پاکبوونەوە، هەندێکیشیان پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) هەڵگەڕانەوەو بێباوەڕ بوون، بەڵکو مەبەست

---

[1] ـ صحیح البخاري ١٨/١.

ئـەوەیـە کـەپێـوەرەکـانی ڕێکخـستنی کۆمـەڵایـەتـی و سیاسـی لای زۆرێکیان و هەندێک لـەوانـەی پاش فـەتحـی مـەککە موسڵمانبوون بـەنـاڕوونی مابوویـەوە –تـەنانـەت هـەنـدێک لـەوانـەی پێـشتریش موسـڵمان بووبـوون– هێـشتا کاریگـەری نـەفامیـان لـەسـەر بـوو، ئەوەش یەکێک بوو لەهۆکارەکانی ئاشوبە سیاسی وسەربازیەکانی دواتری نێوان موسڵمانان.

نمونەی ئەمەش ئـەوەی عبدالرزاق بۆمـانی گێڕاوەتـەوە: ((کـاتێ بەیعەت درا بەئەبوبـەکر (خـوا لێـی ڕازی بێت)، ئـەبوسـوفیان هـات بۆلای عەلـی و، وتـی: لـەم کـارەدا بێدەسـەڵاتترین مـاڵی قـوڕەیشی بەسەرتانا زاڵ بوو، سـوێند بـەخـوا پـڕی دەکـەم لـەئـەسـپ وسـوار، دەڵێت: وتم: هەتـا ئێستاش دوژمنـی ئیسلام و موسڵمانانیت، ئـەوە هـیچ زیـانێکی نابێـت بـۆ ئیـسلام و خـەڵکـەکـەی، ئێمـە وامـانبینی کەئەبوبەکر شیاوە بۆ ئەو کارە)) [1].

وادیارە ئەم قسانەی نێوان عەلی وئەبوسـوفیان –ئـەگـەر ڕاسـت بێت– ماوەی زیاتر لەشـەش مانگ پاش بەیعەتدان بەئەبوبەکر بووە بـۆ جێنـشینی، ئـەگـەرنـا عـەلـی لـەسـەرەتـاوە نـاڕازی بـوو لـەسـەر بەیعەتدان بـەئـەبوبـەکر، ئـەگـەرچـی ئـەمـەی عـەلـی لـەڕوانگـەیـەکی جیاواز لەوەی ئەبوسوفیان بوو.

بەهەمانشێوە ئەوەی حاکم گێڕاویەتیەوە: ((لـەمحـەمـەدی کـوڕی عبدالله کوڕی ئەبوبەکر لـەباوکیـەوە دەگێڕێتـەوە کـەخالیـدی کـوڕی سەعید کاتێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کردیـە والـی یـەمـەن، پاش وەفاتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەڕایەوە بۆ مـەدینـە، دوو مانگ چاوەڕوانـی کـردو بـەیعـەتـی نـەدایـە ئـەبوبـەکرو وتـی:

---

[1] ـ مصنف عبدالرزاق ٥٤١/٥.

((پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم)فەرمانی پێکردووم ولای نەداوم تا خوای گەورە گیانی کێشا))، بەعەلی کوڕی ئەبوتاڵیب و عوسمانی کوڕی عەفان گەیشت و، وتی: ((ئەی نەوەی عبدالمناف کەسێکتان خستە پێش خۆتان لەم کارەدا کەلەپاش ئێوەوە دەهات)) عومەر قسەکەی گەیاند بەئەبوبەکر، ئەبوبەکر گوێی پێنەدا، بەڵام عومەر لەدڵی گرت، کاتێ ئەبوبەکر سوپای نارد بۆ شام، یەکەم کەس کەسەرکردایەتی یەک لەسەر چواری سوپاکەی پێسپێردرا خالیدی کوڕی سەعید بوو، عومەر ناڕازی بوو وتی: ((ئایا کاری پێدەسپێریت لەکاتیکدا ئاواو ئاوای کردو، ئەوەو ئەوەی وت؟)) هێشتا ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمانی پێدەدا تائەو کاتەی لایداو، فەرمانی کرد بەیەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان)) [1].

ئیبن تەیمیە هەندێک لەڕووداوە سیاسیەکانی ئەو سەردەمەی بۆ بۆماوەی سیاسی سەردەمی نەفامی وچڕی پێوەرە کۆمەڵایەتییە نەریتیەکان دەگێڕێتەوە، لەوانە:

**یەکەم:** ناڕەزایەتی هەندێک لەگەورەکانی بەنی عبدالمناف-وەک ئەبوسوفیان وخالید کوڕی سەعید –لەسەر بەیعەتدان بەئەبوبەکر- هەروەک بینیمان- چونکە ئەبوبەکر لەبەنی تەمیم بوو، نەک بەنی عبدالمناف کە لەسەردەمی نەفامیدا بنەماڵەی سەرداروسەرکردایەتی بوون لەقورەیشدا، ئیبن تەیمیە دەڵێت: ((هیچ عاقڵێک دوودڵ نیە لەوەی کەعەرەب –قورەیشی وجگە لەقورەیش- قەرزاری بەنی عبدالمنافن و، مەزنتر لەبەنی تەمیم و بەنی عدی سەیریان دەکەن... هەر لەبەر ئەوەش بوو ئەیو سوفیان

[1] ـ الحاکم: المستدرک ٢٧٩/٣، دەڵێت: لەسەر مەرجی مسلم –صحیح-و دەریان نەهێناوە، ابن عبدالبر: الاستیعاب ٩٧٥/٨.

هات بۆلای عەلی و وتی: ئایا ڕازی بوون ئەم کارە بدرێتە بەنی تەمیم، عەلی وتی: ئەی ئەبو سوفیان کاری ئیسلام وەک سەردەمی نەفامی نیە، یاخود بەوجۆرەی کەوتی)) [1]، پاشان شێخی ئیسلام ئەوە بەمجۆرە لێکدەداتەوەو دەڵێت: ((ئەبوسوفیان پاشماوەکانی نەفامی عەرەبی تێدا مابوو، رقی لەوە بوو کەسێک کەلەهۆزەکەی نەبێت بکرێتە فەرمانڕەوای خەڵکی و، حەزی لەوە بووە کەفەرمانڕەوایەتی تەنها لای بەنی عبدالمناف بێت، بەهەمان شێوە خالیدی کوڕی سەعید کە لەوێ نەبوو، کاتێ هاتەوە قسەی لەگەڵ عوسمان وعەلیدا کردو، وتی: ئایا بەوە ڕازی بوون کەکارەکە لەدەستی بەنی عبدالمناف دەربچێت)) [2].

لێرەدا ئیبن تەیمیە ئاماژە بەهەردوو بەسەرهاتی ئەبوسوفیان و خالیدی کوڕی سەعید دەکات کەخستنمانە ڕوو.

**دووەم:** ئەوەی هەندێک لەخەڵکەکە دەریانبڕی بەهۆی سووربوونیانەوە بوو لەسەر ئەوەی خەلافەت لەنێو بنەماڵەی پێغەمبەردا بمێنێتەوە، ئیبن تەیمیە دەڵێت: ((..بەڵکو ئەوکەسەی شوێنەواری نەفامی عەرەبی یاخود فارسی تێدابوو وتی: ماڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەپێشترن بۆ فەرمانڕەوایەتی، بەهۆی ئەوەی عەرەبەکان لەسەردەمی نەفامیدا کەسانی نێو بنەماڵەی دەکردە سەرکردە، بەهەمان شێوە فارسەکانیش کەسانی نێو بنەماڵەیان دەکردە پادشا، لەکەسێکەوە ئەو قسەیە گێڕدراوەتەوە کەئاماژەیە بۆ ئەمە، هەروەک لەئەبوسوفیانەوە گوازراوەتەوەو، خاوەنی ئەم بۆچوونەش هیچ مەبەستی عەلی

---

[1] ـ منهاج السنة ٣٥٩/٤-٣٦٠.

[2] ـ منهاج السنة ١٦٨/٦،.

نەبوو، بەڵکو لای ئەو عەبباس –بەپێی بۆچوونی ئەو–لەپێشتر بوو لەلای لەعەلی و، باوا ڕێکەوتبێت کەعەلی پەسەند کردبێت، فێری ئەوەی کرد کەئیسلام ئیمان وتەقوا دەخاتە پێش ڕەچەڵەکەوە، ویستی حوکمی نەفامی و حوکمی ئیسلامی پیکەوە کۆبکاتەوە، ئەوانەی کەتەنها بەحوکمی ئیسلام حوکمیان دەکرد –کەئەویش پێشخستنی ئیمان وتەقوا بوو– ئەوا هیچکامیان لەوە دوودڵ نەبوون کەئەبوبەکر شیاوە بۆ ئەو کارە)) [١].

**سێیەم:** هەندێک لەوەی گەورەکان لەدەمارگیریانەوە بۆ هۆزەکەیان دەریانبڕیووە، لەسەر حسابی برایەتی ئیمان، وەک ئەوەی سەعدی کوڕی عوبادە (ڕەزای خوای لێبێت) لەرۆژانی ئیفک لەلایەنداری بۆ عبداللە کوڕی ئوبەی سەرگەورەی دووڕووەکان کردی، هەرچەندە ئیبن ئوبەی خراپەکاری بەرانبەر ماڵی پێغەمبەرایەتی ئەنجامدا.

ئیبن تەیمیە دەڵێت: ((وا زانرابوو هەندێک لەئەوس وخەزرەج دووڕوون وەک عبداللە کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول وهاوشێوەکانی، لەگەڵ ئەمەشدا بڕواداران هەندێکجار لایەنداریان دەکردن، وەک لایەنداری سەعدی کوڕی عوبادە بۆ ئیبن ئوبەی لەبەردەم پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)و، بەسەعدی کوڕی مەعازی وت: ((سوێند بەخوا نایکوژیت و، ناشتوانیت بیکوژیت)) [٢].

پاشان ئیبن تەیمیە لێکدانەوەکەی سەبارەت بەکاریگەری بۆماوەی سەردەمی نەفامی گشتگیر تر دەکات، تا هەموو ئەو

---

[1] ـ منهاج السنة ٤٥٦/٦.

[2] ـ منهاج السنة ٢٦٩/٦–٢٧٠، سەبارەت بەقسەکەشی: ((سویند بەخوا نایکوژیت...)) بڕوانە: مسلم ٢١٣٤/٤ و، ابن حبان ١٨/١٠و، البيهقي له (الكبرى) ٤١/١٠و، عبدالرزاق ٤١٦/٥و، احمد ١٩٦/٦و، ابويعلي ٣٢٩/٨و ٣٤٤و الطبراني له (الكبير) ٥٤/٢٣.

قورەیشی و ئەنصاریانە بگرێتەوە کەبەبەیعەتدان بەئەبوبەکر ڕازی نەبوون و، دەڵێت: ((بەگشتی هەموو ئەو ئەنصاریانەو ئەوانەی بەنی عبدالمناف کەلێیانەوە گوێزراوەتەوە کەداوایان دەکرد جگە لەئەبوبەکر بکرێتە خەلیفە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی ئاینیان باس نەکردووە، باسی ئەوەش نەکراوە کەجگە لەئەبوبەکر لەپێشترو باشترە لەئەبوبەکر، بەڵکو ئەو قسانە بەهۆی خۆشەویستی هۆزو قەومەکەیەوەو، ئەو ویستەی کەپێشەوایەتی لەهۆزەکەی بێت بوو. ئاشکرایە کەئەمە بەهیچ شێوەیەک نابێتە بەڵگەی شەرعی ورێگای ئاینیی و، لەوەش نیە کەخوای گەورەو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان بەباوەڕداران کردووە کەپەیڕەوی بکەن، بەڵکو ئەوە خواستێکی سەردەمی نەفامیەو، جۆرێکە لەدەمارگیری بۆ ڕەچەڵەک وهۆز، ئەمەش لەو شتانەیە کەخوای گەورە محەمەد (صلی الله علیە وسلم)ی نارد تا وازی لێ بهێنرێت وپوچەڵ بکرێتەوە)) [1].

لەڕاستیدا نەریتە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکان کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لەسەر هەڵگیرسانی ئاشوبە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت)، لەبەر ئەوە سەیر نابێت کەمعاویە یەکەم کەس بێت کەخەلافەتی گۆڕی بۆ پاشایەتی، لەبەر ئەوەی بەشێکی تەمەنی لەماڵی سەرگەورەی قورەیشدا بەسەر بردووەو، بەشی دووەمیشی لەسەر سنووری دەوڵەتی ڕۆم.

---

[1] ـ منهاج السنة ٥٢٠/١.

## ڕێسای حەوتەم
## کۆبوونەوەی دەستپاکی و هێز لەخەڵکدا کەمە
## (اجتماع الامانة والقوة فی الناس قليل)

ئیسلام دەستپاکی وهێزی کردۆتە دوو پێوەر بۆ لێهاتوویی سیاسی، دەستپاکی سیفەتە ڕەوشتیەکان دەگرێتەوە کەویستەکانی فەرمانڕەوا کپ دەکات و، لەناخیدا دەبێتە ڕێگر لەوەی یاری بەدەسەڵات وسامان بکات، یان بۆ کەسە نزیکەکانی بقۆزێتەوە، یاخود خراپ بەکاری بهێنێت، ئیدی هەرجۆرە خراپ بەکارهێنانێک بێت، بەڵام هێز ئەوا ئەزموونی سیاسی وسەربازی و هونەری دەگرێتەوە کەبەهۆیانەوە دەتوانێت ئەرکەکەی بەجوانترین و باشترین شێوە بۆ ئومەتەکەی جێبەجێ بکات و، ئەم دەستپاکی وهێزە لەچەندین هاوەڵی بەتواناداا کۆبووبوونەوە، لەوانە ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتاب، لەوبارەیەوە ((وترا: ئەی پێغەمبەری خوا، پاش تۆ کێ بکەینە فەرمانڕەوامان؟ فەرمووی: ئەگەر ئەبوبەکر بکەن دەبینن دونیا نەویستە، ڕۆژی دوایی لا مەبەستە، خۆ ئەگەر عومەر بکەن ئەوا دەبینن بەهێزو دەستپاکە لەپێناوی خوادا لۆمەی لۆمەکاران ناترسێت، ئەگەر هاتوو عەلیتان کردە فەمانڕەوا –کەوا نابینم ئەو بکەن- دەبینن هێمن و ڕێنمایکارەو بەرەو شارێگەی ڕاستتان دەبات)) [1]، لەوانەش عتاب

[1] ـ الحاكم ٧٣/٣ ووتویەتی: سەنەدی صەحیحەو دەریان نەهێناوە، المقديسي: الاحاديث المختارة ٨٦/٢ ولێکۆڵەرەکەی کەعبدالملك کوڕی دهیشە دەڵێت: (سەنەدەکەی صەحیحە)، و بزار ٣٣/٣و هەیسەمی دەڵێت: (پیاوەکانی بزاز متمانە

کوڕی ئەسیدی ئومەوی کەفەرموودەی لەئەنەسەوە لەبارەوە هاتووە: ((کەپێغەمبەر(صلی اللە علسە وسلم) عتاب کردە فەرمانڕەوای مەککە، زۆر توند بوو بەرانبەر گومانلێکراون و نەرم بوو لەگەڵ باوەڕداران)) [1].

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەبو عوبەیدە عامری کوڕی جەراح (خوا لێی ڕازی بێت) ناونابوو ((ئەمینی ئەم ئومەتە)) [2].

بەڵام دەستپاکی وهێز بەکەمی لەیەک کەسدا کۆ دەبنەوە، خۆ ئەگەر کۆ ببنەوە ئەوا زۆر بەکەمی بەهاوسەنگی دەبێت و، هاوەڵانیش لەوەدا لەخەڵکی دیکە جیاواز نەبوون، ئیبن تەیمیە دەڵێت: ((کۆبوونەوەی دەستپاکی و هێز لەخەڵکدا کەمە، لەبەر ئەمەش بوو عومەری کوڕی خەتاب دەیوت: ((خودایا سکاڵای شەلاق لێدانی فاجر و کەمی متمانە بۆ لای تۆ بەرز دەکەمەوە))... بەهۆی ئەمەوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خالیدی کوڕی وەلیدی بۆ جەنگ بەکاردەهێنا لەوکاتەوەی کەموسڵمان بوبوو، لەگەڵ ئەوەی کەهەندێکجار پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو کارانەی ڕەت دەکردەوە کەئەنجامی دەدا، تەنانەت جارێکیان دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوەوفەرمووی: ((اللهم انی أبرأ الیک مما صنع خالد) واتە: خوایە من بێبەریم لەوەی خالید ئەنجامی داوە...ئەبو زەڕ لەو باشتر بوو لەدەستپاکی و ڕاستگۆییدا، لەگەڵ ئەمەشدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: ((یا أباذر

---

پێکراون) مجمع الزوائد ١٧٦/٥، واحمد ١٠٨/١و ئیبن حەجەر لەبارەی فەرموودەکەی ئەحمەدەوە وتوویەتی: (سەنەدەکەی باشە) الاصابة ٥٠٣/٢.

[1] ـالاصابة ٤/ ٤٣٠.

[2] ـ البخاري ٤/ ١٥٩٢ومسلم ١٨٨١/٤ والحاكم ٣٠٠/٣ والترمذي ٦٦٥/٥ والبيهقي ١٧/٢ والنسائي ٥٧/٥ وابن ماجة ٤٩/١ و جگە لەوانیش....

أراک ضعيفا ... لاتأمرن على أثنين، ولا تولين مال اليتيم)) [1]، واتە: ئەی ئەبو زەڕ وايدەبينم کەلاوازيت، ناکرێيتە فەرمانڕەوای دوو کەس، سەرپەرشتی ماڵی هەتيويشت پێنادرێت.

لەم دەقە شيکارييەدا ئيبن تەيميە دوو نمونە دەهێنێت لەسەر نەبوونی هاوسەنگی لەنێوان دووان لەگەورە هاوەڵان: نمونەی يەکەم بريتييە لەخاليدی کوڕی وەليد (خوا لێی ڕازی بێت) کەخەسڵەتی هێز بەسەريدا زاڵ بوو، لەمەشدا زەهەبی بەباشی وەسفی کردووە کەئەو((شمشێری خوداو، شۆڕەسواری ئيسلام و، بێچوە شێری روبەڕوبونەوەکان بوو)) [2]، بەڵام زاڵبوونی هێزەکەی بەسەر سپاردەپارێزيەکەيدا وايکرد پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێزاری دەرببڕێت بەرانبەر کوشتنی کەسانێک کەموسڵمانبوونی خۆيان ڕاگەياندبوو، خۆی لەو کارەی بێبەری کرد، هەرئەوەش وايکرد عومەر بێزاری دەرببڕێت لەوەی مالکی کوڕی نويرەی کوشت، پاش ئەوە هەستا بەلادانی.

ئيبن تەيميە ئەم کارەی خاليد وا لێک دەداتەوە کە: ((خاليد رکەبەرايەتی لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ی نەدەکرد، بەڵکو گوێڕايەڵی بوو، بەڵام لەفيقهو ئايندا نەگەشتبووە پلەی ئەوانی تر، لەبەر ئەوە حوکمی ئەو بابەتەی نەدەزانی و، دەوترێت

---

[1] ـ ابن تيمية: السياسة الشرعية ١٦-١٧، لەبارەی فەرموودەکەش: ((اللهم انی أبرأ اليک...) بڕوانە البخاري ١٥٧٧/٤و ٢٦٢٨/٦و صحيح ابن حبان ٥٣/١١و البيهقي: السنن الکبری ١١٥/٩و النسائي: السنن الکبری ٤٧٤/٣و عبدالرزاق: المصنف ١٧٤/١٠، بەڵام فەرموودەی: ((يا أبا ذر...)) رواه مسلم ١٤٥٧/٣و البيهقي فی الکبری ١٢٩/٣ وفی شعب الايمان ٤٥/٦ والنسائي له (الکبری) ١١٢/٤ وفی المجتبی ٢٥٥/٦ والبزاز ٩/ ٤٣٥.

[2] ـ سير أعلام النبلاء ٣٩٦/١.

دوژمنایـەتیـەک لـەنێـوان ئـەم و ئـەوانـدا هـەبـووە لـەسـەردەمـی نەفامیداو، ئەوەش وایکرد لەدژیان بجەنگێت)) [١].

نمونـەی دووەمـیش بریتییـە لـەئـەبـوزەڕ (خـوا لێـی ڕازی بێـت)، کـەپێشـەوا بـوو لـەدونیـا نـەویـستی و خۆپـارێزی و راسـتگۆیی و پاکێتیدا، بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) رازی نـەبـوو بیکاتـە فـەرمـانڕەواو، ئـەمـەشـی بـۆ لاوازی ئـەبـوزەڕ گێڕایـەوە کـەیـەکێک لـەپێکهێنـەرەکـانی لێهـاتوویی سیاسـی تێـدا نـەبـوو بـەچاوپۆشـی لەخۆپارێزیە کەسییەکەی.

ئیبن تەیمیە لەسەر نەبوونی هاوسەنگی لەنێوان سپاردەپارێزی و هێزدا نمونەیەکی تر دەهێنێتـەوە، ئـەویش خـاوەنـی دوو نـورەکـە ئـەمیـری بـاوەڕداران عوسـمانی کـوڕی عـەفانـە (خـوا لێـی ڕازی بێت)کەسپاردەپارێزیەکەی زاڵبوو بەسـەر هێزیداو ئـەمـەش وایکـرد هەندێک لەکەسانی چاوچنۆک هەست بەو لاوازیـە بکـەن و((ویـستی دونیایی هەندێک کەس سەریهەڵداو، ترسیان لـەخـوداو، پاشـان لـەو و، لەلاوازی ئەو کەمی کردو، ئەوەشی ڕوویدا لـەخزمـانی لـەوالێتـی و سامان وایکرد ئاشوب بەرپا ببێت تابگاتە ئەوەی بەستەملێکراوی بکوژرێـت)) [٢]، دواتـر بـەویـستی خـوا هـەمـوو شـیکاریەکـەی بـۆ هۆکارەکانی کوژرانی عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت) دەخەینە ڕوو.

ئـەوەی گوزارشـت لـەقوڵی فیقهـی سیاسـی ئیبن تـەیمیـە دەکـات هـەسـتکردنیەتـی بـەو سـووربونەی خـەلیفـەکـانی ڕاشـیدین لـەسـەر پـەیـڕەوکردنـی تـەواوی لـەفـەرمـانڕەوایـی پێـسپاردن و لادان لـەفـەرمـانڕەوایـەتـی، مـەبـەسـتیش لـەتـەواوی لێـرەدا ئـەوەیـە

[1] ـ منهاج السنة ٤٨٧/٤.
[2] ـ منهاج السنة ٤٥٢/٧.

کەفەرمانڕەوا ڕاستگۆ بێت لەگەڵ خوداو لەگەڵ ئومەتدا، لایەنی هێزو لاوازی بزانێت و، لەنیو هاونیشتمانیانیدا بگەڕێت بۆ کەسێک کەئەو ناتەواویەی پڕ بکاتەوەو، کەمتەرخەمیەکانی ئەو نەهێڵێت، تەنانەت ئەگەر ئەو فەرمانڕەوایە لەکەسانی سپاردەپارێزو هێز بێت، چونکە هاوسەنگی رەها تەواومەندی ڕەهایە، ئەوەش لەمرۆڤدا نایەتە دی.

ئیبن تەیمیە شرۆڤەی ئەوە لەشیکاریدا بۆ دانانی خالید لەلایەن ئەبوبەکرو دانانی ئەبوعوبەیدە لەلایەن عومەرەوە دەکات و، دەڵێت: ((لەبەر خوا عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێت) زۆر توند بوو بەوهۆیەوە ئەبوعوبەیدەی کردە والی چونکە نەرم بوو، بەڵام ئەبوبەکر خۆی نەرم بوو خالیدیش بەرانبەر بێباوەڕان توند بوو، لەبەر ئەوە ئەوەیان کەخۆی نەرم ونیان بوو کەسێکی توندی کردە والی، ئەوەشیان کەخۆی توند بوو کەسێکی نەرم ونیانی کردە والی، هەردووکیشیان ئەو کارەی ئەنجامدا کەبۆ مافەکەی لای خوا خۆشەویستە)) [1].

ئەوقسەیەشی لەبارەی عومەر وتی: ((عومەری کوڕی خەتاب کەسانی فاجبری بەکاردەهێنا بەهۆی لەپێشبوونی بەرژەوەندی لەکارەکەیدا، پاشان بەهێزی خۆی فجورەکەی لادەبردو راستی دەکردەوە)) [2].

ئەم روانگەی تەواومەندیە بووە پاڵنەر کەئەبوبەکری صدیق لەکاتی هەڵگەڕانەوەی عەرەبەکان و یەکبوونیان بۆ دژایەتی ئیسلام پشت بەخالید ببەستێت، هەرچەندە ئەبوبەکر ڕەخنەی لەخالید

---

[1] ـ الفتاوى ٤/٤٥٥.

[2] ـالاصابة ٤/ ٤٣٠.

هەبوو بەتایبەت لەشمشێرە (ماندوکارەکەی)و، چۆنیەتی هەڵس وکەوتی لەسامانداو، لەسەرپێچیکردنی خەلیفەدا.

ئیبن حەجەر دەڵێت: ((خالید ئەگەر سامانی بکەوتایەتە دەست ئەوا بەسەر خاوەن دەستکەوتەکاندا دابەشی دەکردو، هیچ حساباتێکی بۆ ئەبوبەکر بەرز نەدەکردەوەو، خۆخستنە پێشی تێدا بوو بەسەر ئەبوبەکرداو هەندێک کاری دەکرد کەئەبوبەکر نەیدەبینی)) [1]، بەڵام ئازایی و ئەزموونی لەجەنگدا بەو شێوەیە نەبوو ڕێگە بەئەبوبەکر بدەن لاییدات لەکاتێکدا کەڕوبەڕووی نەهامەتی هەڵگەڕانەوە بووبوویەوە، ئەمەش بەهۆی بەئاگاییەوە بوو لەپێشخستنی پێودانگە سەربازییەکان بەسەر شتی تردا لەو ڕۆژەدا، لەبەر ئەوە ((کاتێ عومەر ئاماژەی کرد لاییدات، ئەبوبەکر وتی: کێ قەرەبووی پاداشتی خالید دەداتەوە لای من)) [2]، دەگێڕنەوە کەجارێک لەکاتیکدا عومەر ناڕازی بووە لەسەر ڕەفتاری خالید ئەبوبەکر وتوویەتی: ((سوێند بەخوا شمشێرێک ناخەمەوە کێلان کەخوا گەورە بۆ سەر دوژمنەکەی هەڵکێشاوە)) [3].

ئاگاداربوون لەکۆنەبوونەوەی سپاردەپارێزی وهێز لەزۆربەی مرۆڤەکانداو، هاوسەنگ نەبوونیان لەو کەسانەشدا کەتییاندا کۆبوەتەوە، وامان لێدەکات کەرێژەییبوونی بابەتی لەلێکۆڵینەوەی ئەو قۆناغە مێژووییەو کەسەکانیدا بەکاربهێنین، تا بەویژدانەوە هەڵسەنگاندنیان بۆ بکەین و، بەرانبەر بنەماکانیش بەویژدان بین

---

[1] ـالاصابة ٤/ ٤٣٠.

[2] ـ هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

[3] ـ ابن ابی شیبة ٦/ ٥٤٧و ابن سعد: الطبقات ٣٩٦/٧و الذهبي: سير أعلام النبلاء ٣٧٢/١وشێخ شعیب ئەرنائۆتی لێکۆڵەری کتێبە وتویەتی: ((پیاوەکانی متمانەپێکراون بەڵام مورسەلە)).

وپیرۆز ڕایبگرین، هەرکەس لەوانەیە لەڕوویەکەوە شایستەی ستایش بێت و لەڕوویەکی ترەوە جێگای ڕەخنەلێگرتن بێت، هەرچەندە ئەو کەسە مەزنێک بێت لەمەزنەکان، خۆ ئەگەر لێکۆڵەرێک سەبارەت بەبابەتێک بنوسێت کەلەبواری ((هێز))دا بێت، وەک ئەزموونی سەربازی یان بلیمەتی کارگێڕی یان لێوەشاوەیی سیاسی، ئەوا دەبینێت کەلای کەسانیکی وەک عەمری کوڕی عاص و معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان دەست دەکەوێت کەبەبێ دوودڵی شایستەی ئاماژەپێدان وستایشکردن بێت، بەڵکو دەبینێت کەلەلوتکەی ئەو سەرکردە سیاسیی و سەربازیی و کارگێڕیانەدان کەمێژوویی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە بینیوون، بەڵام هەمان لێکۆڵەر ئەگەر سەبارەت بەو بابەتانەی نووسی کەلەچوارچێوەی سپاردەپارێزیدان وەک شەرعیەتی سیاسی، یاخود دادپەروەری لەدابەشکردن وفەرمانڕەوایدا، یان دونیا نەویستی وبەڕێوەبردنی گشتی و، خۆنەویستی یان بەفیڕۆنەدان... ئەوا دەبینێت هەمان ئەو کەسانەی ناومان هێنان شتی وایان تێدایە کەجێگای ڕەخنەلێگرتن بێت نەک خۆ پێوەوە هەڵکێشان، گوێ ڕاگرە لەزەهەبی کاتێ قسە لەبارەی موعاویەوە دەکات: ((وتم: چی ئەڵێیت بەرانبەر کەسێک کەعومەر پاشان عوسمانیش دەیکاتە فەرمانڕەوای هەرێمێک، رێکی دەخات و بەباشترین شێوە بەڕێوەی دەبات، خەڵکیش لەڕێزو ئارامگرییەکەی ڕازی بوون، با هەندێکیان جارێکیش نارەحەتیان بەدەستی بینیبێت...با هەندێکی تر لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زۆر لەم باشترو چاکترو گونجاوتر بن، ئەم پیاوە بەلێوەشاوەیی و لێزانی تەواومەندی عەقڵی و، زۆر ئارامگریی و، سنگفراوانیی و، هێزی لێزانی و بۆچوونیەوە جیهانی

بەڕێوە برد، لەگەڵ ئەوەدا کاری خراپیشی هەبووە، لێپرسینەوەیان لای خوای گەورەیە)) [١].

لەشوێنێکی تردا دەڵێت: ((معاویە لەباشترینی ئەو پادشایانە بوو کەدادپەروەریان زیاتربوو لەستەمکاریان، ئەو لەئەنجامدانی کاری خراپ بێبەری نیە، کەخوا لێی خۆش دەبێت)) [٢]، ((خۆزگە کارەکەی نەدایەتە دەست یەزیدی کوڕی و، لێگەڕابا ئومەت خۆیان کەسێکیان هەلبژاردایە)) [٣]، بەهەمان شێوە گوێ ڕادێرە بۆ زەهەبیش کەچۆن لەبارەی کەسێتی عەمری کوڕی عاصەوە قسە دەکات: ((فێڵبازی قورەیش وپیاوی جیهان، ئەوکەسەیە کەلەزیرەکی و فێڵبازی و سوربوندا نمونەی پێ بهێنرێتەوە)) [٤]، ((لەنیو پیاوانی قورەیشدا خاوەن زیرەکی و فێڵبازی و سوربوون و لێوەشاوەیی و بەرچاو ڕوونی جەنگ بوو، لەڕێزدارترین پاشایانی عەرەب و، پیاو ماقوڵانی موهاجیر بوو، خوا لێی خۆش دەبێت و لێی دەبورێت، خۆ ئەگەر خوشەویستی بۆ دونیا نەبووایە و، نەچوایەتە کاروبارەکانی ناوبژیوانی لەسەر خەلافەت، ئەوا پێشینەیەکی هەبوو کەمعاویە نەیبوو)) [٥]، ((فەتحی هەرێمی میسری کردو، لەسەردەمی عومەرو بەشێک لەسەردەمی عوسماندا فەرمانڕەوای بوو، پاشان معاویە هەرێمەکەی پێبەخشی و، بەهۆی ئەوەی پشتیوانی کردبوو بۆ ماوەی شەش ساڵ داهاتەکەی پێداو... ماڵ وسامانێکی زۆری دەستکەوت)) [٦].

---

[1] ـ سير أعلام النبلاء ٣/١٣٢-١٣٣.
[2] ـ سير أعلام النبلاء ٣/١٥٩.
[3] ـ سير أعلام النبلاء ٣/١٥٨.
[4] ـ سير أعلام النبلاء ٣/٥٥.
[5] ـ سير أعلام النبلاء ٣/٥٩.
[6] ـ سير أعلام النبلاء ٣/٥٨.

## ڕێسای هەشتەم
## لەبەرچاوگرتنی رادەی سەردەمەکە
## (الاخذ بالنسبية الزمانية)

زۆرێک لەڕووداوەکانی ڕابردوو قەبارەی بچوکتر یاخود گەورەتر لەخۆی دەبێت ئەگەر لەلەگۆشەنیگایەکی دابڕاو لەکات سەیری بکرێت، بەڵام لەبەرچاوگرتنی پێکهێنەری کات لەسەیرکردنی ڕووداوێکی مێژووییدا راستیەکەی دەردەکەوێت، بەدەر لەگەورە کردن یاخود بچوککردن، ئیبن تەیمیە ئەم ڕێسایە لەکتێبە مێژووییەکانیدا جێبەجێ دەکات، لەبەر ئەوە شیکاریەکانی –بەزۆریی- هاوسەنگ و دوور بوون لەزیادەڕەوی وسەرکەشی تێدا نەبووە، لەنمونەکانی جێبەجێکردنی ئەم ڕێسایەش ئەوەی زەهەبی –قوتابی ئیبن تەیمیە- لەباسکردنی یەزید کوڕی معاویەدا دەیگێڕێتەوە: ((ئەو (یەزید) بەهێزو ئازا بوو، خاوەن بۆچوون وبوێری و، زرنگ وزمانپاراو بوو، شیعری باشیشی هەیەو، کەسێکی دەمارگیرو وشکی دڵڕەقی بێ مێشک بووە، مەشروبخۆر بوو، کاری خراپی دەکرد، دەسەڵاتەکەی بەشەهیدبوونی حوسین دەستی پێکردو، بەڕووداوی (الحرة) کۆتایی پێهێنا، خەڵکی زۆر ڕقیان لێی بوو، هەرگیز کەس پیرۆزبایی لێنەکردووە، پاش حوسین چەندین کەس لەدژی ڕاپەڕین، وەک خەڵکی مەدینە کەلەپێناوی خوادا ڕاپەڕین و، وەک مرداسی کوڕی ئەدیەی حەنزەڵی بەصری و، نافعی کوڕی ئەزرەق و، تەوافی کوڕی معلی سدوسی و، ئیبن زوبیر لەمەککە)) [1].

---

[1] ـ سير أعلام النبلاء ٣٧/٤-٣٨.

زەهـەبـی تـەنهـا بـەم ڕادەیـە وازی نـەهێنـاوە، بـەڵکـو رادەی سەردەمێتی بەکارهێناوە تا ئەو ڕووداوانە بخاتـە شـێوەو قـەبارەی خۆیـان و، لـەمبـارەیـەوە دەڵێـت: ((یـەزیـدیش لـەو کـەسـانەیـە کەنەجنێوی پێدەدەیـن ونـەخۆشـمان دەوێت، لـەنێوان خـەلیفـەکانی دوو دەوڵەتەکەدا (ئومەوی و عەباسی) هاوشێوەی هەیە، هـەروەهـا لەنێو پاشایانی ناوچەکانی تردا، بگرە هەیانبووە لـەو خراپتـر بـووە، ئـەوەی کـارەکـەی قـورس کـردووە ئـەوەیـە ئـەو پـاش تیپـەڕبـوونی نەوەدو نۆ ساڵ بەسـەر وەفاتی پێغەمبەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم)دا فـەرمـانڕەوایـی گرتـە دەسـت و، ئـەوەش سـەردەمێکـی نزیـک بـوو، هـاوەڵان لـەژیانـدا بـوون، وەک ئیـبن عومـەر کـەلـە ئـەو و بـاوک و باپیریشی لەپێشتر بوو بۆ ئەوەی ئەو کارەی پێبسپێردرێت)) [١].

سەبارەت بەقسەکەی زەهەبی: ((وەک ئیبن عومـەر کـەلـە ئـەو و بـاوک و باپیریـشی لـەپێـشتر بـوو بـۆ ئـەوەی ئـەو کـارەی پێبـسپێردرێت))، ئـەوە وەڵامێکـی جوانـە لـەوەوە لـەسـەر قسەکـەی معاویـە کـەلـەڕۆژی کۆبوونـەوەی دوو ناوبژیوانـەکـەدا لـەدەومـەت جەبەل کردی: ((هـەرکـەس دەیـەوێت لـەم کـارەدا (کـاری خـەلافـەت) قسە بکات باباسی سەردەمی خۆیمان بۆ بکات، چونکە ئێمـە لـەئـەو و باوکیشی لەپێشترین)) [٢]، لـەگێڕانـەوەکـەی عبدالرزاقدا زیـادەیـەک هـەیـە کـەمعاویـە ئـەو قـسەیـەی (نـاڕەزایـەتـی بـوو بـەرانبـەر ئیـبن عومەر) [٣]، دواتر تەواوی دەقی ئەم قسەیە دەخەینە ڕوو.

زەهەبی بەوەی کەیەزیدی لـەنێوان کاتی دوو دەوڵـەتدا داناوە کـەئومـەوی عـەباسـی دەگرێتـەوە، بگـرە زۆرێـک لـەپادشـا

---

[1] ـ سير أعلام النبلاء ٣٦/٤.

[2] ـ صحيح البخاري ١٥٠٨/٤و مجمع الزوائد ٢٠٨/٤.

[3] ـ مصنف عبدالرزاق ٤٦٥/٥و فتح الباري ٤٠٤/٧.

موسـڵمانەكـانی پـاش یـەزیـد دەگرێتـەوە، ئـەوەمـان فێـر دەكـات لەبەرچاوگرتنی ساتەوەختی كاتی ڕوودان و، دانانی ڕووداوەكان لەشوێنی خۆیدا چەندە گرنگە، بێگومان یەزید لەو پادشا خراپانە بووەو، كاری زۆر خراپی ئەنجامداوە كەزەهەبی باسی كردوون، بەڵام یەزید لەمێژوویی ئومەتدا بەداخەوە هاوشێوەی زۆرە.

دروست نیە بەتێگەیشتنێكی ناچاری (جەبری) لەم ڕێسایە بڕوانین و، بیكەینە ڕێگایەك بۆ بەكەمگرتنی خراپەكاریەكانی یەزید، چونكە پاساو هەڵناگرن، بەڵكو بۆ تێگەیشتنی هەموو ڕووداوێكی مێژوویی لەسیاقی خۆیدا پەنای بۆ دەبەین.

## ڕێسای نۆیەم

## تێكەڵنەكردنی نێوان هەست وڕووداوەكان

## (عدم الخلط بين المشاعر والوقائع)

لەڕاستیدا ناكۆكییە سیاسیەكانی نێوان هاوەڵان هەموو نەوەكانی دواتری موسڵمانانی ناڕەحەت كرد، ئەمەش بەهۆی ئەو پێگەیەوەیە كەهاوەڵان لەدڵی هەموو باوەڕدارێكی ڕسشتگۆدا هەیانەو، لەبەر ئەو لێكەوتانەی بەهۆی ئەو ناكۆكییە ترسناكانەوە دروست بوو بووە هۆی خوێنڕژان و، ئەو شوێنەوارانەشی لەسەر كۆمەڵگای ئیسلامی بەدرێژایی مێژوویی بەجێی هێشتووە لەپەرتەوازەیی سیاسی و سەربازی و، جیابوونەوەی تائیفی و مەزهەبی، گومانی تێدا نیە كەهەر باوەڕدارێكی ڕاستگۆ لەقوڵایی دڵیەوە خۆزگە دەخوازێت كەئەو ڕووداوانە هەر ڕوویان نەدایە، بەڵام خۆزگە شتێكەو، ڕووداوەكان شتێكی تر، ئەم هەستە باشانە هەڵەیەكی مەنهەجی لێكەوتەوە، بووە هۆی ئەوەی زۆركەس لەوانەی لەبارەی ئاشوبەكانی سەدەی یەكەمەوە لێكۆڵینەوەیان

کرد نەیانتوانی ڕاستیەکان لەو هەستەیان جودا بکەنەوە، بەڵکو ئەمیان تێکەڵکرد بەویان، هەربۆیە نووسینەکانیان تێکەڵەیەکی سەیری خودو بابەتی لێدەرچوو، کە ئەو کەسەی بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕێت ناخوازێت ونبووەکەی لەمجۆرە کتێبانەدا بدۆزێتەوە و، لەنووسینەکەیدا گوزارشت لەوە بکات کەئەوانە ئاواتەخواز بوون وا ڕووی بدایە، نەک ئەوەی بەڕاستی ڕوویداوە.

خۆ ئەگەر ئەوانە خۆیان دوور بگرتایە لەقسەکردن لەسەر ئەو ڕووداوانە -وەک ئەوەی هەندێک لەئەهلی عیلم حەزی پێدەکەن- یاخود ڕێگاکەی سیوەیتیان بگرتایەتە بەر لەچاوپۆشی لەباسکردنی هەندێک لەو ڕووداوە ئازاربەخشانە لەپێناوی گونجان لەگەڵ هەستیدا، ئەوا هیچ سەرزەنشتێکیان نەدەکرا، سیوەیتی سەبارەت بەکوژرانی حوسین دەڵێت: ((چیرۆکێکی درێژ سەبارەت بەکوژرانی حوسین هاتووە کەدڵ توانای بەرگە گرتنی باسکردنی نیە)) [1]، خۆ ئەگەر ئەوان مەنهەجی((ئەوەی بوو بوو))یان پەیڕەو بکردایە کەهەندێک لەئەهلی عیلم بۆ خۆ دوورگرتن لەباسکردنی هەندێک ڕووداو گرتیانە بەر ئەوا هیچ نارەحەتی تێدا نەبوو، ئەوەتا پێشەوا مسلم دەگێڕێتەوە: ((لەعەتای کوڕی ئەبو ڕەواح وتی: کاتێ سوپای شام دای بەسەریداو ماڵی خوا (بیت) لەسەردەمی یەزیدی کوڕی معاویەدا سووتا ئەوەی بوو بوو..)) [2]، ئیبن کەسیریش دەربارەی معاویە دەڵێت: ((پاشان ئەوەو ئەوە ڕوویدا لەنێوان ئەو و عەلیدا پاش کوژرانی عوسمان))، ((پاشان ئەوانەی ئەو فەرمانی بەسەردا کردبوون و ئەوانەی ئەمیری باوەڕداران فەرمانی پێکردبوون

---

[1] ـ السيوطي: تاريخ الخلفاء ص١٢٥.

[2] ـ صحيح المسلم ٩٧٠/٢.

ئەوەی بوو بوو))، هەروەها دەڵێت: ((پاشان ئەوەی ڕوویدا لەنێوان هەردوولادا ئەوەی بوو بوو))، ((لەکاری ناوبژیوانیەکەشدا ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا))[١]، ((لەڕۆژانی (صفین)دا ئەوەی بوو بوو))[٢]، ئیبن حەجەریش بەهەمانشێوەی وتووە: ((جەنگەکەیان لەنێوانیاندا هەڵگیرساند تا ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا))[٣]، ((لەڕووداوی (جمل)دا ئەوەی دیار بوو... لەجەنگی (جمل)دا ئەوەی بوو بوو)) (الاصابة ٥٠١/٢– ٥٠٢)، ((ئەوەی ڕوویدا لە(صفین)دا پاش (جمل) ڕوویدا))[٤].

مەنهەجی ((چی بوو بوو)) زۆر کەس دەگرێتەوە، هیچ شەرمێکیشی تیدا نیە کەهەڵە بێت، هەڵە ئەوەیە تا ئەوپەڕی بچیت بەبێ پابەندبوون بەمەنهەجی دادپەروەری و ویژدانەوە.

لەوانەیە ئەو زیادەڕەویەی کەبەهۆی تێکەڵکردنی نێوان هەستەکان و ڕووداوەکان لەشێوەی کەلێنێکی ڕووندا دەرکەوتبێت وەک ئەوەی هەندێک لەموتەکەلمین کەڕەتی دەکەنەوە هەردوو جەنگی (جمل وصفین) هەر ڕوویاندابێت: ((لەهەندێک لەموتەکەلمین دەگێڕنەوە کە ڕوودانی (جمل وصفین)یان ڕەت کردۆتەوە))[٥]، بەڵام بۆی هەیە کەبەشێوەیکی وردترو زانراو لەسەر دەستی زانایانێکی پایەدارتر لەو زانا موتەکەلیمە زۆربلێیانە، لێرەدا چەند نمونەیەکیان دەخەینە ڕوو:

**نمونەی یەکەم:** ڕەتکردنەوەی ئەو ڕاستیانەی کەبەدروسترین پێوەرەکانی سەلماندنی مێژوو لای موسڵمانان سەلمێنراون، وەک

---

1 ـ البداية والنهاية ١٢٦/٨، ١١٩،١٢٩،١١٩ بەپێی ڕێکخستنیان.

2 ـ ابن كثير: جامع المسانيد والسنن ٥٦٨/١١.

3 ـ فتح الباري ٥٦/١٣.

4 ـ تهذيب التهذيب٢٩٤/٧.

5 ـ منهاج السنة ٤٩٢/٤.

نکوڵیکردن لەبەیعەتنەدانی عەلی کوڕی ئەبو تاڵب بەئەبوبەکری صدیق (خوا لێی ڕازی بێت) بۆ ماوەی شەش مانگ، لەمانگەکانی سەرەتای جێنشینیدا و، نکوڵیکردن لەبەیعەتنەدانی سەعد بەئەبوبەکر تا لەژیاندا بووە، هەرچەندە هەردوو ڕووداوەکە ڕاستە، بوخاری بەسەرهاتی سەعدی هێناوەو تێیدا هاتووە: ((عومەر دەستی (ئەبوبەکری) گرت و بەیعەتی پێداو خەڵکەکەش بەیعەتیان پێدا، کەسێک وتی سەعدتان کوشت، عومەر وتی: خوا کوشتی)) [1]، لەگێڕانەوەیەکی ئیبن حەباندا هاتووە: ((ونزونا علی سەعدی کوڕی عوبادە، کەسێک لەئەنصاریەکان وتی: سەعدتان کوشت، عومەر دەڵێت لەکاتێکدا تووڕە بووم وتم: خوا سەعد بکوژێت چونکە ئاشوبگێڕ وخراپەکارە)) [2].

بوخاری وموسلم چیرۆکی بەیعەتنەدانی عەلی بۆ ماوەی شەش مانگ بەئەبوبەکریان هێناوە، بەڵام هەندێک کەس ئەوە ڕەت دەکەنەوە، لەوانە -تەنها وەک نمونە- ئیمامی حەرەمەینی جوەینی، کەئەو کارەی بەدرۆیەکی ئاشکرا زانیوە کەشیعە دروستیان کردبێت و، لەمبارەیەوە دەڵێت: ((ئەوەی ڕافزیەکان دەیڵێن کەعەلی بەتوندی و ناڕازیبوونەوە لەبەیعەتدان پێی (واتە بەئەبوبەکر) جوڵاوەتەوە درۆیەکی ئاشکرایە)) [3]، لەوانەش قازی ئەبوبەکری کوڕی عەرەبی و قوتابیە هاوچەرخەکەی شێخ محب الدین خەتیب، دواترو لەکۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا بەدرێژی قسەیان لەسەر

---

[1] ـ صحيح البخاري ١٣٤١/٣.

[2] ـ صحيح ابن حبان ١٥٧/٢ بەراوردی بکە لەگەڵ عبدالرزاق ٤٤٤/٥ و البزاز ٣٠٢/١و احمد ٥٥/١، بۆ زیاتر سەیرکردنی قسەکانی موحەقیقین لەمبارەیەوە بڕوانە: الاصابة ٢٨/٢ والاستعاب ٣٧/٢و سير أعلام النبلاء ٢٦٧/١.

[3] ـ الجويني: كتاب الارشاد ص٣٦١.

دەکەین، بەڵام بەغدادی دەڵێت: عەلی وعەباس ((چەند ڕۆژێک بەیعەتیان نەدا)) [1]، ئاشکرایە کەئەمە لەبەرانبەر ئەو قسەیەی عائیشەدا ناسەلمێنرێت – لانی کەم سەبارەت بەعەلی– کەلەهەردوو صەحیحەکەدا هاتووە عەلی بۆ ماوەی شەش مانگ بەیعەتی نەداو، تێیدا هاتووە: ((عەلی لەناو خەڵکیدا ئاراستەیەکی هەبوو، ژیانی فاتیمە، کاتێ وەفاتی کرد عەلی نەیدەویست خەڵکی ببینێت، لەگەڵ ئەبوبەکر ئاشتەوایی کردو بەیعەتی پێدا، لەو چەند مانگەدا بەیعەتی نەدابوو)) [2]، لەکۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا بەویستی خوا دێینەوەو بەدرێژی لێی دەدوێین.

**نمونەی دووەم:** پشت بەستن بەدەقی لاواز کەدەقە چەسپاوەکان پێچەوانەی ئەوانن، تەنها لەبەر ئەوەی ناوەرۆکی دەقە لاوازەکان ویژدانی ئەو نوسەرانە ئاسوودە دەکات، هەندێک لەباسکردنی بەیعەتی سەعد بەئەبوبەکر بەڵگە بەگێڕانەوەیەکی یەکلاکەرەوە دەهێننەوە کەئەحمەد لەمەسنەدەکەیدا لە حومەیدی کوڕی عبدالرحمانی حومیری لەئەبوبەکری صدیقەوە (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوەو، تێیدا هاتوو کەئەبوبەکر بەسەعدی وتووە: (( ئەی سەعد تۆ دەزانیت کەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەکاتێکدا تۆ دانیشتبوویت فەرمووی: قورەیشیەکان سەرۆکایەتی ئەم کارە دەکەن و چاکەی خەڵکی شوێنکەوتەی چاکەی ئەوانەو خراپەکاری خەڵکی شوێنکەوتەی خراپەکاری ئەوانە)) دەڵێت ئەمجا سەعد پێی وت: ڕاستت وت ئێمە وەزیرو

---

[1] ـ كتاب أصول الدين ص٢٨٢.

[2] ـ صحيح البخاري ١٥٤٩/٤ وصحيح مسلم ١٣٨٠/٣ بەراوردی بکە لەگەڵ صحيحى ابن حبان ١٥٣/١١و مصنف عبدالرزاق ٤٧٣/٥.

ئێوە فەرمانڕەوا دەبن)) [١]، ئەو فەرمـوودەی بوخـاری لـەبارەی ئـەم بابەتەوە هێناویەتی ڕەت دەکەنەوە یاخود زۆر لەخۆیان دەکـەن بـۆ لێکدانەوەی، ئەوەی زانـراوە حمیـری لـەمنـالانی تابعینـە و، لـەژیـانی ئەبوبەکری صدیق وبەیعەتی سەقیفە تێنەگەیشتووە، بەڵکو لـەلایـەن پاشین و هاوەڵە بەتەمـەنـەکانی وەک ئـەبوهـورەیـرەو ئـەبی بکـرەو ئیـبن عومـەرو ئیـبن عـەباسـەوە گێـڕدراوەتـەوەو، وتوویـەتـی ئـەم هەواڵە لەلای ئیبن حەجـەر [٢] و هـەیسـەمـی [٣] واحمد شـاکر [٤] و ئـەلبانی وجگەلەوان پچڕانی تێدایە، بەڵام قسەی لێکۆڵـەری ((منهـاج السنة)): ((وصـــحح الالبـــانی الحـــدیث)) [٥] ئـــەمـــە لـــەو چوارچێـــوەیـــەی ئارەزوومەندی ڕاستکردنەوەی ئەو لاوازانە دەرناچێت کەپشتگیری لــەبۆچــوون و تێڕوانینــی نووســەر دەکــەن، ئـەگــەرنـا ئـەلبـانی تەنهائەصلی ئەم فەرموودەی ڕاست کردوەتـەوە: ((قـریش ولاة هـذا الامر)) واتە: قوڕەیش هەڵگری ئەم بەرپرسیارێتیەن، ئەمەش بـەپێی ڕێگـەو شـاهێدی دیکـەو، دەڵێـت: ((فـەرمـوودەکـە شـاهێدی تـری لەفەرموودەکەی جابردا هـەیەو، یـەکێکی تریشی لـە فـەرمـوودەی ئـەبوهـورەیـرەو، دەربڕینـی: ((النـاس تبـع لقـریش)) [٦]، واتـە: خـەڵـک شوێنکەوتەی قوڕەیشن، بەڵام گفتوگۆی نێوان سەعدو ئەبوبەکر – کەچەقی ناکۆکییەکەیە لێرەدا- ئـەلبانی نـەهـاتووە ڕاسـتی بکاتـەوە، بەڵکو هاوڕای فەرموودەناسـانی پێش خـۆی بـووەو، ڕایگـەیـاندووە

---

[1] ـ احمد ١/٥.

[2] ـ فتح الباري ١١٤/١٣.

[3] ـ مجمع الزوائد ١٩١/٥.

[4] ـ مسند الامام احمد ١٦٤/١ تحقيق احمد شاكر.

[5] ـ منهاج السنة ٥٣٦/١ پەراوێزی ژمارە ٤.

[6] ـ الالباني: سلسلة الاحاديث الصحيحة ١٤٥/٣.

کەپچڕانی تێکەوتووە: ((پیاوەکانی متمانەپێکراون، بەڵام حمید بەئەبوبەکر نەگەشتووە هەروەک لە (المجمع)دا هاتووە)) [1]-مجمع الزوائد-.

**نمونەی سێیەم:** ویستی هەندێک لەوانەی زۆرشارەزان لەزانستی فەرموودەناسیدا فەرموودەی (موضوع) دەخەنە نێو بابەتەکە، بەبێ ئەوەی ئاگاداری (موضع) بوونەکەی ببن هەر لەبەر ئەوەی پشتیوانی بۆچوونیان دەکات، لەوانەیە ئیبن عەساکر لێرەدا دیارترین نمونە بێت، بەداخەوە ئەگەر تاقانە نەبێت: ئین کەسیر باسی ئەو فەرمووده (موضوع)ە دەکات کەئیبن عساکر هێناویەتیەوە: ((پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) راوێژی بەجوبرەئیل کرد لە(استکتاب) نووسین بۆ معاویە، فەرمووی: بۆی بنووسە چونکە ئەو ئەمینە))، پاشان ئیبن کەسیر لەسەر ئەمەی نووسیووەو دەڵێت: ((سەیرە کەئیبن عەساکر لەگەڵ پایەرزی تواناو ئاگاداربوونیەوە لەسەر دروستکردنی فەرموودە زیاتر لەهەر کەسێکی تری خەڵکی سەردەمەکەی –بگرە ئەوانەشی کەپێش خۆی هاتبوون- کەچۆن لەسەردەمی ئەودا فەرموودەی لەو شێوازە دروست دەکرێت، پاشان حاڵەتەکەی ڕوون ناکاتەوەو، ئاماژە بۆ هیچ شتێک ناکات لەوبارەیەوە، نەئاشکراو نەپەنهان، ئەم جۆرە کارە قسەی لەسەرەو، خوا ئاگادارترە)) [2]، لەشوێنێکی تردا دەڵێت: ((ئەوەی سەیرە لەودا وێڕای زیرەکی و ئاگاداریی چۆن هۆشداری نادات لەبارەیەوەو لەسەر ڕەتکرانەوەیی و لاوازی

---

[1] ـ سلسلهة الاحاديث الصحيحة ١٤٦/٣ فەرمودەی ژمارە ١١٥٦.

[2] ـ ابن كثير: السيرة النبوية ٦٩٦/٤-٦٩٧، سەبارەت بەتانەدان لەم فەرموودەیە بڕوانە :الذهبي: ميزان الاعتدال فى نقد الرجال ٢٤١/٦.

پیاوەکانی)) [1]، ئەم قسەیەی زەهەبی لەوەوە نزیک بووە: ((ابن عساکر لەژیاننامەدا (ژیاننامەی معاویە) فەرموودەی بێبنەماو پوچەڵی هێناوەو درێژەی پێداوە)) [2].

ئیبن تیمیە سەرچاوەی ئەمجۆرە لەزیادەڕەوی تێگەیشتووەو، بەبێ دوودڵی کارەکەی یەکلا کردوەتەوەو، رازی نەبووە کەبەدرۆکردن بەدەم پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) بەرگری لەهاوەڵان بکرێت، یاخود شێواندنی ڕاستیەکانی مێژوو، ئەوەی ڕاگەیاندووە کە: ((عەلی باشێتی چەسپاوی لەهەردوو صەحیحەکەو جگە لەواندا هەیەو، معاویە هیچ باشێتیەکی تایبەتی لەصەحیحدا نیە)) [3]و، هێرشی کردۆتە سەر ئەوانەی کەباشێتیان بۆ معاویە داناوە کەلەسوونەتدا نەهاتووەو ((فەرموودەیان لەپێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) لەوبارەیەوە زۆر گێڕاوەتەوە کەهەموویان درۆن)) [4]، کاتێ ئیبن تەیمیە فەرموودەی حەمیدی حمیری لەهەندێک نوسخەی ((المنهاج))دا دێنێت (ارسال) بوونی ڕادەگەیەنێت، وەک ئەوەی ئەمانەتی زانستی پێویستی دەکات و، زۆری لەخۆی نەکردووە بۆ رەتکردنەوەی دوو فەرموودەی (صحیح)ی سەقیفە هەروەک زۆرێک لەوانەی پێشترو هاوچەرخەکان کردوویانە، بگرە زۆرێک لەشیکاریەکانی خۆی لەسەر بونیات ناوە.

**نمونەی چوارەم:** ئەو بانگەشەیەی کەهیچکام لەهاوەڵان ئامادەی ئاشوبەکە نەبووە جگە لەگەورە هاوەڵانی وەک عائیشەو

---

[1] ـ البداية والنهاية ١٢٠/٨.
[2] ـ سير أعلام النبلاء ١٢٧/٣.
[3] ـ منهاج السنة ٤٠/٧.
[4] ـ منهاج السنة ٤٠٠/٤.

عەلی وتەڵحەو زوبیرو عەماری کوڕی یاسرو خوزەیمەی کوڕی سابت نەبێت، ئەمەش بانگەشەیەکە گوزارشت لەهەستی پاکی خاوەنەکانی لەبەرانبەر هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) دەکات، بەڵام –بەداخەوە- حەقیقەتی مێژوو دەرناخات، ئەوەتا لەمبارەیەوە هەریەک لەزەهەبی وئیبن حەجەر ناوی دەیان هاوەڵیان هێناوە کەبەشداری ئاشووبەکەیان کردووە[1]، ئەمە لەکاتێکدایە کەشعبە بانگەشەی ئەوەی کردووە کەجەنگی (صفین) لەئەهلی بەدر تەنها خوزەیمەی کوڕی سابت تێیدا بەشداری کردووە[2]، لەمەشدا ژمارەیەک لەهاوچەرخەکان شوێنی کەوتوون، ئەمەش سەرژمێرێکی ورد نیە، بەڵکو جگە لەویش لەبەشداربووانی بەدر بەشداریان تێدا کردووە، لەمبارەیەوە پێشەوا بوخاری ناوی فەزاڵەی کوڕی ئەبو فەزاڵەی ئەنصاری هێناوەو، دەڵێت: ((فوزالە کەلەبەری عەلیدا بوو لەڕۆژی (صفین)دا کوژرا، کەلەبەشداربووانی بەدر بوو)) [3]، زەهەبیش باسی کردوون لەوانە باسی کەعبی کوڕی عەمری ئەنصاری کردووەو، دەڵێت: ((لەگەڵ عەلیدا لە(صفین)دا بەشداری کردووەو، لەبەشداربووانی بەدر بوو)) [4]، ئیبن حەجەریش باسی سابتی کوڕی عبیدو ئوسەیدی کوڕی سەعلەبەو سەهلی کوڕی حنیف و ئەبا عەمری ئەنصاری و ئەبو هەیسەمی کوڕی

---

[1] ـ بۆ نمونە نەک تەنها ئەمانە هەبێت بڕوانە: سیر أعلام النبلاء ٤٣/٣، ٤٠٨/٣، ٣،٣٩، ٥٧٤/٢، ٤٦٧/٢، ١٦٤/٣، ٥٤٤/٢و الاصـــــابة ٤٣٣/٦، ٥١٥/٦، ٢٧/٢، ١٢٤/٢، ٨٧/١، ١٨٧/١، ١٤٥/٧٦،٢/١، ٧١/٣، ٥٠/٣، ٤٨٩/٢، ٥٦٧/٢، ٥٥٢/٢، ٤٠٩/٤، ٤٦٩/٤، ٤٨٩/٤، ٤٠/٤.

[2] ـ منهاج السنة ٢٣٧/٦.

[3] ـ البخاري: التاريخ الصغير ٧٨/١.

[4] ـ سير أعلام النبلاء ٥٣٧/٢.

تیهانی کردووه[1]، هەروەها چەندین دەقی گشتی ئەوەیان تیدا هاتووە کەژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵان بەشداری (صفین)یان کردووە، وەک ئەوەی هەیسەمی لەچیرۆکێکی درێژدا هێناویەتی: ((عەماری کوڕی یاسر بەهاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ی دەوت، عەمار دەچووە هەر دۆڵێک لەدۆڵەکانی (صفین) هاوەڵانی محەمەد (صلی الله علیه وسلم) بەشوێنیەوە بوون)) [2].

هەموو ئەم لادانانە لەمەنهەجی زانست ودادپەروەری هۆکارەکەی جیانەکردنەوەی ڕاستیەکانە لەهەستەکان لەم بابەتە هەستیارانەدا کەهەستی هەموو موسڵمانێک دەوروژێنێت، کەئەم جیاکردنەوەیە زۆر پێویستە بۆ هەموو توێژەرێک کەبیەوێت لەهەر کات وسەردەمێکدا بەشوێن ڕاستیدا بگەڕێت.

## ڕێسای دەیەم

## دووركەوتنەوە لەنەفرەت وجنێودان

## (الابتعاد عن اللعن والسب)

لەپێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) گێڕدراوەتەوە کەنەهی کردووە لەنەفرەتکردن لەهەندێک موسڵمانی سەرپێچیکار، وەک ئەو فەرموودەیەی سەبارەت بەپیاوێک کەزۆر سەرخۆش بوو نازناوی (حمارا)ی لێنرابوو، کاتێ هەندێک کەس نەفرەتیان لێکرد: ((پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: نەفرەتی لێ مەکەن سوێند بەخوا ئەوەی زانیومە ئەوەیە کەئەو خواو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت))

---

[1] ـ بڕوانە: الاصابة ٣٩٢/١، ١٩٨/٣، ٨٣/٧، ٢٨٧/٧، ٤٤٩/٧.

[2] ـ هەیسەمی وتوویەتی: طبراني و احمد بەکورتی گێڕاویانەتەوەو، ابو یعلی بەشێوەی طبراني و بزاز کەدەڵێت: ((دەستەیەکی زیادەڕەو عەمار دەکوژێت)) تەنها لەعبدالله کوڕی عەمرەو پیاوەکانی احمد و ابی یعلی متمانەپێکراون.

[1]، هەروەها لەپێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕنەوە کەنەهی کردووە لەجنێودان بەموسڵمان بەگشتی و لەمبارەیەوە فەرموویەتی: ((سباب المسلم فسوق وقتاله كفر)) [2]، واتە: (جنێودان بەموسڵمان سەرپێچی (فسق)ەو شەڕکردن لەگەڵی کوفرە)، بەهەمان شێوە نەهی کردووە لەجنێودان بەمردووان: ((لا تسبوا الاموات فانهم قد أفضوا الى ما قدموا)) [3]، واتە: جنێو مەدەن بەمردووان چونکە ئەوان چونەتەوە بەرەو لای ئەوەی ئەنجامیان داوە)، ((لاتسبوا أمواتنا فتؤذوا به الاحياء)) [4]، واتە: (جنێو مەدەن بەمردووانمان چونکە بەوە ئازاری زیندووانمان دەدەن)، بەڵکو فەرموودەی صەحیح لەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گێڕدراوەتەوە کەنەهی کردووە لەجنێودان بە کات (دهر) [5]و،جنێودان بەڕەشەبا[6]و، جنێودان بەکەڵەشێر[7]و، لەوانەیە بەشێک لەدانایی ئەمە بۆ ئەوە بێت زمانی باوەڕدار بەرەهایی لەوتنی قسەی خراپ پارێزراو بێت.

لەمبارەیەوە دەقی تایبەت لەپێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بەنەهیکردن لەجنێودان بەهاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) هاتووە، دیارترینیان ئەم فەرموودەیەی ئەبو سەعیدی خدرییە کە:

---

[1] ـ صحيح البخاري ٢٤٨٩/٦و بەراوردی بکە لەگەڵ مەسنەدی ابی يعلى ١٦١/١.

[2] ـ صحيح البخاري ٢٧/١و مسلم ٨١/١.

[3] ـ صحيح البخاري ٤٧٠/١.

[4] ـ الحاكم ٣٧١/٣و وتوویەتی: ((ئەم فەرموودەیە سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاری ومسلم دەریاننەهێناوە)).

[5] ـ البخاري ٢٢٨٦/٥و مسلم ١٧٦٣/٤.

[6] ـ الحاكم ٢٩٨/٢و، الترمذي ٥٢١/٤و، ابن ماجة ١٨٢٨/٢و، ابن ابي شيبة ٣٠٢/٥و، احمد ٢٥٠/٢.

[7] ـ ابن حبان ٣٧/١٣، وابوداود ٣٢٧/٤و، النسائي ٢٣٤/٦و،احمد ٢٥٠/٢.

((خالیدی کوڕی وەلیدو عبدالرحمانی کوڕی عەوف شتێکیان لەنێواندا بوو، خالیدی قسەی پێوت، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: ((لاتسبوا أحدا من أصحابی فان أحدکم لو أنفق مثل أحد ذهبا ما أدرک مد أحدهم ولانصفه)) [1] واتە: جنێو بەهیچکام لەهاوەڵانم مەدەن، چونکە ئەگەر یەکێک لەئێوە هێندەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێت هێشتا ناگاتەوە ئاستی یەکێکیان بگرە ناگاتە نیوەی.

بەپێی ئەم دەقی ئەم فەرموودانە، زۆرینەی زانایانی سوننە ڕقیان لەجنێودان ونەفرەت بووەو، ڕێبازی خۆپارێزی لەنەفرەتکردن لەکەسێکی دیاریکراو بەناویان پەیڕەو کردووە ئیدی ئەو کەسە با گوناهەکانیشی زۆر گەورە بووبێت، ئیبن تەیمیەش ئەم ڕێسایەی توندوتۆڵترو ڕیشەدارتر کردووەو جێبەجێی کردووە، لەمبارەیەوە دەڵێت: ((ئێمە ئەگەر باسی ستەمکارانی وەک حەجاجی کوڕی یوسف وهاوشێوەکانی لای ئێمەدا کرا ئەوەی لەقورئاندا هاتووە دەیڵێینەوە: ((أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ))، پێمان خۆش نیە کەسێک بەدیاریکراوی نەفرەت لێ بکەین، ئەمە لەکاتێکدایە کەکۆمەڵێک لەزانایانان نەفرەتیان لێ کردووە (واتە لەحەجاج)، ئەمەش ڕێبازێکەو بواری ئیجتیهادی تێدایە، بەڵام ڕێبازی یەکەمیان لای ئێمە خۆشەویستترو باشترە، بەڵام ئەوەی حوسەینی کوشت یاخود هاریکاری کوشتنی کرد یان ڕازی بوو بەکوشتنی ئەوا نەفرەتی خوداو فریشتەکانی و هەموو خەڵکی لێبێت، خوای گەورە تۆبەو خوێنبابیان لێ وەرناگرێت)) [2]، دیارە ئیبن تەیمیە لەو کەسانە

---

[1] ـ البخاري ١٣٤٣/٣، مسلم ١٩٦٧/٤.

[2] ـ مجموع الفتاوى ٤٨٧/٤.

نیە کەبەرگری لەکەسێکی وەک حەجاج بکات کەهێندەی ستەم وکوشتار کردووە مەگەر هەر خوا خۆی بیزانێت، بگرە شتی وا لەبارەیەوە دەگێڕنەوە کەپەنا بەخوا خوێنی حەڵاڵ بکات: ((لەعاصمەوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو حەجاج کەلەسەر مینبەر بوو دەیوت: ... سوێندبەخوا ئەگەر فەرمان بکەم بەخەڵکی لەدەرگایەک لەدەرگاکانی مزگەوتەوە بچنە دەرەوە ئەگەر لەدەرگایەکی ترەوە چوونە دەرەوە ئەوا خوێن و سامانیان بۆم حەڵاڵ دەبێت، سوێند بەخوا ئەگەر رەبیعەو مەزەر ببەم ئەوا ئەو کارە لای خوا حەڵاڵە بۆم ...)) [1]، مەبەستی ئیبن تەیمیە لێرەدا خۆڕازاندنەوەیە بەئادابە ئیسلامیەکان و، پاکڕاگرتنی زمان لەجنێودان و نەفرەت کردن و بەکافردانان، نەک بەرگریکردن لەستەمکارانی وەک حەجاج ویەزیدو ئەوانەی بەڕێی ئەواندا ڕۆشتن، وەک ئەوەی کە بەداخەوە لای قوتابخانەی ((شیعەگەریی سوننە)ی هاوچەرخ دەیبینین.

هەڵوێستی ئیبن تەیمیە لێرەدا درێژەپێدەری هەڵوێستی پێشەوا ئەحمەدە کە: ((سەلمێنراوە لێیەوە ئەگەر حەجاج و هاوشێوەکانی لەستەمکاران باسیان بکرایە لای ئەو و بیویستایە نەفرەتیان لێ بکات دەیوت: ((أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ))، ڕقی لەوە بووە کەئەو کەسەی نەفرەتی لێدەکرێت بەناو دیاری بکرێت)) [2].

سەربوردەی ئەو دوو شەرعزانەی حەنبەلی (عبدالمغيث الحربي وأبي الفرج بن الجوزي) هەستیاری ئەم بابەتەو، قوڵی ناکۆکی لەبارەیەوە ئاشکرا دەکات، بەهۆی نەفرەتکردن لەیەزیدی کوڕی معاویە ناکۆکی کەوتە نێوانیان (واتە عبدالمغيث و ابن الجوزي)،

[1] ـ الالباني: صحيح سنن أبى داود ٨٧٨/٣.

[2] ـ منهاج السنة ٥٧٣/٤.

(عبـدالمغيث) ڕێگـری دەكـرد لـەجنێوپێـدانی (نـەفـرەتلێكردنـی)و لـەمبـارەیـەوە دانراوێكـی هـەیـەو بـۆی خوێندەوە، ئیـبن جـەوزیـش دانراوێكـی دانـا (بـۆ وەڵامدانـەوەی)و ناوینـا ((الـرد علـى المتعـصب العنيـد مـن ذم يزيـد))و بـۆی خوێندرایـەوە، شـێخ عبـدالمغيث مـرد هێشتا هەر دژایەتیان لەنێواندا بوو)) [١].

لـەگـەڵ ئـەوەدا ئـەم مـشتومڕە فیقهیـەی نێـوان زانایـانی ئـەهلـی سوننە لەم بارەیـەوە، ئـەوانـەی گرتۆتـەوە كـەلـەهـاوەڵان نـین، وەك حەجاج ویەزید، بـەڵام هـاوەڵان ئـەوا هـیچ ناكۆكییـەك نیـە لـەنێوان سوننەكاندا كەدروست نیە نـەفرەت لـەهیچكامیـان بكرێت، بـەهـۆی تایبەتكردنی نەهیكردن لەقسەپێوتنیان بەدەقی فەرموودە.

ئـەوەی سـەیـرە هـەنـدێك لـەهاوچـەرخـەكـان كـەخـاوەن پێگـەن لەزانستەكانی سونەتدا هەتا ئێستاش بـەشـێوازی نـەفرەت و جنێودان مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەكانی سەردەمی یەكەم دەكەن، لەوانـەش دكتـۆر (عبدالمعطى أمـين قلعجـى) كـەدەڵێت: ((... داهینراوێكـی بێزراوی دیكـە لـەسـەردەمـی معاویـەدا دەركـەوت، بریتـی بـوو لـەوەی معاویـە خـۆی وهەموو والیەكانی بەفەرمانی معاویە لـەخوتبـەكانیاندا لـەسـەر مینبـەر جنێو وقسەیان بەگەورەمان عەلی كوڕی ئەبو تاڵب دەوت، بەڕادەیەك كـەنـەفرەتیـشیان لێدەكـرد –نـەفـرەتـی خوایـان لـێ بێـت- چونكـە ئـەو خۆشەویسترین كەسی پێغـەمبـەری خـوا بـوو (صـلى الله عليـه وسـلم) لـەدڵـی بـەڕێزیـدا، لـەسـەر مینبـەری خـودی مزگـەوتـی پێغـەمبـەرەوەو، لەبەردەم ڕەوزەی خودی پێغەمبەردا، كەمناڵەكانی گەورەمان عەلـی و خزمانی گوێیان لەو نەفرەتانە دەبوو)) [٢].

---

[1] ـ ابن مفلح: المقصد الارشد فى ذكر أصحاب الامام أحمد ١٣٦/٢.

[2] ـ ئەم قسانە لەقسەكردنی دكتۆر قەلعەچیدا لەسەر كتێبەكەی ئیبن كەسیر هـاتووە: جامع المسانيد والسنن: ٥٦٦/١١.

دكتۆر قلعچی –زۆر بەداخەوە– ئاماژە بەفەرموودەی صەحیح دەكات كەئەو مانایە دەدات معاویەو فەرمانڕەواكانی قسەدەڵێن و نەفرەت دەكەن لەئەمیری باوەڕداران عەلی كوڕی ئەبو تاڵب لەسەر مینبەرو، فەرمان دەكەن خەڵكیش وا بكەن، لەوانە:

١- ((لەعامری كوڕی سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص لەباوكیەوە دەگێڕێتەوە وتویەتی: معاویەی كوڕی ئەبو سوفیان فەرمانی كرد بەسەعدو، وتی: چی ڕێگرە لێت كەجنێو بەئەبو تراب (نازناوی عەلی بووە) نادەیت، سەعد وتی: سێ شت باس دەكەم كەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەبارەیەوە وتوویەتی و منیش قسەی پێناڵێم، هەریەک لەوانە لای من لەحوشتری سوور خۆشەویسترە، گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەكاتێكدا عەلی لەیەكێک لەغەزاكاندا لەپشتیەوە بوو، عەلی پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا من لای ئافرەتان و منالان بەجێ دەهێڵیت؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئایا ڕازی نابیت تۆ بۆ من وەک هارون بۆ موسا بوو بیت لەگەڵ ئەمەشدا پاش من پێغەمبەرایەتی نیەو، گوێم لێبوو لەڕۆژی خەیبەردا دەیفەرموو: ئالاكە دەدەمە دەستی پیاوێک كەخوداو پێغەمبەرەكەی خۆش دەوێت و خوداو پێغەمبەرەكەشی خۆشیان دەوێت، (سەعد)وتی: پێشبڕكێمان بوو لەسەری، فەرمووی: عەلیم بۆ بانگ بكە، هێنای، خۆلاویی بوو، دەموچاوی سڕی و ئالاكەی دایە دەستی و خوای گەورە فەتحی پێبەخشی، كاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ((فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ))، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

عەلی وفاتیمەو حەسەن و حوسەینی بانگکردو، فەرمووی: خوایە ئەوانە کەسی منن...)) [1].

هەندێکی لەگێڕانەوەکان زیاد کردووە: ((سوێند بەخوا معاویە بەیەک حەرفیش ناوی نەهێنا تا لەمەدینە دەرچوو)) [2]، یاخود: ((ئیتر سوێند بەخوا بەحەرفێکیش ناوی نەبرد تا لەمەدینە دەرچوو)) [3]، ((لای ئەبی یعلی لەسەعدەوە لەلایەکی دیکەوە دەگێڕنەوە کەهیچ جیا نیەو دەڵێت: ئەگەر مشار بخەنە سەر تەوقی سەرم تا جنێو بەعەلی بدەم ئەوا هەرگیز قسەی پێناڵێم)) [4]

٢- ((لەئەبی حازم لەسەهلی کوڕی سەعدەوە، وتی: پیاوێکی بنەماڵەی مەروان کرایە والی مەدینە، وتی: سەهلی کوڕی سەعدی بانگی کردو، فەرمانی پێکرد کەقسە بەعەلی بڵێت، دەڵێت: سەهل رەتی کردەوە، پێی وت: بەڵام ئەگەر هەر ڕازی نیت، ئەوا بڵێ: نەفرەتی لەخوا لە ئەبو تراب، سەهل وتی: عەلی هیچ ناوێکی تری نەبووە لای خۆشەویستر بێت لە ئەبو تراب، خۆشحاڵ دەبوو کەبەو ناوە بانگ دەکرا [5]، ((لەعومەیری کوڕی ئیسحاق وتی مەوران بۆ ماوەی شەش ساڵ فەرمانڕەوامان بوو، هەموو رۆژێکی جومعە قسەی بەعەلی دەوت، پاشان لابراو سەعیدی کوڕی عاص بۆ

---

[1] ـ مسلم ١٨٧١/٤ والحاكم ١١٧/٣ والنسائي ١٠٧/٥ والبزاز ٣٢٤/٣ والترمذي ٦٣٨/٥ والالباني: صحيح سنن الترمذي- أبواب المناقب.

[2] ـ الحاكم ١١٧/٣ والنسائي ١٢٢/٥.

[3] ـ البزاز ٣٢٤/٣.

[4] ـ فتح الباري ٧٤/٧.

[5] ـ مسلم ١٨٧٤/٤ والبيهقي ٤٤٦/٢.

ماوەی دوو ساڵ لەجێگەی بوو، ئەم قسەی پێنەدەوت، پاشان مەروانیان هێنایەوەو قسەی پێدەوت)) [١].

٣- ((لەعبدالرحمان کوڕی ئەخنەس دەگێڕنەوە کەموغیرەی کوڕی شعبە خوتبەی دەدا، قسەی بەعەلی وت، دەڵێت: سەعیدی کوڕی زەید هەستایەوەو وتی: شاهێدی دەدەم کەمن گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا لەبەهەشتایەو، ئەبوبەکر لەبەهەشتایەو، عومەر لەبەهەشتایەو، عەلی لەبەهەشتایەو، عوسمان لەبەهەشتایەو، عبدالرحمان لەبەهەشتایەو، تەڵحە لەبەهەشتایەو، زوبیر لەبەهەشتایەو، سەعد لەبەهەشتایە، پاشان فەرمووی: ئەگەر دەتانەوێت هەواڵی هەر دەیانت دەدەمێ، پاشان باسی خۆی کرد.

پێشەوا ئەحمەدیش لەوەکیعەوە لەشوعبەوە گێراویەتیەوە)) [٢]، ((لەعبداللە کوڕی سهو، وتی: کاتێ لەکوفە بەیعەت بۆ معاویە کۆکرایەوە، موغیرەی کوڕی شعبە فەرمانی بەوتاربێژانە کرد کەنەفرەتیان لەعەلی (خوا لێی ڕازی بێت) دەکرد، وتی: سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نفیل دەستی گرتم و، وتی: سەیری ئەم پیاوە ستەمکارە ناکەیت فەرمان دەکات بەنەفرەتکردن لەپیاوێک لەئەهلی بەهەشت، شاهێدی لەسەر نۆیان دەدەم

---

[1] ـ احمد بن حنبل: العلل ومعرفة الرجال ١٧٦/٣.

[2] ـــ المقدسي: الاحاديث المختارة ٢٨٨/٣-٢٨٩، لێکۆڵەری کتێبەکە دەڵێت: ((سەنەدەکەی حەسەنە))، بڕوانە: مسند الشاشي ٢٧٤/١واحمد ١٨٨/١و، ابويعلي ٢٥٩/٢، هەروەها بڕوانە: ابی عاصم: السنة ٦١٩/٢، وسير أعلام النبلاء ١٠٤/١، وتهذيب الكمال ٥٠٤/١٦.

کەلەبەهەشتدان، خۆ ئەگەر شاهێدی لەسـەر دەیـەمیش بدەم گوێی نادەمێ..)) [1].

گومانی تیدا نیە کەجنێودان ونەفرەتکردن لەئەمیری باوەڕداران عـەلی کـوڕی ئـەبو تالـب داهێنراوێکی قێزەونـە، هـەروەک دکتـۆر قلعچی وتویەتی، بـەڵام وەڵامدانـەوەش بـەجنێودان و نـەفرەتکردن قێزەونیـەکەی لـەو کـەمتر نیە، پێغـەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) فـەرمووویـەتی: ((ليس المؤمن بالطعـان ولا اللعـان ولا البـذيء ولا الفاحش)) [2]، واتە: باوەڕدار تانەدەر و، نەفرەتکارو، دەروونپیس و، داوێنپیس نیە.

## ڕێسای یازدەیەم

## دوورکەوتنەوە لەبەبێباوەڕدانان و تۆمەتبارکردن بەدووڕویی

## (الابتعاد عن التكفير وعن الاتهام بالنفاق)

نەفامانی شیعە هەموو هـاوەڵان بـەبێبـاوەڕبـوون ودووڕویی و، هـەڵگـەڕانـەوە لـەئیسلام پاش وەفـاتی پێغـەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) تۆمـەتبار دەکـەن، ئـەو نـەفامانـە قسە لـەسـەر ئـەو کـەسانە دەکـەن کـەنـاکۆکی سیاسـیان لـەگـەڵ ئـەمیـری بـاوەڕداران عـەلی هەبووەوبۆتە هۆی بەرپابوونی جەنگ لـەنێوانیانـدا، وەک معاویـەی کـوڕی ئـەبـو سـوفیان وعـەمـری کـوڕی عـاص، یـاخود ئـەوانـەی پەیوەندیان بەوانەوە هەبووە وەک ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب.

شێخی ئیسلام ئیبن تـەیمیـە بـەقـەڵـەمـەکـەی بـەرەنگاری ئـەوانـە بۆتـەوەو، بـەبـەڵگـەی ئاشـکراو تـاوتوێی بـڕوا پێهێنـەرەوە ڕوونـی

---

[1] ـ ابن ابي عاصم: السنة ٦١٨/٢-٦١٩.

[2] ـ ابن حبان ٤٢١/١ والحاكم ٥٧/١ والترمذي ٣٥٠/٤ والبيهقي ٢٤٣/١٠.

کردۆتەوە کەئەو پیاوانە باوەڕداربوون و، لەو کاتەوەی ئیمانیان هێناوە بەردەوام لەسەر باوەڕداریەکەیان ماونەتەوە، بەڵکو هەندێکیان لەکاتێکدا موسڵمان بوون –وەک عەمری کوڕی عاص– کەڕەوشەکە هیچ بواری ئەوە نادات تۆمەتی دوڕوویی بدرێتە پاڵ، بەڵام ئەو هەڵەو گوناهانەی کەئەنجامیانداوە خەسڵەتی ئیمان و خۆشەویستی خوای گەورەو پێغەمبەریان لێ دانامالێت.

سەبارەت بەعەمری کوڕی عاص ئەوا لەڕاستگۆیی ئیمانەکەی و بێبەریبوونی لەدووڕوویی هێندەی بەسە کەلەموهاجیرینە، هیجرەت و دووڕویش دژیەکن، لەمەشدا ئیبن تەیمیە بەشیکاریەکی لۆژیکی قسەبڕ بەڵگە دەهێنێتەوەو، دەڵێت: ((عەمری کوڕی عاص و هاوشێوەکانی لەو پێشینانەن کەپاش حودەیبیە هیجرەتیان کردو هاتنە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەویستی خۆیان لەوڵاتی خۆیانەوە کۆچیان کرد بەزۆرەملێ و ناچارکردن، موهاجیرەکانیش دووڕویەتیان تێدا نەبووە، بەڵکو دووڕوویی لەهەندێک لەو ئەنصاریانەدا بوو کەموسڵمان بووبوون، ئەمەش بەهۆی ئەوەی ئەنصاریەکان خەڵکی شاری مەدینە بوون و، کاتێ سەرگەورەکانیان و خەڵکەکەیان موسڵمان بوون ئەوانی تریش ناچاربوون بەدوڕویی خۆیان بەموسڵمان نیشان بدەن، ئەمەش بەهۆی سەربەرزی ئیسلام و دەرکەوتنیەوە بوو لەنێو هۆزەکەیاندا، بەڵام خەڵکی مەککە ئەوا سەرگەورەو خەڵکانی دەوروبەری ئەوان بێباوەڕبوون، لەبەر ئەوە تەنها ئەو کەسانە موسڵمانبوونی خۆیان ڕادەگەیاند کەبەڕوکەش ولەناخیشەوە باوەڕیان هێنابوو، چونکە هەرکەسێکیان موسڵمانبوونی خۆی ئاشکرا بکردایە ئەشکەنجە دەدراو دەربەدەر دەکرا، کەسی دووڕوو بەهۆی بەرژەوەندی دونیایەوە خۆی بەموسڵمان نیشان

دەدا، لەکاتێکدا ئەوەی لەمەککە موسڵمانبوونی خۆی ئاشکرا کردبوو لەدونیادا ئازار دەدرا...)) [1].

خۆئەگەر گوزارشتی دەقی فەرموودەشمان هێنایە پاڵ ئەم شیکارییە لۆژیکییە کەعەقڵ دەیگرێت، ئەوا دەزانین کەعەمری کوڕی عاص بەڕاستی باوەڕدار بووە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((ابنا العاص مؤمنان: عمروا وهشام)) [2]، واتە: (دوو کوڕەکەی عاص باوەڕدارن: عەمرو هشام)و، ((لەعەمری کوڕی عاص دەگێڕنەوە وتویەتی: ترسێک لەمەدینە هەبوو، چوومە لای سالم ئازادکراوی ئەبو حوزەیفە، لەکاتێکدا شمشێرەکەی بەدەستیەوە بوو لەئامادەباشیدا، منیش شمشێرێکم هەڵگرتوو وەک لەسەر سنگم ڕامگرت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئایا ترسەکەتان بۆلای خواو پێغەمبەری نەهێنان؟ وەک ئەوەی ئەم دوو باوەڕدارە کردیان)) [3]، عەمر لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) ڕاستگۆیانە دەڵێت: ((ئەی پێغەمبەری خوا، لەپێناوی ماڵ وساماندا موسڵمان نەبووم، بەڵکو ئارەزووم لە ئیسلامم بوو، هەتا لەگەڵ پێغەمبەری خوادابم (صلى الله عليه وسلم)...)) [4]، پاشان پێغەمبەر بەرەفتار پشتیوانی ئەم شایەتیدانە

---

[1] ـ ابن تيمية: الخلافة والملك ص٧٥-٧٦.

[2] ـ أخرجه أحمد ٣٠٤/٢ والحاكم ٢٦٨/٣ وصححه، ووافقه الذهبي، بڕوانە: سير أعلام النبلاء ٣١٤/١و٥٦/٣، شێخ شعيب ئەرنائۆت کەلێکۆڵەری کتێبەکەیە دەڵێت: (سەنەدەکەی حەسەنە) )).

[3] ـ ابن حبان ٥٦٦/١٥ والنسائي لە الكبرى ٨٥/٥ والهيثمي: مجمع الزوائد ٣٠٠/٩ وتويەتی: (ئەحمەد گێڕاویەتیەوەو پیاوەکانی متمانەپێکراون)و سير أعلام النبلاء ٦٤/٣-٦٥ شێخ شعيب ئەنرئۆتی لێکۆڵەری وتوویەتی: سەنەدەکەی حەسەنە)).

[4] ـ بەشێکی ئەو فەرموودەیەیە کە احمد ١٩٧/٤ و طبراني لە الكبير و لە الاوسط داو، ابو يعلي و، بخاری لە الادب المفرد ١١٢/١، بيهقی لە شعب الايمان ٩١/٢، هيثمی

گوفتاریەی بۆدا، ئەوە بوو عەمری کوڕی عاص ((لەلایەن پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)ەوە لەغەزاکانی (ذات السلاسل)دا کردیە فەرماندە، دیارە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەسی دووڕووی نەکردۆتەوە فەرماندە)) [١]، لەپەشیمان بوونەوەی عەمری کوڕی عاص و هەڵکیشانی ئاخ لەژیاننامەی سیاسی خۆی لەکاتێکدا لەسەرەمەرگدایە بەڵگەیە لەسەر ئیمانداریەکەی، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((من سرته حسنته وساءته سیئته فهو مؤمن)) [٢]، واتە: (هەرکەس کاری چاکی دڵخۆشی کردو کاری خراپیشی دڵگرانی کرد ئەوە بڕوادارە)، لەو هەوڵانەشی سەبارەت بەهەستکردنی بەپەشیمانی لەسەر سەربردەی سیاسی عەمری کوڕی عاصەوە (خوا لێی ڕازی بێت) هاتووە: ((لەئیبن شماسەی مهریەوە وتی: چوینە لای عەمری کوڕی عاص لەکاتێکدا لەسەرە مەرگدا بوو، زۆر گریاو ڕووی بۆلای دیوارەکە وەرگێڕا، وایکرد کوڕەکەی بڵێت: باوەگیان، ئایا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مژدەی ئەوەو ئەوەی پێنەداویت؟ دەڵێت: ڕووی وەرگێراو، وتی: باشترین شت بەشایەتی

---

وتوویەتی: ((پیاوەکانی ئەحمەد وابی یعلی پیاوانی صحیحن) (مجمع الزوائد ٦٤/٤) ئیبن حەجەریش لەبارەی فەرموودەکەی ئەحمەدەوە وتوویەتی (ئیسنادەکەی حەسەنە) (الاصابة ٦٥٣/٤) شێخ شعیب ئەرنائۆت وتویەتی: (بخاری له الادب المفرد لەڕێگەی موسای کوڕی عەلی، لەباوکیەوە، لەعەمری کوڕی عاصەوە، گێڕاویەتیەوە، ئەمەش سەنەدێکی صەحیحەو، حاکم راستی کردۆتەوە و زەهەبی هاودەنگی بووە)) بڕوانە سیر أعلام النبلاء ٦٦/٣ پەراوێزی لاپەڕەکە).

[1] ـ ابن تیمیة: الخلافة والملک ص٧٨.

[2] ـ الحاكم ٥٩/١ والترمذي ٤٦٥/٤ والنسائي ٣٨٨/٥ والبزاز ٧٢/٨ وابویعلي ١٣١/١ والمقدسي فی الاحادیث المختارة ١٩٢/١و، حاكم وتوویەتی: (صحیح)ە، لێکۆڵەری (المختارة) وتویەتی: (ئیسنادەکەی صحیحە).

دابنێین شایەتیدانە کە (لا الە الا اللە وان محمدا رسول اللە)، من سێ قۆناغم بینیووە: منت بینیوە کەکەس نەبوو لەمن زیاتر ڕقی لەپێغەمبەری خوا بێت (صلی اللە علیە وسلم)، کەسیش نەبوو ئەوەندەی من حەز بکات بەسەریدا زاڵ ببێ و بیکوژێ، ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە بمردمایە ئەوا دەچوومە ناو ئاگر، کاتێ خوای گەورە ئیسلامی خستە دڵمەوە هاتمە خزمەت پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم)و، وتم: دەستی ڕاستتم بدەرێ تا بەیعەتت پێبدەم، ئەویش دەستی ڕاستی بۆ هێنام، دەڵێت: دەستی گرتم، فەرمووی: ئەی عەمر چیتە؟ دەڵێت وتم: دەمویست مەرج دابنێم، فەرمووی: چ مەرجێک دابنێیت؟ وتم: لێخۆشبوونم، فەرموی: ئایا نەتزانیووە کەئیسلام ئەوەی پێش خۆی دەسڕێتەوەو، هیجرەتیش ئەوەی پێشخۆی لەناودەبات، حەجیش پێش خۆی دەسڕێتەوەو، ئیتر هیچ کەس نەبوو لام خۆشەویستتر بێت لەپێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) ولەو پایەدارتر نەبووم لەچاومدا، لەتوانامدا نەبوو کەچاوم پڕ لەشکۆداریەکەی بکەم، خۆ ئەگەر پرسیارم لێ بکرایە کەوەصفی بکەم نەمدەتوانی چونکە چاوم لێی تێر نەدەبوو، ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە بمردمایە ئەوا ئومێدەوار بووم لەئەهلی بەهەشت بم، پاشان شتانێکم پێ سپێردرا نازانم حاڵم چۆن بووە تێیدا، ئەگەر لەو حاڵەدا بمردمایە ئەوا تووشی پەشیمانی و ئاگر نەدەبووم، کاتێ دەمنێژن خاکم بەسەردا بپرژێنن، پاشان لەدەوری گۆڕەکەم بوەستن بەو ڕادەیەی ڕەگ شین دەبێت و گۆشتەکەی پەرت دەبێت، هەتا دڵم بەئێوە بکرێتەوەو، بزانم بەچی وەڵامی نیرداوی پەروەردگارم دەدەمەوە)) [1]،(لەعەمری کوڕی عاصەوە،

[1] ـ مسلم ١١٢/١ وابو عوانة ٧٠/١.

وتویەتی: ئەگەر ئەبوبەکرو عومەر ئەم سامانەیان بەجێهێشتبا، ئەوا بەهەڵەدا دەچوون و بۆچوونیان راست نەدەبوو، خوای گەورە ئاگادارە کەئەو دوانە بەهەڵەدا نەچوون و بۆچوونیان ناتەواو نەبوو، ئەگەر بۆ ئەوان دروست نەبوو بێت ئەوا ئێمە پاش ئەوان بردمان و تیاچووین، سوێند بەخوا ئەو وەهمە لەپێشمانەوە هات)) [١]، ((لەئەبو نوفل کوڕی ئەبو عقربەوە دەڵێت: عەمری کوڕی عاص لەکاتی سەرەمەرگدا ترسێکی زۆر توند دایگرتبوو، کاتێ عبداللە ی کوڕی ئەوەی بینی وتی: ئەی باوکی عبداللە ئەم ترسە چییە لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کاری پێدەسپاردیت و بەکاری دەهێنایت؟ وتی: بەڵێ کوڕم وابوو، لەبارەی ئەوەوە ئاگادارت دەکەم، بەڵام سوێند بەخوا نازانم ئەوە لەبەر خۆشەویستیم بوو یان دڵڕاگرتنم بوو، بەڵام شاهێدی لەسەر دووکەس دەدەم کەدونیای بەجێهێشت خۆشی دەویستن: کوڕەکەی سومەیە (عەماری کوڕی یاسر)و کوڕی دایکی عبد (عبداللە ی کوڕی مەسعود). بەڵام کاتێ گەیشتە گیانەڵا زنجیری خستە گەردنی و، وتی: خودایا فەرمانت پێکردین و وازمان لێهێنا، ڕێگریت لێ کردین و ئەنجاممان‌دا، تەنها لێخۆشبوونی تۆ بەشمان دەکات، ئەمە لاڵانەوەی بوو تا مرد)) [٢].

-بەڵام معاویە ئەوەتا تەنها کردنی بەوالی لەلایەن عومەرەوە بەسیەتی وەک بەڵگە لەسەری بێبەریبوونی لەدووڕوویی، ئیبن

---

[1] ـ مجمع الزوائد ٢٣٢/٥و هیثمی دەڵێت: ((طبرانی گێڕاویەتەوەو پیاوکەنانی پیاوانی صحیحن)).

[2] ـ احمد ١٩٩/٤، هیثمی دەڵێت: ((پیاوەکانی پیاوی صحیحن)) (مجمع الزوائد ٣٥٣/٩) شێخ شعیب ئەرنائۆت دەڵێت: (ئیسنادەکەی صەحیحە) (سير أعلام النبلاء ٧٥/٣ پەراوێزی لاپەڕەکە).

تەیمیە دەڵێت: ((عومەری کوڕی خەتاب لەفیراسەدا لەمەزنترین کەسەکان بوو، لەهەمووان زیاتر سەرناس بوو، لەهەمووان زیاتر شارەزاو ئاگادارتر بووە لەحەق ... هەرگیزیش عومەر –تەنانەت ئەبوبەکریش- کەسی دووڕویان نەکردوە بەفەرمانڕەوای موسڵمانان و، لێپرسراوێتیان نەسپاردوە بەخزمانی خۆیان و، هیچ کاتێ لۆمەی لۆمەکارانیان لەبەر خوا لەسەر نەبووە، بگرە ئەو کاتەی لەدژی هەڵگەڕاوەکان جەنگان و گێڕانیانەوە بۆ لای ئیسلام ڕێگریان لێکردن سواری ئەسپ ببن و شمشێر هەڵبگرن، هەتا دروستی تەوبەکەیان نەسەلمێنرا، عومەر بەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی دەوت ئەو کاتەی ئەمیری عێراق بوو: ((هیچ کەسێکیان بەکار مەهێنەو، لەبارەی جەنگەوە ڕاوێژیان پێ مەکە))، چونکە ئەوان فەرمانرەدەی گەورەی وەک تەلیحەی ئەسەدی و، ئەقرعی کوڕی حابس و، عیینەی کوڕی حصن و، ئەشعەسی کوڕی قەیسی کندی و، هاوشێوەکانیان بوو، ئەوانە کاتێ ئەبوبەکرو عومەر جۆرێک لەترسی دوڕویەتیان لێکردن نەیانکردنە فەرمانڕەوای موسڵمانان)) [1]، (چۆن پیاوێک چل ساڵ ئەمیری موسڵمانان دەبێت و سەربەخۆ (خەلیفە) دەبێت، هەرپێنج نوێژەکەیان پێدەکات و، وتاریان بۆ دەدات وئامۆژگاریان دەکات، فەرمانیان پێدەکات بەچاکەو، ڕێگریان لێدەکات لەخراپەو، سزایان لەسەر جێبەجێ بکات و، دەستکەوت وصەدەقەکانیان بەسەردا دابەش بکات و، حەجیان پێ بکات و، لەگەڵ ئەوەشدا دوڕویەتیەکەی لای هەموویان

---

[1] ـ ابن تیمیة: الخلافة والملک ص٧٧-٧٨.

شاراوە بێت، لەکاتێکدا ژمارەیەکی زۆر لەگەورە هاوڵانیان لەناودا بێت؟))[١].

راستە تەنها سپاردنی والێتی لەلایەن عومەرەوە بەکەسێک نابێتە پاککەرەوەی لەستەمکردن یاخود ئەنجامدانی سەرپێچی، لەمبارەیەشەوە قسەکەی ئیبن تەیمیەمان پێشتر هێنایەوە: ((عومەر ئەو کەسانەی فجوریان تێدا بوو بەهۆی زاڵبوونی بەرژەوەندی کارکەوە بەکار دەهێنا، پاشان بەهێزو دادپەروەری خۆی فجورەکەی نەدەهێشت تێیدا)). بەڵام ئەوە دووربوونی لەدوڕوویی دەگەیەنێت، چونکە نەبووە عومەر کەسی دووڕوو بکاتە والی، ڕوینەداوە بەدوڕویەتی دووڕووەکان تا ئەو ڕادەیە فریو بخوات.

بەڵام ئەبوسوفیان، ئەگەرچی ئیبن تەیمیە لەهەندێک لەزانایانەوە دەگێڕێتەوە کەلەسەر باش موسڵمانبوونی قسەیان هەبووە[٢]، لەگەڵ ئەوەدا وادەردەکەوێت باش موسڵمان بووبێت، بەڵکو بەشداری جیهادیشی کردووەو، زەهەبی چیرۆکی بەشداریکردنی ئەبوسوفیانی لەجیهادی ڕۆژی یەرموکدا لەژێر ئاڵای کوڕەکەیدا یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان هێناوە ، پاشان دەڵێت: ((ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ئەوا بەوە حاڵی باش دەبێت)) [٣]، سوپاس بۆ خوا بینیمان چیرۆکەکە راستە، ئیبن حەجەر دەڵێت: ((یەعقوبی کوڕی سوفیان و ئیبن سعد بەسەنەدێکی صەحیحەوە لەسەعیدی کوڕی مسیب لەباوەکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتوویەتی: لەرۆژی یەرموکدا هەموو دەنگەکان کپ بوون تەنها دەنگی یەک پیاو نەبێت دەیوت: ((ئەی سەرکەوتنی خوا نزیک ببەرەوە))، دەڵێت کەسیرم کرد بینیم

[1] ـ مجموع الفتاوى ٤٧٧/٤.
[2] ـ بڕوانە: مجموع الفتاوى ٤٧٧/٤.
[3] ـ سير أعلام النبلاء ١٠٧/٢.

ئـەبوسـوفیانە لـەژێـر ئـاڵای یـەزیـدی کوڕیـدا (یـەزیـدی کـوڕی ئەبوسوفیان))) [1]، هەروەک زەهەبیش گفتوگۆی ئەبوسوفیان لـەگـەڵ هرقلـی کردۆتـە بـەڵگـە لـەسـەر ڕاسـتی ئیمـانی لـەو گفتوگۆ درێـژە جوانەی کەبوخاری و هـەندێک لـەخـاوەن سـونەن ومـەسـنەدەکان گێڕاویانـەتـەوەو، دەڵێت: ((گومـانی تێدا نیە کـەگفتوگۆکـەی لـەگـەڵ هرقل ونووسینی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەڵگـەیە لـەسـەر ئیمـانی سـوپاس بـۆ خـوا)) [2]، ئـەو وەک دەڵێـت، لـەکۆتـایی ئـەو گفتوگۆیـەدا هـاتووە: ((ئـەبـو سـوفیان وتـی: سـویند بـەخـوا هێـشتا سەرشۆڕم ودڵنیام کە کارەکەی (پێغەمبەر –صلی الله علیه وسلم-) سـەردەکـەوێـت هـەتـا خـوای گـەورە ئیـسلامی خـستە دڵمـەوە لەکاتێکدا ڕقم لێی بوو)) [3].

ئیـبن تـەیمیـەش بـەوە بـەڵگـەی بـۆ ئیمانـداری ئـەبوسـوفیان هیناوەتەوە کەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردیە فەرمـانڕەوای نـەجـران ((پێغـەمبـەر(صـلی اللـه علیـه وسـلم) وەفـاتی کـرد هێـشتا ئـەبوسـوفیان فـەرمـانڕەوای نـەجـران بـوو)) [4]، ئـەمـەش خـەیاڵێکـە لەخەیاڵاتەکانی ئیبن تـەیمیە (ڕەحمـەتی خـوای لێبێت)، چونکـە ئـەو فەرمودەیەی کەداواکاری ئەبوسوفیانی لەپێغەمبەر (صـلی اللـه علیـە وسـلم) لـەوبـارەیـەوە تێدا هـاتووە بریتییـە لـەفـەرمـودەکـەی ئیـبن عەباس: ((دەڵێت: موسـڵمانان وا سـەیری ئـەبوسـوفیانیان نـەدەکرد

---

[1] ـ ابن حجر: الاصابة ١٧٣/٢.

[2] ـ سیر أعلام النبلاء ١٠٧/٢.

[3] ـ فەرمووودەکەی ئەبوسوفیان دەربارەی قیصر و نوسـراوی پێغـەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) لـە: البخـاري ٧/١ والبیهقـي ١٧٨/٩ والنـسائي ٣١٠/٦ واحمـد ٢٦٢/١ وأبویعلي ٨/٥ وأبوعوانة ٢٦٩/٤ والطبراني له (الكبير) ١٧/٤ گێڕدراوەتەوە.

[4] ـ مجموع الفتاوی ٤٥٤/٤.

(پاش فەتحی مەککە)و لەگەڵی دانەدەنیشتن، ئەویش بەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ی وت ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم سیانەم پێیان بدە، فەرمووی: بەڵێ، وتی: باشترینی عەرەب و جوانترینیان کە ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیانە هاوسەرگیریتان کردووە، فەرموی: بەڵێ، وتی: معاویەش بکەیتە کاتب بەردەستی خۆت، فەرمووی: بەڵێ، وتی: فەرمانیشم پێ بکەیت لەگەڵ بێباوەڕان بجەنگم هەروەک چۆن پێشتر لەدژی موسڵمانان دەجەنگام، فەرمووی: بەڵێ، ئەبو زمیل وتی ئەگەر داوای ئەوەی نەکردایە لەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەوا پێی نەدەدا، چونکە داوای هەر شتێکی دەکرد دەیفەرموو بەڵێ))، ئەم فەرموودەیە مەتنەکەی تەواو نیەو، لەسەنەدەکەشیدا کەس هەیە کەتۆمەتبار بێت بەدرۆ کردن، هەرچەندە لەصحیحی موسلمیشدا هەیە[1]، زۆرێک لەفەرموودەناسان قسەیان لەسەر کردووە، لەوانە ئیبن حزم و ئیبن جوزی کەهەردوکیان مکوڕن لەسەر ئەوەی فەرموودەکە (موضوع)ەو، یەکێک لەگێڕەرەوەکانی (عکرمەی کوڕی عمار) بەدرۆکردن تۆمەتبار دەکەن، بەتەنها ئیبن قەییم قسەی زیاتری لەسەر ئەم فەرموودەیە کردووە [2]و پاشان بەم ئەنجامە گەیشتووە: ((راست ئەوەیە ئەم فەرموودەیە نەپارێزراوە، تێکەڵکردن تێیدا ڕوویداوەو خوداش ئاگادارترە))، ئیبن حەجەر سورە لەڕاست نەبوونی ئەم پێسپاردنی والێتییەکەو، دەڵێت: ((دەگوترێت کەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانڕەوایی نەجرانی پێسپاردووە، بەڵام ناسەلمێنرێت)) [3].

---

[1] ـ صحيح مسلم ١٩٤٥/٤.

[2] ـ بڕوانە کتێبەکەی: ((جلاء الافهام)) ص٢٤٥و دواتر.

[3] ـ الاصابة ١٧٢/٢.

بەهەرجۆرێک بێت، ئەوا تۆمەتی بێباوەڕبوون ودووڕویی درانەپاڵ ئەو کەسانە بەڵگەی شەرع وعەقڵی تێدا نیەو، بەهەرشێوەیەک بێت شتیکیان لەسەرە، لەهەڵس وکەوتی سیاسی و لەرۆڵیاندا لەوێرانکردنی پایەکانی خەلافەتی ڕاشیدین، بەڵام ئەوە صیفەتی موسڵمانبون و ئیمانیان لێ ناکاتەوەو، هەموو ئەوانەی تۆمەتی دووڕوییان دەدەنە پاڵ گومانی تێدایەو، بەدرۆ داپۆشراوە، بۆیە واباشە کەئەو کەسەی بەشوێن حەقدا دەگەڕێت خۆی لابدات لەو شێوازە و، شتە پەنهانەکان بەجیهانی پەنهان بسپێرێت.

## ڕێسای دوازدەیەم

## دەربازبوون لەمشتومڕو کاردانەوەکان

## (التحرر من الجدل وردود الافعال)

لەڕاستیدا کاردانەوە ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر زۆرێک لەوانەی مامەڵەیان کردووە لەگەڵ ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان چینی یەکەمی سەرەتای ئیسلام و، هەستی مشتومڕو بگرەو بەردە بڵاوبووبووەوەو، کاردانەوەش بەسروشتی خۆی هاوسەنگ نابێت، چونکە کارێکی خۆنەویستە، بەمجۆرە کاردانەوەکان بەرانبەر شیعە هەندێکجار لای خەڵکی ڕەشۆکی سونە وهەندێک لەفەرموودەناس و شەرعزانان بەلارێدا ڕۆشتووەو، گۆڕاوە بۆ جۆرێک لە((شیعەگەریی سوننە)) کەتەنها بەبەرگریکردن لەخەلیفەکانی ڕاشدین لەدژی ئەوانەی زماندرێژیان بەرانبەر دەکەن لەشیعەکان نەوەستاوە، بگرە گەشتۆتە ئەوەی بەرگری لەلادانەکانی پادشا ئەمەوییەکانیش بکەن و پاساو بۆ ستەمکاریان بهێننەوە، محەمەدی کوڕی حەنەفیە -ڕەحمەتی خوای لێبێت- یەکەمین کەس بووە هۆشداری داوە سەبارەت بە بەشیعەبوونی ئەمانیش، لێیەوە

دەگێڕنـەوە کـەوتوویـەتـی: ((کـەسـانی دوومـاڵی عـەرەب خـەڵکـی دەیانکـەنـە هاوشـێوەی خـوا هێنـد گـەورەیـان دەکـەن: ئێمـەو ئـەو ئامۆزایانەمان: مەبەستی بەنی ئومەیەیە)) [1].

ئیبن کەسیر دیمەنێکی ئەو بەشیعەبوونەی بەرانبەرمان بۆ وێنا دەکـات و دەڵێـت: (لـەراسـتیدا ڕافزیـەکـان لـەدەوڵـەتـی بـەنـی بویـە لـەسـنووری چوارسـەدو دەوروبـەریـدا زیـادەڕەوییـان دەکـردو، دەهۆڵیان لەرۆژی عاشوردا بەغداو دەوروبەری دەکوتـاو، خۆڵ و کـا یـان لـەڕێگـاو بـازاڕەکـان بـڵاودەکـردەوەو، عـەبـای لـەمـوو چنراو(مسوح)یان بەدوکانەکاندا هەڵدەواسی و، خەمباری وگریانیان پیشانی خـەڵکـی دەداو، زۆرێکیـان ئاویـان نـەدەخـوارەوە تـا هـەمـان ئـازاری حـسینی هـەبێـت، چونکـە بـەتینویـەتـی کـوژرا، پاشـان ئافرەتانیش بەسەرو روخسارو شان و ملی دانەپۆشراوەوە دەهاتن بـەلاواندنـەوەو لـەدەموچـاوی خۆیـان دەداو سـنگیان لـەبـازاڕەکانـدا ئـاوەلا بـوو... بـەمـەو هاوشـێوەکـانی دەیانویـست دەوڵـەتـی بـەنـی ئومـەییـە بێـزار بکـەن، چونکـە لـەدەوڵـەتـەکـەی ئـەواندا کـوژراوەو، خـەڵکـی شـام بـەپێچـەوانـەی ڕافزیـە ناصـبیەکانـەوە بـوون، ئـەوان دانەوێڵەیان دەکولاندو، خۆیان دەشۆردو بۆنی خۆشیان لـەخۆیـان دەداو بـەنرختـرین پۆشـاکیان دەپۆشـی و، کردبوویانـە جـەژن و، جـۆرەهـا خواردنیـان تیـدا دروسـت دەکـردو، شـادی وخۆشـیان دەردەبڕی، بەمـە دەیانویـست کـەلـەڕەقی لـەگـەڵ شـیعەکانـدا بکـەن وپێچەوانەی ئەوان بجولێنەوە)) [2].

---

[1] ـ سير أعلام النبلاء ١١٦/٤.

[2] ـ ابن كثير: البداية والنهاية ٢٠٢/٨.

هـەروەک ئیبن تـەیمیـە لایـەنێکی بـۆ وێنـە کـردووین و، دەڵێت: شیعەی عوسـمان هـەبـوو جنێوی بـەعـەلی دەداو، لـەسـەر مینبـەرو شوێنی تر ئەوەی دەوت، بـەهـۆی ئـەو کوشـتارەی لـەنێوان ئـەمـان وئـەودا هـەبـوو، هـەیـانبوو نـوێژی لـەکـاتی خـۆی دوادەخـست... شیعەی عەلی لەلایەکی ترەوە زیادەڕەوی دەکرد، تـاوا لێهات پـێش کاتی تایبەتی خۆی نویژی عەسریان لەگەڵ نوێژی نیوەڕۆ دەکردو، هەمیشە پێش کاتی تایبەتی خۆی نویژی عیشایان لـەگـەڵ مـەغریب دەکرد)) [١].

ئیبن تەیمیە قسەی لەسەر ئـەمـە کـردووەو هـەڵـەی هـەردوولای دیاری کردووەو، جەختی لەوە کردۆتەوە کەبەهۆی پوچەڵەوە حەق سەرناخرێت و، سوننە بەبیدعە سەرناکـەوێت و، دەڵێت: (( بیدعـەو ئارەزوو لەزیادبووندا بوو، تا شتی وا ڕوویدا کەقسەلـەسر کردنی درێـژە دەکیـشێت، وەک ئـەوەی زۆرێـک لـەموتـەئـەخـرین دایانهێنـا ئـەویـش ڕۆژی عاشـورا بـوو: کـەسـانێک (لـەشـیعەکـان) دەیـانکردە ماتــەمبــاری وتێیــدا شــیوەن و گریــان و، لــەخــۆدان و، ســتەم لـەگیانلـەبـەران دەکـراو... کـەسـانێکی بـەنـاو سـونیش فـەرمـوودەی (موضـوع)یـان بـۆ گێڕدرابوویـەوەو دەیانگێڕایـەوەو، شـتی وایـان لەسەر بونیات نابوو کـەلـە ڕۆژەدا بوبـوو بـەدروشـمیان، نـەیارێتی دروشمی ئەوانیان پێدەکرد، بەمـەش بـەپوچـەڵ ڕووبـەڕوی پوچـەڵ و، بەبیدعە وەڵامی بیدعەیان دەدایەوە)) [٢].

پێشەوا نەسائی خاوەنی (سنن) (ڕەحمـەتـی خـوای لێبێت) بـووە قوربانی ئەم کاردانانەوەو کوژرا، چونکـە کتێبێکی دانـابوو بـەنـاوی

---

[1] ـ منهاج السنة ٢٠١/٦.

[2] ـ مجموع الفتاوى ٥١١/٤-٥١٣.

(الخصائص) سەبارەت بەفەزڵی عەلی کوری ئەبوتاڵب، لەکاتێکدا نەسائی شیعە نەبووە، بەڵکو پێشەوایەک بوو لەپێشەواکانی سونەو، پشتی بەگێڕانەوە درۆکانی نەدەبەست لەوەی کەدەیگێڕایەوە لەفەرموودەکانیدا سەبارەت بەفەزڵی عەلی، بەڵکو ((شتیکی زۆری لەوانە کۆکردبووەوە کەسەنەدەکانی زۆریان چاک بوو)) هەروەک ئیبن حەجەر وتوویەتی[1]، بەڵام هەموو ئەوانە نەبونە تکاکار بۆی: ((دارقطنی دەڵێت: نەسائی بۆ حەج چوویە دەرەوەو، بەدیمەشقدا تێپەڕی، سەبارەت بەفەزڵی معاویەی کوری ئەبو سوفیان پرسیاری لیکرا، وتی: ئیا معاویە سەربەسەر ڕازی نیە تا بەباش بزانرێت؟(الا یرضی راسا برأس حتی یفضل؟...) بەردەوامبوون لەلێدانی (فی خصصیە) هەتا لەمزگەوت کردیانە دەرەوەو، بەهۆی ئەوەوە نەخۆش کەوت، وتی: هەڵمبگرن وبەرەو مەککەم ببەن و، لەوێ وەفاتی کرد)) [2].

خۆ ئەگەر ئەو کاردانەوەیە تەنها لەلای هەندێک لەخەڵکی ڕەشۆکی ئەهلی سونە دەربکەوتایە ئەوا کارەکە ئاسان دەبوو، بەڵام لەوە دەرچوبوو گەیشتبووە هەندێک لەزانایان و، ئەمەش وایکردبوو لێیان هەڵەی زەقی زانستی ئەنجام بدەن، تووشی دەمەدەمێ ومشتومڕی کردبوون، لەو هەڵانە ئەوەی پیشتر باسمان کرد لەئارەزووی لاوازکردنی فەرموودەی صەحیح و بەصەحیح دانانی لاوازو بێدەنگبوون لەسەر گێڕانەوە پوچەڵەکان، وەک پشتیوانی لەبۆچونێک کەویژدانیان پێی ئاسوودە بوو، با هیچ

---

[1] ـ الاصابة ٢/٥٠١.

[2] ـ الامام النسائي: فضائل الصحابة ص٤٠ لەپێشەکی لێکۆڵەری کتێبەکە د. فاروق حمادة.

سەنەدێکیشی نەبووبێت، دەتوانین لێرەدا نمونەی تریش بخەینە ڕوو:

**یەکەم:** تۆمەتبارکردنی زانایانێکی پایەبەرز بەبەشیعەبوون و ڕەتکردنەوەی ستەم، لەمبارەیەوە هەندێک کەس پێشەوای ڕاقەکاران محەمەدی کوڕی جەریری تەبەریان بەشیعەبوون تۆمەتبار کرد بەهۆی راستکردنەوەی فەرموودەی (غدير خم): ((من كنت مولاه فعلي مولاه))، هەرچەندە ئەم فەرموودەیە ژمارەیەک لەهاوەڵان گێڕاویانەتەوە لەنێویاندا زەیدی کوڕی ئەرقەم، بەرائی کوڕی عازب و، بریدەو، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و، ئەبو ئەیوب و، ئیبن عەباس و، خودی عەلی [1]و زۆرێک لەزانایان هێناویانە، لەوانە: ئەحمەد وئیبن ماجەو حاکم وترمذی وئیبن ئەبی شەیبەو نەسائی وئیبن حبان [2] بەڕێگای جۆراوجۆر هەموویان (صحيح وحسن)ن هەروەک ئیبن حەجەر وتوویەتی [3]و، ئیبن حەجەر ئەوەشی بۆ زیاد دەکات: ((ئیبن جەریری تەبەری لەکتێبێکدا چەند هێندەی ئەوەی باسکرا تێدایە ئەبو عەباسی کوڕی عقدە گرنگی بەکۆکردنەوەی داوەو ڕاستی کردۆتەوەو، لەفەرمودەی حەفتا هاوەڵەوە هێناویەتی)) [4]، دواتر ئاشکرابوو ئەو تۆمەتەی درابوویە پاڵ ئیبن تەیمیە هەڵویستی مەزهەبی لەپشتەوە بوو، هیچ پەیوەندیەکی نەبوو بەبەرگری لەهاوەڵان، یاخود بەلێکۆڵینەوەی زانستی لەفەرموودەدا، ئەمەش بەهۆی ئەوە بوو

---

[1] ـ بڕوانە: سير أعلام النبلاء ٣٢٨/١٩ پەراوێزی ژمارە ١.

[2] ـ بڕوانە: أحمد ٨٤/١و ابن ماجة ٤٥/١ والحاكم ١١٩/٣ والترمذي ٦٣٣/٥ وابن ابي شيبة ٦٣٣/٦ والنسائي ١٣٠/٥ وابن حبان ٣٧٦/١٥.

[3] ـ فتح الباري ٧٤/٧.

[4] ـ ابن حجر: تهذيب التهذيب ٢٩٤/٧.

کەتەبری کتێبێکی کۆکردبوەوە تییدا باسی ناکۆکییە فیقهیەکانی کردبوو، هیچ باسی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی تیدا نەکردبوو، ئەوەی پێ وترا، لەوەلامدا وتی: ئەو فەقیهـ نەبووە، بەڵکو فەرموودەناس بووە، حەنبەلیەکان ئەوەیان زۆر پێناخۆش بوو، وەک دەمارگیرییەک بۆ پێشەواکەیان دەستیان کرد بەتانەلێدانی و تۆمەتباریان دەکرد بەڕافزی وشیعەبوون، لەبەر ئەوە بوو ئیبن خزیمە وتی: تەبەری ((حەنبەلیەکان ستەمیان لێکرد)) [1]، پێشەوا تەبەری کۆتا زانا نەبوو بەستەم وزیادەڕەوی تۆمەتی شیعەبوونی بدرێتە پاڵ، گەورە زانایانی تری سونە بەهەمان شێوە تۆمەتبار کران، لەوانە (دار القطني و حاكم و نسائي وابن عبدالبر).

هیندە بەسە کەپێشەوا شافعی بەستەم تۆمەتی شیعەبوونی دراوەتە پاڵ لەبەر ئەوەی هەندێ کاری دەکردو وایدەبینی کەئەمە لەسونەتەوەیەو لەگەڵ کاری شیعەدا یەکی دەگرتەوە، وەک وتنی (بسم الله) بەدەنگی بەرز ((بەهۆی ئەمەوە هەندێک کەس قسەیان لەبارەی شافعیەوە کردو، بەهۆی قنوتیشەوە و، دابویانە پاڵ قسەی ڕافزیەکان)) [2].

**دووەم:** حەرامکردنی هەندێک کار کەشەرع حەلاڵی کردووە یاخود ڕێگەی پێداوە، تەنها لەبەر ئەوەی سەرپێچی شیعەبوو، ئەمەش هەڵەیەکەو زۆرێک وەک کاردانەوە تێی کەوتن، بەلام ئیبن تەیمیە - دەستی گرتبوو بەمەنهەجی هاوسەنگی ومیانگیریەوە- ئەوەی ڕەتکردەوە، دەڵێت: ((کەپێشەوایانمانی لەسەر بوو کەئەوەی ڕەوا بوو تەنها بەهۆی کاری ئەهلی بیدعەوە وازی لێناهێنرێت،

---

[1] ـ بڕوانە الذهبي: سير أعلام النبلاء ٢٧٣/١٤ وابن حجر: لسان الميزان ١٠٢/٥ والخطيب: تاريخ بغداد ١٦٤/٢.

[2] ـ منهاج السنة ١٥٠/٤.

نەشیعەو نەجگە لەوان و، بنچینەی پێشەواکان (چوار پێشەواکە) هەموویان لەگەڵ ئەمەدا یەکدەگرێتەوە)) [1]، پاشان نمونەی فیقهی لەسەر ئەمە هێناوەتەوە:

- (تسنيم القبور)قوچەکبوونی گۆڕ لای ئەبو حەنیفەو ئەحمەد.
- وتنی بسم الله بەدەنگی بەرزو قنوت لای شافیعی.
- لاوازکردنی مەسحی خوف لەئاوەدانیدا لای مالیک.
- سەڵاواتدان لەسەر جگە لەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لای ئەبو حەنیفە.

ئەمە لەکاتێکدا بوو کەشیعەکان بەوکارانە بەناوبانگ بوون هەتا وایلێهات هەندێک لەسوونەکان ڕقیان لەوە بوو، بەڵام ئیبن تەیمیە ئەو رق لێبوونەی بەبێ هۆ دەزانی، بەتایبەت ئەگەر لەهەڵویستێکی نەیارەوە گۆڕا بۆ فەتوایەکی هەمیشەیی، راڤەی ئەمە دەکات و دەڵێت: ئەگەر کارێکی بەباشزانراو (مستحب) خراپەیەکی زیاتری لێدەکەوتەوە ئەوا بە باشزانراوی نامێنێتەوە، لێرەوە هەندێک لەزانایان بۆ ئەوە چوون واز لەهەندێک بەباشزانراو (مستحب) بهێنرێت ئەگەر (شیعە) کردبوویانە دروشمیان بەوە وازی لەواجبێک نەهێناوە، بەڵام وتوویەتی: لەدەرخستنی ئەوەدا وەک هاوشێوە بوونیان، ئەوا سونەو شیعە هیچ جیاوازییەکیان نیەو، بەرژەوەندی جیابوونەوەش لایان مەزنترە لەبەرژەوەندی ئەو بەباشزانراوە، ئەوەی ئەم بۆی چووبوو پێویستی بەهەندێک بابەت هەیە ئەگەر لەتێکەڵکردن و لێتێکچووندا خراپەیەکی زیاتر هەبوو

---

[1] ـ منهاج السنة ٤/١٥٠.

بەسەر ئەنجامدانی ئەو بەباشزانراوەدا، بەڵام ئەم کارە لەناکاوە (عارض)ە، پیویستی بەوە نیە رەوا بەهەمیشەیی بکرێتە ناڕەوا)) [١].

ئیبن تەیمیە سەبارەت بەرەتکردنەوەی تەواوی شوێنکەوتنی ئەو کاردانەوانە لەلایەن پێشەوا ئەحمەدەوە دەگێڕێتەوە: ((سەلمەی کوڕی شەبیب بەپێشەوا ئەحمەدی وت: ئەی باویکی عبداللە، دڵی شیعەکانت بەهێز کرد، کاتێ فەتوات بۆ خەڵکی خوراسان دا بەمتعە (حەج؟) وتی: ئەی سەلمە، لەبارەی تۆوە پێم دەگەیشتەوە کەگەمژەیەت، ئێستاش وا لای من سەلماندت کەگەمژەیت، من یازدە فەرموودەی صەحیحم لایە لەپێغەمبەرەوە (صلی اللە علیە وسلم) لەبەر قسەی تۆ وازیان لێبهێنم؟!)) [٢].

دواتر بەویستی خوا نمونەی تر لەسەر ((شیعەگەریی سونە) لەکتێبی (العواصم من القواصم)ی ئیبن عەرەبی دەهێنینەوە.

کارەکە هەرچۆن بێت، خۆ دەربازکردن لەکاردانەوە پێویستیەکی شەرعی ومەنهەجییە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو ناکۆکییانەدا بەشێوەیەکی زانستی بەویژدانانە، کەمافی کەسەکان پارێزراو بێت و، حەقی حەقیش بپارێزێت.

---

[1] ـ منهاج السنة ١٥٤/٤-١٥٥.

[2] ـ منهاج السنة ١٥٢/٤.

## ڕێسای سیازدەیەم

## تێگەیشتن لەسروستی تێکەڵی ئاشوبە سیاسیەکان

## (ادراك الطبيعة المركبة للفتن السياسية)

لەهۆکارەکانی وردی سەرنجی ئیبن تەیمیە لەم خاڵەدا کەزۆرکەس گشتاندنیان تێدا کردووە، بریتییە لەتێگەیشتنی لەسروشتی بەیەکداچووی ئاشوب و، کاریگەری هەریەک لەئارەزوو و گومانەکان تێیدا، بەمجۆرە شرۆڤەی ئەمە دەکات ودەڵێت: ((خوای گەورە محەمەد (صلى الله عليه وسلم)ی بەرێنمایی و ئاینی حەقەوە نارد، بەهۆی هیدایەتەوە حەق دەناسرێت و، ئاینی حەقیش مەبەستی کاری چاکەیە و بەوە کار پێدەکرێت، لەبەر ئەوە دەبێت هەرکەس حەقی ناسی و کردیە ئامانج، توانای بەسەریدا بشکێت.

ئاشوبیش لەمەدا پێچەوانەیە: چونکە رێگرە لەناسینی حەق یاخود ئامانجەکەی یان توانا شکان بەسەریدا، لەبەر ئەوە گومانی وەهای تێدایە کەحەق تێکەڵی پوچەڵ دەکات تا بۆ زۆرێک لەخەڵکی یاخود زۆربەیان لێک جیانەکرێنەوەو، حەزو ئارەزووەکانی بەجۆرێک تێدایە کەبۆتە ڕێگری لەئامانج وویستی حەق و، دەرکەوتنی خراپەکاری بەجۆرێک لەخۆ گرتووە کەتوانای چاکە لاواز بکات)) [1].

گرنگترین هۆکارەکانی ئاشوبی سیاسیش بەتێڕوانینی ئیبن تەیمیە بریتییە لەستەمی سیاسی و، گەورەترین خۆپارێزیش لێی بریتییە لەڕاوەستان لەدژی ستەمکاری و، بدەستی ستەمکار

---

[1] ـ منهاج السنة ٥٤٧/٤-٥٤٨.

لەسەرەتاوە بگیرێت بەر لەوەی کارەکە توند ببێت لەدەستی پیاوچاکان دەربچێت، خوای گەورە دەفەرموویێت: ((وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً)) [1]، ئیبن تەیمیە بەجۆرێک راڤەی ئەم ئایەتەی کردووە کەخزمەت بەم واتایە بکات ودەڵێت: ((ستەمکار کەستەم دەکات و خەڵکی دوچاری ئاشوبێک دەبن ئەوانەش دەگرێتەوە کەستەمیان لێ نەکراوە، ئەو کاتە دەستەوسان دەمێننەوەو توانا رەتکردنەوەیان نابێت، بەپێچەوانەی ئەوەی ئەگەر لەسەرەتاوە رێگری لەستەمکارەکە بکرایە، ئەو کاتە هۆکاری ئاشوبەکە نەدەهێڵرا)) [2].

بەهۆی ئەم تێڕوانیە ئاوێتەبوەوە، ئیبن تەیمیە دوور کەوتۆتەوە لەئاسانکاری وسەیرکردنی یەکلایەنەی ڕاستیە شێوێنراوەکان و، وەبە تێڕوانینێکی هەمەلایەن سەیری کاروبارەکانی کردووەو، لەڕێی ئاڵۆزکاری وتێکەڵبوونیانەوە تیگەیشتووە کە: لەکاتێکدا هەندێک کەس وا ڕاڤەی –بۆ نمونە- کوژرانی عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت) دەکەن کەیەک هۆکاری هەبووە، ئەویش پلانگێڕی جولەکەکان یاخود ئاگرپەرستەکان یا جگە لەوان بووە، ئیبن تەیمیە بەکۆمەڵێک هۆکاری بەیەکدا چوو لێکی دەداتەوە: لەوانە خۆشەویستی دونیا لای بکوژەکان ولای هەندێک لەخزمەکانی عوسمان وفەرمانڕەواکانی، لەوانە واقیعی کۆمەڵایەتی گۆڕاو وکاریگەری زۆربوونی سامان لەسەری و، کەسێتی عوسمان کەزۆر یەکلاکەرەوە نەبوو، لەگەڵ هەندێک هەڵەی سیاسی کەلەماوەی کۆتایی خەلافەتەکەیدا کەڵەکە بوبوو، ئیبن تەیمیە

---

[1] ـ سورەتی الانفال، ئایەتی ٢٥.

[2] ـ منهاج السنة ٣٢٣/٤.

دەڵێت: ((بەڵام عوسمان لەسەر ئەو کارەی کەپێشتربەئارامی وخۆڕاگری وڕێنوێنی و بەزەیی و ڕێز دامەزرابوو کاری دەکردو، هەمان هێزی عومەرو سیاسەتی ئەوی نەبوو، هەمان تەواومەندی دادپەروەری ئەو و دونیانەویستی ئەوی تێدا نەبوو، لەبەر ئەوە هەندێک لەچاوچنۆکان چاویان تێبڕیبوو، بەفراوانی باوەشیان بەدونیادا کردو، هەندێک لەخزمەکانیشی کردبووە والی وسەرپەرشتی دارایی و، بەهۆی بوونی خزمانی والی و سەرپەرشتی داراییەوە زۆر کار رویدا کەنارەزایەتی هەبوو لەسەریان، لەدونیا ویستی هەندێک خەڵک و، لاوازی ترسیان لەخوا و، لەخەلیفەو، لەلاوازی ئەو و، ئەوەی بەهۆی خزمەکانیەوە کەوالی وبەرپرسی دارایی بوون ڕوویدا، ئاشوبەکەی پێویست کرد، تا بەستەملێکراوی شەهیدکرا)) [١]، لەبابەتێکی تریشدا دەڵێت: ((لەکاتی کۆتایی خەلافەتی عوسماندا گۆڕانکاری و فراوانی دونیاویستی زیادی کردو، جۆرەها کار ڕویاندا کەلەسەردەمی عومەردا نەبوون، بەهۆی ئەوەوە ناکۆکی کەوتە دڵەکانەوە تابەوە گەیشت عوسمان کوژرا)) [٢].

لێکدانەوەی ئیبن تەیمیە بۆ عومسان لەسەر بنەمای ئاراستەی سیاسەتەکانی عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت)و، پێشخستنی خزمانی بۆ والێتی وسەرپەرشتی دارایی نیە، بەڵکو لەسەر ئەو بنەمایەیە کە: ((عوسمانی کوڕی عەفان (خوا لێی ڕازی بێت) تەوبەیەکی ڕوکاری لەو کاروبارانە کردبوو کەنارەزایەتیان لێی هەبوو وا دەردەکەوت کەباش نیە، ئەمەش لەعوسمانەوە (خوا لێی ڕازی بێت

---

[1] ـ منهاج السنة ٤٥٢/٧.

[2] ـ مجموع الفتاوى ١٥٨/١٤.

وڕازی بکـات) گـوازراوەتـەوە)) [1]، (( لـەئیبـراهیم – واتـە کـوڕی عبدالرحمانی کوڕی عەوف- دەڵێت: عوسمان وتی: ((ئەگەر لەکتێبی خـوای گـەورەدا بینیتـان قـاچم بخـەنـە نـاو کۆتـە وبـەنـدەوە ئـەوا بیخەن)) [2].

بەڵام ئەوانەی لەسروشتی تێکەڵبووی ئاشـوب تێنـەگـەیشتبوون ئەوا ڕێگایەکی یەک ئاڕاستەیان لـەڕاڤـەو، ئاسـانکاری لـەوەصـف و، گشتاندن لـەحوکمـەکانـدا گرتبـووە بـەر: شـیعە سـەرنجیـان تـەنهـا لەسـەر لایەنی حەزو ئـارەزوو (شـهوة)یـە لـەئاشـوبەکـەداو، هـەمـوو شتێکیان لـەڕێی ئـەوەوە لێکداوەتـەوەو، نیـەتی هـەمـووان – دیـارە جگـە لـەئالوبـەیـت-یـان پـێ تۆمـەتبـار کـردووەو تانـەیـان لێـداون وزیادەڕۆییان کردووە بەرانبەریان، هەندێک لەوانەشی کەڕووبەڕوی شـیعە بوونـەتـەوە لـەئـەهلـی سـوننە –لـەوانـەی پابـەنـد نـەبـوون بەمەنهەجی زانین ودادپەروەرییـەوە- تـەنهـا لـەسـەر لایـەنـی حـەزو ئـارەزوو کورتیـان کردۆتـەوەو، زیـادەڕەوی زۆریـان لـەخۆیـان کردووە بۆ گونجاندن و لێکدانـەوەی بـەشـێوەیـەکی وا ئاسـانکراوە کەخۆی وا ئاسان نیەو، پاساویان بەشتی واداوە کەهیچ پاساوێکی بـۆ نیـە، بـەجۆرێـک کـەلای ئیـبن عـەرەبـی گـەیشتبووە ئاسـتێک لێکدانەوە بۆ بکوژانی حوسـەیـن وخانـەوادەکـەی دەکـات، هـەروەک دواتر دیبینین.

[1] ـ منهاج السنة ٢٠٨/٦.

[2] ـ مجمع الزوائد ٢٢٧/٧، هیثمی دەڵێت: ((عبداللـە کوڕی ئـەحمـەد گێڕاویـەتیـەوەو پیاوەکانی متمانەپێکراون)).

## ڕێسای چواردەیەم

## جەختکردن لەسەر هۆکارە نێوخۆییەکان

## (التركيز على العوامل الداخليه)

زۆرێک لەپێشین و هاوچەرخەکانیش ئەو ڕێبازەیان گرتۆتە بەر کەئاشوبەکە بەهۆی هۆکارە دەرەکیەکان ڕاڤە بکەن، مەبەست تیۆری پلانگێڕی (نظرية التامر)ە، بێئاگا لەگرنگترین ئەو هۆکارانەی کەبۆتە هۆی ئاشوبەکە، کەئەویش هۆکارە نێوخۆییەکانە کەلەناوخۆی کۆمەڵگایە ئیسلامی سەرەتادا هەبوون، ئەو کەسانە لەکەسێتی عبدالله کوڕی سەبەئدا باشترین لێکدانەوەیان بۆ ئەوەی کەڕوویداوە دۆزیوەتەوە، بەڵام ئەوانە لەیادیان کردووە کەبەو کارەیان لەتوانای هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) کەم دەکەنەوە - کەهەست بەوە ناکەن- کاتێک لەشێوەی کۆمەڵێک کەسی بێئاگادا وێنایان دەکەن کەکەسێکی جولەکەی نەناسراوی بێ ئەسڵ ونەسەب یاریان پێدەکات و، پاڵیان پێوە دەنێت بۆ کوشتنی یەکتر بەبێ ئاگایی یان بەنەزانیان، هەروەها مێژوویی ئیسلامی دەگۆڕن بۆ ئەفسانە، لەبری ئەوەی بیکەن بەمێژوویی مرۆڤ کەئەوانیش لەگۆشت وخوێن بوون، کەسی عاقڵ چۆن باوەڕ دەکات کەئەو هاوەڵانەی دەوڵەتی ئیسلامییان دامەزراندو، گەورەترین سوپای جیهانیان بەزاندو، تەختی کیسراو قەیسەریان تیکشکاند، چۆن هەڵخەڵەتاوێکی جولەکە دەتوانێت تا ئەو ڕادەیە یاری بەعەقڵیان بکات، لەگەڵ ئەمەشدا کەسانی وا هەیە کەئەم شێوە خستنە ڕووە بەنیەت پاکیەوە دەخاتەڕوو، لەترسی ڕوبەڕووبوونەوەی حەقیقەتە تاڵەکە، بەڵام بیردۆزەی پلانگێڕی خۆ ڕاناگرێت و، زۆرجار خاوەنانی ناچار دەبن پەنا بۆ کاری خەیاڵی وگریمانە ببەن

لەپێناوی پڕ کردنەوەی کەلێنەکانی، لەبری ئەوەی ڕاڤەی جەنگی (صفین) بەهۆکارە حەقیقیەکانی لێک بدەنەوە کەچاوچنۆکی دەسەڵات بوو لای معاویەو عەمرو، بەزاندنی سنووری شەرع بوو لەخوێنڕێژی وتاوانکاریدا لەو ڕێگەوەی کەداوای تۆڵەی خوێنی عوسمانیان دەکردو، پاشان ڕەتکردنەوەیان بۆ ئەو ئاشتەواییەی کەئەبو موسای ئەشعەری ویستی و فەرمانکردن بە عبداللە کوڕی عومەر بەداماڵینی هەریەک لەعەلی و معاویە، زۆرکەس هەوڵ دەدەن پێکهێنەری پلانگێڕ لەنێو هەردوو سەربازگەکەدا بدۆزنەوە کەئەو بەرپرس بێت لەهەموو شتێک.

پێش کەمێک بینیمان ئیبن تەیمیە چۆن کوشتنی عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت) بەهۆکاری ناوخۆیی لێکدایەوە، کەهەموویان بۆ ئاسانکاری دەوڵەت و، ئەو ڕەفتارو گۆڕانکاریانەی بەسەر کۆمەڵگادا هات، بەبێ ئەوەی لەنزیک یان دوور ئاماژە بۆ ئیبن سەبەئو جگە لەو لەپێکهێنەرە دەرەکیەکان بکات، ئەوەتا ئێمە لێرەدا پوختەیەکی هۆکارەکانی عوسمان وەک ئەوەی ئیبن حەجەر باسی کردووە دەخەینە ڕوو، دەبینین کەچۆن ئیبن حەجەر ئەو هۆکارانەی لەپاڵنەرە ناوخۆییەکاندا قەتیس کردووەو، پوختەی خستنە ڕووەکەی لەباسکردنی ئیبن سەبەئو جگە لەو لەپێکهێنەرەکانی بیردۆزەی پلانگێڕی کەزۆرکەس پەناگەیەکی ئارامیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ڕاستیانەی ڕوویاندا تێدا بینیوەتەوەو، شوین ئەو گریمانانە کەوتوون کەوا لەموسڵمانان ناکات لەمێژوویان تێبگەن وپەندی لێ وەربگرن، ئیبن حەجەر دەڵێت: ((هۆکاری کوشتنی ئەوە بوو فەرمانڕەوای ناوچەکان لەخزمانی بوون: معاویە لەشام بوو، سەعیدی کوڕی عاص لەبەصرەو، سەعدی کوڕی ئەبو سەراح لەمیسرو، عبداللە کوڕی

عامر لەخوراسان و، ئەو کەسانەی (لەموسڵمانانی ئەو ناوچانەوە) بۆ حەج هاتبوو سکاڵایان هەبوو لەفەرمانڕەواکانیان و، عوسمانیش سروشتی نەرم ونیان وزۆر چاکەکارو ئارامگر بوو، هەندێک لەفەرمانڕەواکانی دەگۆڕی ورازی دەکردن، پاشان دواتر دەیگێڕایەوە بۆ سەر کار، تاگەیشتە ئەوەی خەڵکی میسر سکاڵایان بوو لەدەستی ئیبن ئەبی سەراح، ئەمیش هەستا بەلابرنی ولەجێگەیدا فەرمانیدا محەمەدی کوڕی ئەبوبەکری صدیق دابنرێت، ئەوانیش بەوە ڕازی بوون، کاتێ لەڕێگادا بوون دەگەڕانەوە سوارێکیان بینی بەسواری وڵاخەکەیەوە بوو هەواڵی ئەوەیان پێدا، ئەویش هەواڵی ئەوەی پێدان کەلەلای عوسمانەوە نێردراوەو ئیبن ئەبی سەراح لەجێگەی خۆی هێڵراوەتەوەو، سزای کۆمەڵێک لەپیاوەدیارەکانیان دەدرێت، ئەوانیش بەنوسراوەکەوە گەڕانەوەو ڕووبەڕوی عوسمان بوونەوە، سوێندی خوارد نەهیچی نووسیوەو نەمۆڵەتیشی داوە، وتیان نوسراوی خۆتمان بدەرێ، ترسی کوژرانی هەبوو لێیان، لەو کاتەشدا کاتبەکەی مەروانی کوڕی حەکەم بوو کەئامۆزای بوو، ئەوانیش تورەبوون ولەماڵەکەی خۆیدا گەمارۆیانداو، ژمارەیەک کەسیش کۆبوونەوە پارێزگاریان لێدەکرد، عوسمان ڕێگری دەکرد لێیان لەشەڕکردن، تا ماڵ بەماڵ کەوتنە شوێنی تاچوونە ماڵەکەی و کوشتیان)) [١]، ئیبن حەجەر دەڵێت: ((توندترین هۆکاری کوشتنی عوسمان ناڕازیبوون بوو لەوالییەکانی، پاشان لەخۆی بەوەی ئەوانەی داناوە)) [٢]، قسەکانی ئیبن حەجەر لێرەدا لەبارەی چاکەی عوسمان و نەرم ونیانی

---

[1] ـ الاصابة ٤٥٨/٤.

[2] ـ فتح الباري ١٣/١٣.

سروشتیەوە، بریتییە لەدارِشتنێکی پاکخوانەی ئەوەی پێشتر ئیبن تەیمیە بە((لاوازی عوسمان))و نەترسانی خەڵک لێی ناوی بردبوو.

لەڕاستیدا هەرکەس ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بخوێنێتەوە کەدەفەرموویێت: ((هلكة أمتي على يدى غلمة من قريش)) [1]، واتە: (لەناوچوونی ئومەتەکەم لەسەر دەستی کەسانێکی قورەیش دەبێت)، هیچ پێویستی بەزۆرلەخۆکردن نیە بۆ دۆزینەوەی راڤەی پلانگێڕی دەرەکی بۆ ئەو ئاشوبە سیاسیانەی کەلەو قۆناغە مێژووییەدا ڕوویدا.

## ڕێسای پازدەیەم

## خۆدوورگرتن لەڕنگپێدانی بیروباوەڕی بە ناکۆکییە لاوەکیەکان

## (اجتناب الصياغة الاعتقادية للخلافات الفرعية)

زۆرێک لەپێشین زیادەڕۆییان کردووە لەدارِشتنەوەی ناکۆکییەکانیان لەگەڵ بیدعەچیەکاندا بەرەنگپیدانێکی عەقیدەیی ((تەنانەت سوفیانی سەوری وجگە لەو لەپێشەوایان لەبیروباوەڕەکەیاندا باس وازهێنان لەوتنی (بسم الله) بەدەنگی بەرزیان کردووە، چونکە ئەوان بەدروشمی ڕافزیەکانیان دادەنا، هەروەک باس دەکەن (لەبیروباوەڕەکانیاندا) باسی مەسحی خوفیان کردووە، چونکە وازلێهێنانی دروشمێک بوە لەدروشمەکانی ڕافزیەکان)) [2]، ئەمەش تەنها کاردانەوەیکی زیادرۆیانەیە، ناتوانین ئەوەی لەسەر بونیات بنێین کەلەعەقیدە دابڕاوە.

---

[1] ـ البخاري ٢٩٨٥/٣.

[2] ـ منهاج السنة ١٥١/٤.

لەبەر ئەوە بووە پێشەوا شافعی ئەو ڕێگایەی ڕەت کردەوەو، ڕایگەیاند هەرشتێک بسەلمینرێت لەپێغەمبەرەوەیە(صلی الله علیەوسلم) ئەوە ڕێبازی ئەمە، بائەو شتە لەگەڵ ڕەفتاری شیعەو جگە لەشیعەشدا یەکبگرێتەوەو، لەم پێناوەدا شافعی بەرگەی باجی ئەو تۆمەتە پوچەڵەی گرت، بەڵکو هەر چوار پێشەواکە هەروەک پێشتر لەقسەکانی ئیبن تەیمیەدا ڕوونمان کردەووە ئەو ڕێبازەیان ڕەت کردەوە.

لەڕاستیدا هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) دوورترین کەس بوون لەگەورەکردنی ناکۆکییە لاوەکییەکان، یاخود گۆڕینیان بۆ بابەتی عەقیدەیی:

((لەتاریقی کوڕی شهابەوە دەگێڕنەوە کە خالیدی کوڕی وەلید لەگەڵ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصدا قسە کەوتبووە نێوانیان، لای سەعد باسی خالید کرا (بەخراپە)، وتی: بەسە! ئەوەی لەنێوانماندایە نەگەیشتۆتە ئاینەکەمان)) [1].

ئەم چیرۆکەش دەخەمە ڕوو کەبوخاری لەصەحیحەکەیدا هێناویەتیەوە: ((ئەبو موساو ئەبو مەسعود چوونە لای عەمار ئەو کاتەی عەلی ناردی بۆ لای خەڵکی کوفە تا ئامادەییان بکات بۆشەڕو، پێیان وت: ((لەوەتەی موسڵمان بوویت نەمانبینیووە کارێک بکەیت لای ئێمە بێزراوتر بێت وەک پەلەکردنت لەم کارەدا (واتە پەلەپەلیت لەئامادەسازیی خەڵک بۆ شەڕ))، عەماریش وتی: ((لەوەتەی موسڵمان بوون کارێکی وام لێ نەبینیوون لام بێزراوتر بێت لەم خاوەخاویەتان لەم کارەدا (مەبەست پەلەنەکردنە

---

[1] ـ مجمع الزوائد ٢٢٣/٧ وهیثی وتویەتی: ((تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو پیاوەکانی پیاوی صحیحن.

لەپشتیوانی پێشەوای حەق)، دوو پۆشاکی (ئیبن مەسعود) وەک یەکی پێدان، پاشان چوون بۆ مزگەوت))[1].

ببینە ئەدەبی ناکۆکی چۆن بووە لەکارێکدا کەهەڵگرتنی چەک و شەڕکردنی لەسەر بونیات دەنرا، چۆن هیچ لایەک تۆمەتی عەقیدەیی نەدەدایە پاڵ لای بەرانبەری.

((لەئەبی بوختەریشەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: سەبارەت بەئەهلی (جمل) پرسیار کرا لەعەلی (خوا لێی ڕازی بێت) ئایا ئەوانە هاوبەشبڕیاردەر (مشرک)ن؟ وتی: ئەوانە لەهاوبەش بڕیاردان هەڵهاتوون، وترا: ئایا ئەوانە دووڕوون؟ وتی: دووڕوەکان بەکەمی ناوی خوا دەهێنن، وترا: ئەی باشە ئەوا چین؟ وتی: برامانن زیادەڕەویان کردووە لەسەرمان))[2]، لەگێڕانەوەیەکی تردا: ((لەعبدالخیرەوە وتی: لەبارەی ئەهلی (جمل)ەوە پرسیار لەعەلی (خوا لێی ڕازی بێت) کرا وتی: برامانن زیادەڕەویان کردووە لەسەرمان وئێمەش لەگەڵیان جەنگاین و، گەڕانەوەو ئێمەش لێمان قبوڵکردن))[3].

هەروەها ((لەعاصمی کوڕی کلیب، لەباوکیەوە گێڕاویەتیەوە، دەڵێت: گەڕاینەوە لای عەلی (خوا لێی ڕازی بێت)، باسی عائیشە کرا، وتی: خۆشەویستی پێغەمبەری خوا بوو (صلى الله عليه وسلم)، زەهەبی پاش هێنانی ئەم قسەیە دەڵێت: ((ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنە... ئەمەش قسەی ئەمیری باوەڕدارانە بەرانبەر عائیشە وێڕای ئەوەی کەلەنێوانیاندا ڕوویدا، خوای گەورە

---

[1] ـ صحيح البخاري ٢٦٠١/٦.
[2] ـ البيهقي ١٧٣/٨ وابن أبى شيبة ٥٣٥/٧.
[3] ـ البيهقي ١٨٢/٨.

لەهەردووکیان ڕازی بێت)) [1]. بەهەمانشێوە لەسەربردەیەکی دورودرێژدا سەبارەت بەئەهلی (صفین) هاتووە کەکاتێ شمشێرەکانیان داناو ماڵئاواییان لەرۆژانی شەڕ کرد ((بەرەی ئەملا ئەچوونە سەربازگەی بەرەی ئەولا، هەروەها ئەوانیش ئەهاتنە سەربازگەی ئەمان)) [2]، هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) کە لەدژی یەک جەنگاون ڕووکاری بێباوەڕی وئیمانیان نەداوەتە ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوانیان، بۆیە لەسەر توێژەران پێویستە پابەندبن بەمەوەو، تێکەڵی دروست نەکەن لەنێوان وەحی و مێژوودا، چونکە جوان باسکردن وا لەلێکۆڵەری ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان –نێوان موسڵمانان بەگشتی- دەخوازێت کەسنوورێک بۆ دابڕان لەنێوان هەمەکییەکانی بیروباوەڕ (کلیات العقیدة) ولقەکانی ئاین (فروع الدین)دا دابنێت و، لقەکان نەگۆڕێت بۆ بنەڕەت (أصل)و، بکەوێتە زیادەڕەوییەوەو، لەڕێ لابدات.

## ڕیسای شازدەیەم
## دوورکەوتنەوەی لەمەنهەجی ترساندن و گشتاندن
## (الابتعاد عن منهج التهويل والتعميم)

پیشتر باسی تێگەیشتنی ئیبن تەیمیەمان لەئاڵۆزییەکانی ئەم بابەتەو سروشتە تێکەڵبووەکەی کرد، هەرکەس لەوە تێبگات دەبێت سنگی فراوان بێت بۆ قبوڵکردنی ڕاڤەی جۆراوجۆر سەبارەت بەوەی کەڕوویداوە، هەندێکیان بەولایەدا دەچن لێکدانەوەو پاساوی

---

[1] ـ سير أعلام النبلاء ١٧٦/٣.

[2] ـ مستدرک الحاکم ٤٣٦/٣ ومجمع الزوائد ٢٤٠/٧ وهیثمي وتوویەتی: تەبەرانی بەکورتی گێڕاویەتیەوەو ئەبو یعلی بەنزیک لەتەبەرانی گێڕاویەتیەوەو، بەزازیش ...پیاوەکانی ئەحمەدو ئەبی یعلی متمانەپێکراون.

بۆ بهێننەوە، هەندێکیشیان بەلای ڕاشکاوی وڕەخنەگرتندا دەچن، بەهۆی ئەوەی هەمووان فەزڵی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) لەبەرچاو دەگرن و، پشت بەمەنهەجێکی زانستی دەبەستن لەخستنە روویدا، بەڵام زۆرێکیش لەوانەی لەو قۆناغەیان کۆڵیوەتەوە ویستیان بەلای ترساندن و گشتاندندا چووە: هۆشداری و هەڕەشە دەدەن و، گێڕانەوەی صەحیح ڕەت دەکەنەوەو، دەقو قسە دەهێننەوەو، خۆیان بێئاگا دەکەن لەدەقی ترو، لەکاروبارانێکدا کەجێی ناکۆکیین قسەیان یەکلا دەکەنەوە، لەجێیەکدا داوای کۆدەنگی دەکەن کەشوێنی خۆی نیە.

زۆرکەس لەئەهلی عیلم بەم لادانە مەنهەجیە بەناوبانگ بووە، نەک تەنها لەلێکۆڵینەوەیاندا لەمێژوویی سیاسی موسڵمان، بەڵکو تەنانەت لەهەڵوێستە فیقهیەکانیشیاندا، لەوانە لەزانایانی مالکی ئیبن عبدالبر وەک ئەو کۆدەنگیانەی کەگوازتویەتیەوەو، ئیبن رشد لەوەی کەدەیگوازێتەوە لەهاودەنگبوون، لەبەر ئەوە (نابغەی شەنقیتی) لەهۆنراوەیەکیدا سەبارەت بەپشت (معتمد) لەدانراوەکانی مالکیەکان وقسەکانیان وتوویەتی:

**(وحذر الشيوخ من اجماع**

**عن ابن عبدالبر ذی السماع**

**وحذروا أيضا من اتفاق**

**عن ابن رشد عالم الافاق)** [1]

ئەوەی لەنوسراوەکانی زانایانیکی بەناوبانگی وەک پێشەوا نەوەوی و ئیبن حەزم (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) ڕابمینێت تێدەگات کەویستیان بەلای ڕەهایی و یەکلاکردنەوەو گوازتنەوەی کۆدەنگی

---

[1] ـ لەدەستنوسێکیدا کەلای نووسەرە.

–تەنها کۆدەنگی زانایان نا، بەڵکو کۆدەنگی ئومەت–دا بوو لەو کاروبارانەی کەناکۆکیی تەواوی لەسەر بوو بەهۆی دژیەکی بەڵگەکانەوە، ئەمەش ئەو قوتابیانەی کەسەرەتای خویندنیان بوو قسەکانی ئەوانیان دەخوێندەوە لەخۆ بایی دەکردو، لەبەرانبەر ئەوەدا کەدژی بوو عەقڵی لەدەست دەدا.

دواتر باسی ڕەخنەی ئیبن حەجەر لەسەر ئەبوبەکری ئیبن عەرەبی دەکەین لەسەر ترساندن وگشتاندن و، هەندێک شوینەواری خراپی مەنهەجی ئیبن عەرەبی لەخوێندنەوەی لێکۆڵینەوە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان.

بەڵام شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە خۆی دوور دەگرێت لەم لادانە مەنهەجییە، چونکە لەڕادەی هاوسەنگی و میانگیری کەجەختی لەسەر کردۆتەوە دەردەچێت، ئەو زیاتر لەکەسانی تر تێدەگات کەکۆمەڵی ئەهلی سوننە لەو ناکۆکییە سیاسیانەی لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویانداوە لێکدانەوە (تەئویلیان) بۆ دەکەن، ئەویش لەوەی کەلێکدانەوە هەڵبگرێت لێکدانەوەی بۆ کردوون، بەڵام بەزمانێکی حەدی ڕەهایی نا، ناشی گوازێتەوە بۆ بابەتێکی عەقیدەیی، وەک ئەوەی زۆرێک لەڕبردوو ئێستادا ئەنجامیاندا، بەڵکو دەڵێت: ((سوودەکەی: ئەوەی کەپێویستە بزانرێت کە هەرچەندە باشتر وایە قسە نەکرێت سەبارەت بەوەی لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویداوەو داوای لێخۆشبوون بۆ تێکڕای هەردوولایان ولایەنگرانیان بکرێت، بەڵام لەگەل ئەوەدا پێویست نیە لەو باوەڕەدا بین کەهەر یەک لەسەربازەکان وەک زانایان موجەتەهیدێکی تەئویلکار نەبووە، بەڵکو تێیاندا بووە گوناهبارو خراپەکار بووە، هەیانبووە کەمتەرخەم بووەو ئیجتیهاد بەپێی ویستی خۆی کردووە، بەڵام

ئەگەر خراپیەک لەگەڵ چاکەی زۆردا بێت ئەوا لێخۆشبوون لێی خوازراوە)) [1].

هەرکەس خوێندنەوە بۆ هەڵوێستی ئەهلی سوننە بکات سەبارەت بەئاشوبەکان، ئەوا تەنها یەک ڕێباز نابینێت، وەک ئەوەی خاوەنانی ترساندن وگشتاندن دەیانەوێت قەناعەتمان پێ بکەن، بەڵکو لانی کەم پێنج ڕێباز بەرچاو دەکەوێت:

١- ڕێبازی ئەوانەی بەڕەهایی قسە لەسەر ناکۆکییەکان ناکەن، موتەکەلمینی ئەهلی سوننە لەسەر ئەم ڕێبازەن، ئەمانە لەخەڵکی کەمتر لەبارەی ئەم بابەتەوە دەنوسن، هەرچەند زۆر حەزیان لەمشتومڕەو قسەزانن لەبابەتی تردا.

٢- ڕێبازی بانگەشەکاران بۆ قسەنەکردن لەبارەیەوە، لەگەڵ قسەکردنیان لەسەری، وەک زەهەبی لە ((مێژوویی ئیسلام))و ((سیر أعلام النبلاء))و ئیبن کەسیر لە((البداية والنهاية))دا، ئەم باسکردنەی خۆیان بەوە ڕێگە پێدەدەن کەبۆمەبەستی زانستییە، یاخود ئامانج لەقسەکردنیان لەبارەیەوە بەشێوەی لۆمەکردن و سەرزەنشت نیە.

٣- ڕێبازی ئەوانەی قسەی لەسەر دەکەن لەگەڵ تەئویلکردن بۆ هەموو لایەنەکان بەوەی هەردوولایان موجتەهیدەو پاداشتی بۆ هەیە، ئەمەش ڕێبازێکی بەناوبانگی بڵاوە بەدرێژایی سەدەکان کۆمەڵی پێشەوایان پەیڕەوییان لێ کردووە، بەتایبەت ئەوانەی شارەزاییان نیە لەپاشینەی ڕووداوەکان و مەبەستەکانیان.

٤- ڕێبازی ئەوانەی قسەیان بەبێ تەئویل تیدا کردووە، لەپەیڕەوکارانی هەندێک لەزانایانی شوێنکەوتووان دەرکەوتن وەک

---

[1] ـ مجموع الفتاوى ٤٣٤/٤.

حەسەنی بەسری و رەبیعی کوڕی نافع وجگە لەوان... هەر ئەمـەیـە کەئیبن تـەیمیـە بـەم وتـەیـەی ئامـاژەی بـۆ کـردووە: ((سـوودەکـەی: ئەوەی پێویستە بزانرێت...)).

٥- کەمەبەستی زیادەڕۆیی لـەبـەرگری لێکردن و، هەڵچوون بـەکاردانـەوە و، تـەئویلکـار بـۆ هـاوەڵ و جگـە لـەهـاوەڵ، بـەڕەواو بەناڕەوا، ئەمەیە ناو لێناوە ((شیعەگەریی سوننی))و، ئیبن عـەرەبی وقوتابیە هاوچەرخەکانی نوێنەرایەتی دەکەن.

ئەم ڕێبازەی کۆتاییان لەئەمڕۆدا لەهەموویان دەنگی بڵند تـرەو، هاوارکردنی بەهێزتـرە، لـەبـەر هۆکـاری سیاسـی و مـەزهـەبی زۆر کەئێرە بواری قسە کردن نیە لەسەریان، هەروەها نەفامی خـەڵکانی ئـەم ئومـەتـە لـەبـارەی مێژووییانـەوە لـەم سـەردەمـەدا بـەردەوامـی دەکات.

بـەڵام شـێخی ئیـسلام ئیـبن تـەیمیـە، خـۆی پابـەنـد نـەکـردووە بـەمـەزهـەبێکـی دیـاریکراوەوە، بـەڵکـو بـەئـەزموونـەوە لـەبابـەتـەکـە دواوەو، لەهەندێک جێگادا -بەزۆری بەبێ زۆر لەخۆکردن- تەئویل دەکـات و، ڕەخنـەی ڕاشـکاوانە لـەجێگـای دیکـەدا دەگرێـت و، مـافی کەسەکان و مافی مافیش دەدات. هـەروەهـا خـۆی بـەدوور گرتـووە لەگشتاندن و ترساندن و، سوور بووە لەسەر ئەوەی حەق بەهـۆی بــەتاڵــەوە ســەرنــەخــات، یــاخود بــەبیدعــە وەڵامــی بیدعــە نەداتەوە...بائەمە ببێتە ڕیبازی ئەو لێکۆڵەرانـەی بـەشـوێنی ڕاسـتیدا دەگەڕێن.

## ڕێسای حەڤدەیەم
## جیاکاریی لەنێوان لەپێشان وجگە لە لەپێشاندا
## (التمییز بین السابقین وغیر السابقین)

دوورکەوتنەوەی ئیبن تەیمیە لەشێوازی گشتاندن و ئاسانکردن وای لێکردووە لەڕوانگەی جیاکاریی لەنێوان لەپێشان (سابقین) و جگە لەوان مامەڵە لەگەڵ ئاشوبدا بکات، ئەو ویستی بەلای ئەوەدایە پشت بەو وتەیە ببەستێت کەجەنگی (جمل) کوشتاری ئاشوب بووەو، جەنگی (صفین) جەنگی نێوان خەڵکانی زیادەڕۆکارو دادپەروەر بووە.

لەبەر ئەوە پابەندە بەتەئویلکردن بۆ سەرکردەکانی سوپای (جمل): عائیشەو تەڵحەو زوبیر، بەڵام سەرکردەکانی سوپای شام لە(صفین)دا وەک معاویەو عەمر ئەوا هەندێکجار تەئویلیان بۆ دەکات و، هەندێکجاریش نایکات و، ڕێبازی جۆراوجۆری ئەهلی سوننە لەبارەیانەوە دەگێڕێتەوە، پاشان دەڵێت: ((ئەمە لەجەنگی خەڵکی شامدا، فەرمودەکان بەڵگەن کەجەنگی (جمل) ئاشوبەو، وازهێنان لەشەڕکردن تێیدا لەپێشترە، دەقەکانی ئەحمەدو زۆربەی ئەهلی سوننە لەسەر ئەمەیە)) [1].

ئەم جیاکارییە لەباش شارەزایی ئیبن تەیمیەو وردی تێگەیشتنیەوەیە، چونکە سەرکردەکانی سوپای (جمل) لەو گەورانە بوون کەلەپێشبوون و، پاکانە بۆکرانیان لەسەر زاری پێغەمبەر خواوە (صلی الله علیە وسلم) چەسپاوە، ئەمەش وادەکات

---

[1] ـ مجموع الفتاوی ٥١/٣٥.

جەنگەکەیان بەویستی کەسیی کارێکی قبوڵکراو نەبێت، لەنمونەی ئەم پاکانە فەرمودەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بەتەڵحە: ((من سره أن ينظر الى شهيد يمشى على وجه الارض فلينظر الى طلحة بن عبيدالله))، واتە: ((هەرکەس پێی خۆشە شەهیدێک ببینێت کەبەسەر زەویدا دەڕوات باسەیری تەڵحەی کوڕی عبیداللە بکات)) [١]، هەروەها قسەکەی ڕۆژی ئوحودی لەبارەیەوە: (( أوجب طلحة)) [٢]، واتە: تەڵحە بەهەشتی بۆ دابینکرا.

هەروەها فەرمودەی لەبارەی زوبیر: ((لكل نبى حوارى، وحوارى الزوبير)) [٣]، واتە: (هەموو پێغەمبەرێک حەواری هەبووە، حەواری منیش زوبەیرە)، بەهەمانشێوە فەرموویەتی: ((فداك أبى وأمى)) [٤]، واتە: (باوک ودایکم فیدات بن)، ئەو فەرمودەیەشی کاتێک ((لەسەر (کێوی) حەرا بوو لەرزی: فەرمووی: ((اسكن حراء، فما عليك الا نبى أوصديق أوشهيد))، واتە: ((مەجوڵێ ئەی حەرا، تەنها پێغەمبەرو صدیق و شەهیدت لەسەرە))، لەکاتەدا ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و تەڵحەو زوبیر (لەگەڵیدا) لەسەر کێوەکە بوون)) [٥]، سەبارەت بەعەلی هێندەی لەبارەوە هاتووە خستنە ڕووی هەموویان ئەستەمە، لەمبارەیەوە نسائی ئەوانەی کۆکردۆتەوەو کتێبێکی داناوە ((لەوانە شتێکی زۆری بەسەنەدەوە

---

[1] ـ الالباني: صحيح سنن الترمذى ٦٤٤/٥.

[2] ـ صحيح ابن حبان ٤٣٦/١٥ ومستدرک الحاكم ٢٨/٣ والترمذي ٢٠١/٤ وصححه الحاكم والالباني.

[3] ـ صحيح البخاري ٢٦٥٠/٦ وصحيح مسلم ١٨٧٩/٤.

[4] ـ صحيح البخاري ١٣٦٢/٣.

[5] ـ صحيح مسلم ١٨٨٠/٤.

کەزۆربەیان سەنەدەکەیان باشە کۆکردۆتەوە)) [١]، بەڵام عائیشە ئەوا لەپاش پیاهەڵدانی خوای گەورە لەبارەیەوە هیچ پیاهەڵدانێکی تر نیە.

ئەوە لەپێشانە بەبێ ئەوەی بەرهەمی دونیایی شەڕەکانیان بەدەست بهێنن گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە ئیدی چۆن دەتوانرێت تۆمەتبارێک بێت و تۆمەت بداتە پاڵ نیەتیان، ئەوانەشیان پاش جەنگ بەزیندوویی مابوونەوە -وەک عائیشە- پاشگەزبوویەوەو داوای لێخۆشبوونی کردو، ڕایگەیاند هەڵە بووەو تۆبەی کرد، عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) ((هەرکاتێ باسی دەرچوونەکەی بکرایە دەگریا هەتا سەرپۆشەکەی تەڕ دەبوو)) [٢].

هێنانی ئەو دەقانە گوزارشتن لەفەزڵی ئەو لەپێشانەو باشترین یارمەتیدەرە بۆ لێکۆڵەری بەویژدان تالەمەبەستی ئەوانەو نیەتەکانیان تێ بگات.

لەبەر ئەوە شێخی ئیسلام پابەند بووە بەتەئویلکردن سەبارەت بەو جەنگەی کەلەنێوانیاندا بەرپا بووە.

بەتەنها پێگەی سەرکردەکانی جەنگی (جمل)و پێشینەیان هۆکاری نیە بۆ ئەوەی ئیبن تەیمیە تەئویلیان بۆ بکات –لەکاتێکدا ئیبن تەیمیە ڕوونی کردۆتەوە کەڕقی لەهیینەوپەڕۆیە لەتەئویلکردندا تەنانەت بۆ پێشینیش- بەڵکو بەهۆی بوونی دەقی زۆری دیکەوە کەبەڵگەن لەسەر نیەت باشیان کەمەبەست لەدەرچوونیان بەرەو عێراق هیچ بەرژەوەندییەکی دونیایی نەبووە لەبەر ئەوە تەئویلی بۆ کردوون، لەوانە:

---

[1] ـ ابن حجر: الاصابة ٥٠١/٢.

[2] ـ الذهبي: المنتقى ص ٢٣٦.

١- ((کاتێ عائیشە ڕۆشت (واتە بەرەو بەسرە چوو) کەگەیشتە ئاوی بەنی عامر سەگەکان وەڕین، وتی: ئەمە کام ئاوەیە؟ وتیان: ئاوی (حەوئاب)ە، وتی: وا گومان دەبەم کەمن دەگەڕێمەوە. هەندێک لەوانەی کەلەگەڵی بوون وتیان: نەخێر بەرەوپێش دەڕۆین و، موسڵمانان دەتبینن و خوای گەورە نێوانیان چاک دەکات. وتی: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (کیف باحداکن تنبح علیها کلاب الحوأب؟))[1]، واتە: ئەو ڕۆژە کەسێکتان چۆن دەبێت کەسەگەکانی حەوئاب لێی دەوەڕێت؟ لەگێڕانەوەیەکی تردا ئەوکەسەی ئەوەی پێ وت زوبیر بوو[2].

٢- ((لەمحەمەدی کوڕی قەیسەوە، وتویەتی: باسی ڕۆژی (جمل) کرا بۆ عائیشە، وتی: بۆ خەڵکی دەڵێن ڕۆژی (جمل)؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ئاواتەخواز بووم منیش وەک هاوەڵەکان کەدانیشتن دابنیشتمایە، ئەوە لام خۆشەویستر بوو (لەوەی) کە دەیان منالّم لەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ببوایە، کەهەموویان وەک عبدالرحمانی کوڕی حارس کوڕی هاشم و وەک عبداللە کوڕی زوبیر بوونایە)) [3]، و((عائیشە -لەکاتێکدا لەگەڵ خۆی دەدوا کە لەماڵەکەی خۆیدا بنێژرێت- (لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و خەلیفەکەیدا) عائیشە وتی: من پاش پێغەمبەری خوا (صلی

---

[1] ـ فەرموودەیەکی صەحیحە، بڕوانە: سیرأعلام النبلاء ٢/١٧٧-١٧٨.

[2] ـ مجمع الزوائد ٢٣٤/٧، هیثی دەڵێت: ئەحمەدو ئەبویعلی و بزاز گێڕاویانەتەوەو پیاوەکانی ئەحمەد صحیحن.

[3] ـ مجمع الزوائد ٢٣٨/٧، هیثمی دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو، ئەبو نجیحی تێدایە کەلاوازەو فەرموودەکەی نوسیوەتەوەو، ئەوانەی تر کەگێڕاویانەتەوە متمانەپێکراون.

الله عليه وسلم) كارێكم ئەنجامدا، لەگەڵ هاوسەرەكانیدا بمنێژن، ئەوە بوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) لەبەقیع نێژرا)) [١]، زەهەبی وتوویەتی: ((وتم: مەبەستی لەڕووداوەكە ڕۆشتنی ڕۆژی (جمل) بوو، ئەو بەتەواوی لەوە پەشیمان بوو، تۆبەی لێ كرد، كەئەو تەنها بۆ مەبەستی چاك دەرچوو بوو، هەروەک تەڵحەی كوڕی عبیدالله و زوبیری كوڕی عوام وژمارەیەک لەگەورە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) هەموویان ئیجتیهادیان كرد)) [٢]، لەشوێنێكی تردا دەڵێت: ((گومانی تێدا نیە كەعائیشە تەواو دڵگران وپەشیمان بوو لەسەر ڕۆشتنتی بۆ بەسرەو ئامادەبوونی لەڕۆژی (جمل)داو، وا گومانی نەدەبرد كارەكە بگاتە ئەو ئاستە)) [٣].

٣- ((لەئیبن عەباسەوە دەگێڕنەوە كەڕۆژی (جمل) بەزوبیری وتووە: كوڕی صەفیە، ئەوە عائیشەیە خاوەنی موڵكی تەڵحەیە، باشە ئەی تۆ لەبەر چی شەڕ لەگەڵ خزمەكەت دەكەیت بۆی، ئیبن شەهاب ئەوەی بۆ زیاد كردووە: زوبیر گەڕایەوە، ئیبن جرموزی پێگەیشت و زوبیری كوشت)) [٤].((لەجون كوڕی قتادەوە دەڵێت: لەڕۆژی (جمل)دا لەگەڵ زوبیر بووم، وەک سەركردەیان سڵاویان لێدەكرد، تا وتی: ئیبن جرموز دووبارە برینداری كردو كەوت و، لەدۆڵی سوباع نێژراو، عەلی (خوا لێی ڕازی بێت)و هاوەڵەكانی لەسەری گریان)) [٥]، هەندێک نیشاندەر هەن كەزوبیر (خوا لێی

---

[1] ـ صححه الحاكم ووافقه الذهبي، سير أعلام النبلاء ١٩٣/٢ (پەراوێز).
[2] ـ سير أعلام النبلاء ١٩٣/٢.
[3] ـ سير أعلام النبلاء ١٧٧/٢.
[4] ـ صححه ابن حجر، بڕوانە: سير أعلام النبلاء ٥٩/١ (پەراوێز).
[5] ـ ئەوانەی گێڕاویانەتەوە متمانە پێكراون، بڕوانە: سير أعلام النبلاء ٦١/١ (پەراوێز).

ڕازی بێت) تەنانەت پێش شەڕەکەش پەشیمان بوو لەچوونی بۆ ئەویّ: ((لە موترِەفەوە، دەڵێت: بەزوبیرمان (حوا لێی ڕازی بێت) وت: ئەی باوکی عبدالله، چی تۆی هێناوە؟ وازتان لەخەلیفە هێنا هەتا کوژرا، پاشان هاتوون داوای خوێنەکەی دەکە.

زوبیر (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم)و ئەبوبەکرو عومەرو عوسماندا (خوا لێیان ڕازی بێت) ئەم ئایەتەمان: ((وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً)) وا خوێندەوە، کەوامان نەدەزانی ئێمە بەشێک بین لێی، هەتا ئەوەی کەبەسەرمان هات ڕوویدا)) [1].

٤- ((لەقەیس کوڕی سەعد کوڕی عوبادەوە، وتویەتی: لەرۆژی (جمل)دا گوێم لەعەلی بوو بەحەسەنی کوڕی دەوت: ((ئەی حەسەن، خۆزگە بیست ساڵ پێشتر بمردمایە)) [2]، ((لەتەڵحەی کوڕی مصرفەوە دەگێڕنەوە کەعەلی چووە سەر تەڵحەی کوڕی عبيدالله لەکاتێکدا مردبوو، لەوڵاخەکەی دابەزی و، دانیشت و، تەپ وتۆزی سەر ڕوخسارو ڕیشی دەسڕییەوەو دڵی بۆی دەسوتاو، دەیوت: بریا بیست ساڵ بەر لەم رۆژە بمردمایە)) [3].

---

[1] ـ احمد ١٦٥/١، هیثمی وتوویەتی: ((ئەحمەد بەدوو سەنەد گێڕاویەتیەوە، گێڕەوەکانی یەکێکیان صەحیحن)) مجمع الزوائد ٢٧/٧ و، مقدسي: الاحاديث المختارة ٦٦/٣، لیکۆڵەرەکەشی کەعبدالملک بن دهیشە وتوویەتی: (اسنادە حسن)،و ذهبي:سير أعلام النبلاء ٥٧/١، لێکۆڵەری کتێبەکەش شعیب ئەنرنائوت وتویەتی: (سندە صحیح).

[2] ـ تەبەرانی هێناویەتی و شێخ شعیب ئەرنائوتی وتوویەتی: ((ئەوانەی گێڕاویانەتەوە متمانەپێکراون و، هەیسەمی وتویەتی سەنەدەکەی باشە))، بڕوانە: سير أعلام النبلاء ٣٧/١ ومجمع الزوائد ١٥٠/٩.

[3] ـ مجمع الزوائد ١٥٠/٩، هیثمی وتویەتی: تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو سەنەدەکەی صەحیحە.

لەگێڕانەوەیەکیشدا: ((لەشعبیەوە، وتوویەتی: عەلی تەڵحەی بینی لەدۆڵێکدا کەوتبوو، لەولاخەکەی دابەزی و تەپ وتۆزی سەر ڕوخساری سڕی و وتی: باوکی محەمەد، ئازیزی لەلام کەئەتبینم لەدۆڵەکانداو لەژێر ئەستێرەکاندا کەوتوویت، سکاڵای بێدەسەڵاتی ولاوازم بۆ لای خوای گەورە دەبەم)) [1].

لەم دەقانەوە ئاشکرا دەبێت کەعائیشەی دایکی باوەڕداران لەکاتێکدا لەڕێگادا بووە بەرەو بەسرە هەستی بەهەڵە کردووەو، لەپێناوی چاککردنی نێوانیاندا لەڕۆشتن بەردەوام بووە، هیچ کەس ناتوانێت تۆمەتی ویستنی سەرکردایەتی ئومەتی بداتە پاڵ، هەروەها ڕوونە کەپێش جەنگەکە زوبیر پەشیمان بۆتەوەوگەڕاوەتەوەو، عەلیش لەجەنگەکە پەشیمان بووەو لەسەر کوژراوانی لایەنی بەرانبەری گریاوەو، ئەو شەڕە سەرەتاو کۆتایی کوشتاری ئاشوب بووە ((کوشتاری ئاشوبیش وەک کوشتاری سەردەمی نەفامییە، کەمەبەستی خەڵکەکەی و بیروباوەڕەکانیان یەکناگرێتەوە)) [2]،هەروەک ئیبن تەیمیە بەڕاستی وتوویەتی.

لێرەوەیە ئیبن تەیمیە تەئویلی بۆ ئەو پێشینانە کردووە کەبەشداری شەڕی (جمل)یان کردووەو، دەڵێت: ((عائیشە بەشداری شەڕی نەکردو، بۆ شەڕ دەرنەچوو، بەڵکو بەئامانجی ئاشتەوایی لەنێوان موسڵماناندا ڕۆشت و، وای گومان برد کەچوونەکەی بەرژەوەندی موسڵمانانی تێدایە، پاشان دواتر بۆی دەرکەوت کەدەرنەچوون باشتر بوو، لەبەر ئەوە بوو هەرکاتێ باسی ئەو دەرچوونەی بکرایە دەگریا هەتا سەرپۆشەکەی تەڕ دەبوو،

[1] ـ سير أعلام النبلاء ٣٦/١.
[2] ـ منهاج السنه ٤٦٨/٤.

بەمجۆرە تێکڕای پێشینەکان پەشیمان بوون لەو جەنگەی تێی گەوتن، ئەوە بوو تەڵحەو زوبیرو عەلی (خوا لەهەموویان ڕازی بێت) پەشیمان بوون، لەرۆژی (جمل)دا ئەوانە مەبەستیان کوشتار نەبوو، بەڵام بەدەر لەویستی ئەوان شەر ڕوویدا، ئەوەبوو کاتێ عەلی وتەڵحەو زوبیر بەمەبەستی ڕێککەوتن لەسەر بەرژەوەندی پەیوەندییان بەیەکەوە کردو، ئەوان ئەگەر توانیان ئەوا داوای بکوژانی عوسمان دەکەن لەئاشوب گێڕەکان، لەڕاستیدا عەلی نە بەکوشتنی عوسمان ڕازی بووە، نەئاگاداریشی بووە... بکوژەکان مەترسی ئەوەیان بۆ پەیدا بوو کەعەلی لەگەڵ ئەوان ڕێک بکەوێت بۆ گرتنی بکوژەکان، هەربۆیە پەلاماری سەربازگەی تەڵحەو زوبیریاندا، تەڵحەو زوبیر وا گومانیان برد کەعەلی پەلاماری داون و ناچاربوون بەرگریان لەخۆیان کرد، بەوشێوەیە ئاشوبەکە بەدەر لەویستی ئەوان ڕوویدا)) [1]، هەروەها دەڵێت: ((بەڵام ئەو جەنگەی کەلەنێوان تەڵحەو زوبیر لەگەڵ عەلیدا هەبوو، هەریەکەیان لەخۆیەوە دەجەنگا وای گومان دەبرد کەشاڵاوی بەرانبەری بۆ سەر خۆی دوور دەخاتەوە: عەلی هیچ ئامانجێکی نەبوو لەشەرکردنیدا لەگەڵیان، ئەوانیش ئامانجیان نەبووە لەشەڕ کردن بەرانبەری، بەڵکو پێش هاتنی عەلی داوای بکوژانی عوسمانیان دەکرد، بکوژەکانیش لەنێو هۆزەکانیاندا کەسانێک هەبوو بەرگریان لێ بکات، بۆیە نەیانتوانی بیانگرن، کاتێ عەلی هات و مەبەستی خۆیان بۆ ڕوون کردەوە، ئاگاداری کردن کەئەویش هەمان بۆچوونی هەیە، بەڵام هەتا کاروبارەکان ڕێکنەخرێن ناتوانێت ئەوە

[1] ـ منهاج السنه ٤/٣١٦-٣١٧، و(المنتقى) ص ٤١٩-٤٢٠، تیبینی شیکردنەوەی لای ئیبن حجر بکە: فتح الباري ٥٧/١٣).

بکات، کاتێ هەندێک لەبکوژەکان ئەوەیان زانی هێرش کرایە سەر سەربازگەیەکیان، ئەوانەی تر واهەستیان کرد کەئەوان دەستیان بەشەڕ کردووە، ئیتر بەویستی ئاشوبگێڕەکان شەڕەکە هەڵگیرسا، نەکە خواستی پێشینەکان، پاشان شەڕ لەسەر دەسەڵات ڕوویدا)) [١]،شێخی ئیسلام دەڵێت: ((عەلی نەیدەتوانی –لەکاتیکدا خەڵک پەرتەوازەیە- بکوژانی عوسمان بگرێت مەگەر بەئاشوبێک کەشەڕو بەڵای گەوورەتر بێت، هەربۆیە پابەندبوون بەکەمترین خراپیانەوە لای ئەو لەپێشتر بوو لەڕوودانی خراپترینی خراپیەکان دوور بخاتەوە نەک بەپێچەوانەوە، چونکە ئەوان جەنگاوەر بوون و، هۆزەکانیان لەپشت بوو کەلەسەریان دەهاتنە وەڵام، ئەوانەی دەویسترا بکوژرێن –با کەمیش بووبن- ئەوا کەسانێکی بەهێزیان لەپشت بوو، ئەگەر ئەوە نەبوایە ئەوا نەیاندەتوانی)) [٢]، قسەی بدرالدین عەلائیش بەهەمانشێوە: ((ئەگەر (عەلی) یەکێکیانی بگرتایە ئەوا هۆزەکانیان هەموویان کۆدەبووەنەوەو، ئاشوبەکە گەورەتر و، کوشت وکوشتاریش زیاتر دەبوو)) [٣].

ئیبن تەیمیە تەئویلی بۆ عائیشەو تەڵحەو زوبیر لەجۆری تەئویلی بۆ عوسمان بووە (خوا لەهەموویان ڕازی بێت) ئەو سیاسەتەکانی عوسمانی لەپێشخستنی خزم وکەس وکاردا بۆ پۆستەکان وسەرپەرشتی دارایی بەڕاست نەزانیووە- وەک ئەوەی زۆرلەخۆکارانی ئەمڕۆ دەیکەن- بەڵکو بەئاشکرا وتوویەتی: ((ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین کەعوسمان (خوا لێی ڕازی بێت) بەنی ئومەیەی خۆش ویستووە و، دەسەڵاتی پێدەسپاردن وسامانی زۆری

---

[1] ـ منهاج السنة ٣٣٩/٦.

[2] ـ منهاج السنة ٤٠٧/٤.

[3] ـ العلائي: تحقيق منيف الرتبة لمن ثبت له شرف الصحبة ص١٠٣.

پێدەدان))[1]، ((بەڵی! زۆری دەبەخشیە خزمە نزیکەکانی و، بەڵام بەجگە لەخزمەکانیشی دەبەخشی، ئەو چاکەبەخش بوو بەرانبەر هەموو موسڵمانان))[2]، ((عوسمان لەسەرەتای خەلافەتەکەیدا هیچیان بەرانبەری بۆ نەکرا، بەڵام لەساڵانی دواییدا زۆر شتیان بەرانبەر کرد، هەندێکیان ئەوان بیانوویان هەیە تێیدا، زۆریشیان عوسمان بیانووی هەیە تییدا))[3]، بەڵام ئیبن تەیمیە ئەوە روون دەکاتەوە کەعوسمان (خوا لێی ڕازی بێت) بەستەملێکراوی شەهید کرا، هەموو ئەوەی کردبووی پاساوی ئەوەی نەدەدا خوێنی پاکی بڕژێت، هەروەها لێرەدا دەرچوونی ئەو گەورانەی سەرکردەی سوپای (جمل)ی بەرانبەر پێشەوای شەرعی و، پەلەکردنیان لەداواکردنی خوێنی عوسمان بەشێوەی تۆڵەسەندنەوەی سەردەمی نەفامی بەڕاست نەزانیووە، لەبری ئەوە دەبوو ڕێز بگرن ڕێکارە شەرعییەکانی بەرزکردنەوەی داوا بۆ لای حاکم و، دەرچوونی بڕیاری کۆتایی، پاشان جیبەجێکردنی حوکمەکە لەلایەن دەسەڵاتی شەرعییەوە.. بەڵام ئیبن تەیمیە ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کەئەو کەسەی نیەتی ئەو گەورە هاوەڵانە تۆمەتبار دەکات ستەمکارو دەستدرێژیکارە پاش ئەوەی کەنیەت پاکی و بەویژدانی و، خۆشویستیان بۆ خوداو پێغەمبەرکەی و، هەستکردنیان بەگوناهباری لەسەر دەرچوونیان بەرانبەر کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواکەیان سەلمێنرا.

بەڵام سەرکردەکانی سوپای شام لە(صفین)دا خاوەنی ئەو پێشینەو پێگەیە نین، بەرهەمی ڕاوەستانیشیان بەرانبەر عەلی

---

[1] ـ منهاج السنة ٣٥٦/٦.
[2] ـ منهاج السنة ٢٤٩/٦.
[3] ـ منهاج السنة ٢٥٢/٦.

بەدەستهێنا کەپاشایەتی بوو بۆ ماوەی چەندین ساڵ درێژەی کیشا، بەڵکو نەوەو منالی نەوەکانیان بۆ چەندین ساڵ بەمیراتی بۆیان بەجێما، ئیبن تەیمیە ناکۆکی نێوان زانایان دەگێڕێتەوە لەسەر گونجاندنی کوشتاری شەوانی (صفين)و، دەڵێت: ((لەڕاستیدا کوشتارەکە کوشتاری ئاشوب بوو لای زۆرێک لەزانایان و، لای زۆریشیان لەڕوانگەی شەڕی ئەهلی دادپەروەری و کەسانی زیادەڕەوکار بووە)) [1]، لەپێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) فەرموودە گێڕدراوەتەوە کەئەو مانایە دەدات کەبێگومان خەڵکی شام زیادەڕەوکار بوون، کاتێ بەعەماری کوری یاسری فەرموو: ((تقتله الفئة الباغية)) [2]، ئەمەش فەرموودەیەکی (موتەواترە)، گێڕانەوەکەی بوخاریش لەبارەی فەرمودەکەوە هیچ نارۆشنییەک سەبارەت بەزیادەڕەوی خەلکی شام لەو جەنگەدا ناهیڵێت، تێیدا هاتووە: ((ويح عمار، تقتله الفئة الباغية، يدعوهم الى الجنة ويدعونه الى النار)) [3]، واتە: (ئای بۆ عەمار، دەستەیەکی زیادەڕەوکار دەیکوژن، ئەم بانگیان دەکات بۆ بەهەشت و ئەوان بانگی دەکەن بۆ ناو ئاگر)، بەهۆی بڵاوی ئەم فەرموودەیەوە، عەمار ڕوناککەرەوەی حەقە بۆ هەرکەس کەرووداوی ئاشوبەکەی لا شێواو بێت، هەتا ئیبن عیمادی حەنبەلی وتوویەتی کە((عەماری کوڕی یاسر تەرازووی دادپەروەرییە لەو جەنگانەدا)) [4].

---

[1] ـ منهاج السنة ٣٢٨/٦ و بەراوردی بکە لەگەڵ مجموع الفتاوى ٤٤٤/٤.

[2] ـ لەو فەرموودانەیە کە بوخاری ١٧٢/١و ابن حبان ٥٥٤/١٥و حاکم ١٦٢/٢وبيهقى ١٩٨/٨و نسائى ١٥٥/٥و ابن ابى شيبة ٥٤٨/٧ واحمد ٢٠٦/٢ وجگە لەوان هێناویانە.

[3] ـ البخاري ١٧٢/١.

[4] ـ ابن العماد: شذرات الذهب ٢١٣/١.

لەبەر ئەوەیە ئیبن تەیمیە -هەندێکجار- ویستی بەلای ئەوەدایە تەئویل بۆ سەرکردەکانی سوپای شام لە (صفین)دا نەکات، بەلام ئەوەی زاڵە بەسەریدا بریتییە لەزۆرلەخۆ کردن بۆ تەئویل بۆیان و، ئەو زۆرلەخۆکردنە بۆ بەرگری لەسەرکردەکانی شام لە (صفین)دا -بەتایبەت معاویە- لەخاڵە سەرەکییەکانی لاوازی شیکاری ئیبن تەیمیەیە، هەروەک دواتر لە((تێبینیەکان لەسەر مەنهەجی ئیبن تەیمیە)) ڕوونی دەکەینەوە کەپاش ئەم ڕێسایانە دێت.

## ڕێسای هەژدەیەم

## دوورکەوتنەوە لەزۆرلەخۆکردن لەبەرزکردنەوەو تەئویل بۆکردن

## (اجتناب التکلف فی التأول والتأویل)

دەروازەی تەئویلکردن دەرگایەکی فراوانەو لادان لەعەقیدەو لەشەریعەتیش لێیەوە هاتوون، چونکە دەبێتە هۆی لێکدانەوەی ئەوەی لێکدانەوە هەڵناگرێت و، ئاسانکاری لەکارە گەورەکاندا، تەئویلکردنی زیانبەخش تەنها ئەوەیان نیە کەپەیوەستە بەعەقیدەوە، وەک ئەوەی ئەمڕۆ هەندێک وا لێی تێدەگەن، بەڵکو دەروازەی (تأول و تأویل) تەئویل زیاندەگەیەنێت بەتەعالیمەکانی ئیسلام، ئیبن تەیمیە (ڕحمەتی خوای لێبێت) بەتەنها لەم فەرموودە فراوانەدا زیان وخراپەکاریەکانی تەئویلی ڕوون کردۆتەوەو، دەڵێت: ((.. بەگشتی جیابوونەوەی پەیڕەوانی دوو کتێبەکەو جیابوونەوەی ئەم ئومەتە بەسەر حەفتاو سێ دەستەدا تەئویلکردن پێویستی کردووەو، خوێنی موسڵمانان ئەمڕۆ لە (صفین) و(جمل)و (حرە)و (ئاشوبی ئیبن زوبیر) و(هلم) بەهۆی تەئویلەوە بووە، بگرە دوژمنانی ئیسلام لەفەلسفەخوازان و قەرامیتەو باتنیەو ئیسماعلیەکان و نصیریە

لەدەرگای تەئویلەوە هاتوون، موسڵمانان بەهەر نارەحەتیەک تاقی کرابنەوە هۆکارەکەی تەئویل بووە، نارەحەتیەکە یان ئەوەتا بەهۆی تەئویلکارانەوەیە یاخود بەهۆی ئەو تەئویلانەی کردوویانەوە لەڕوکاری ئیسلام لایانداوەو خۆیان بەپوچەڵەکانەوە بەستۆتەوەو بێباوەڕان بەسەریاندا زاڵ بوون، باشە چی بووە هۆی ڕژانی خوێنی بەنی جەزمە کەموسڵمان بووبون جگە لەتەئویل؟ بەجۆرێک کەپێغەمبەر خوا (صلى الله عليه وسلم) دەستەکانی بەرزکردەوەو لای خوای گەورە خۆی بێبەریکرد لەکردەی تەئویل کەبووە هۆی کوژرانیان وبردنی ماڵ وسامانیان، ئەی چی بووە هۆی دواکەوتنی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) لەرۆژی حودەیبیەدا لەهاودەنگی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جگە لەتەئویل؟ تا بەهۆی دواکەوتنیانەوە لەملکەچیکردنی تورەییکردنەکەی زیادی کرد تا لەو تەئویلکردنە پاشگەزبوونەوە، ئەی چی بووە هۆی ڕژانی خوێنی ئەمیری باوەڕداران عوسمان بەستەملێکراوی و دوژمنکارانەو ئومەتی خستە ئەو نەهامەتیەی کەتێی کەوت و تائێستاش خەڵکی گیرۆدەیەتی جگە لەتەئویل؟ ئەی خوێنی عەلی (خوا لێی ڕازی بێت)و حسەینی کوڕی و بنەماڵەکەی (خوا لێیان ڕازی بێت) بەهۆی چیەوە رژا جگە لەتەئویل؟ ئەی چی خوێنی عەماری کوڕی یاسرو هاوەڵانی ڕژاند جگە لەتەئویل؟ ئەی چی بووە هۆی ڕژانی خوێنی ئیبن زوبیرو حجری کوڕی عدی وسەعیدی کوڕی جوبەیرو جگە لەوان لەگەورەکانی ئومەت جگە لەتەئویل؟ ئەی چی خوێنی عەرەبەکانی لەئاشوبی ئەبی مسلمدا ڕژاند جگە لەتەئویل؟ ئەی چی پێشەوا ئەحمەدی خستە بەردەم دووسزاو قامچی لێدانەوە تاگەشتە ئەوەی گیانی بسپێرێت جگە لەتەئویل؟(مالذی جرد الامام احمد بين العقابين وضرب السياط حتى عجت الخليقة الى ربها غير

التاويل؟)، ئەی چی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی نصری خزاعی کوشت و زۆرێک لەزانایانی تامردن خستە بەندیخانەوە جگە لەتەئویل؟ ئەی چی شمشێری تەتەرەکانی لە دارلئیسلامدا زاڵکرد هەتا خەڵکەکەیان هەلگەراندەوە جگە لەتەئویل؟ ئەی کەس هەیە لەمولحیدەکان ئەوانەی خەلکانی چارەسەرکارو یەکگرتنن لەدەرگای تەئویلەوە نەبێت؟[1].

لەلێکۆڵینەوەی ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) واباشە بۆ لێکۆڵەر کەکاریگەری زۆرلەخۆکردن لەتەئویل و تەئەول لەشێواندنی مەعالیمی بنەما ئیسلامیەکان لەیاد بێت و، شلکردنەوەی پێوەرە شەرعیەکان، کەئەمەش کارێکەو دەبێتە هۆی ئەوەی ئاسان بێت لای خەڵکی کەبەشداری هەموو لەناوبەرە سیاسیەکان بکەن، وەک کوشتن کەحەرام کراوەو، سەرکوتکردن بەفەرمانکردن و، قۆرغکردنی دەسەلات وساما بۆ خۆیان و، ئاسانکاری لەگەڵ ستەم و دەستدرێژی، فەرامۆشکردنی بەهاکانی شوراو دادپەروەری لەسوێندخوارن و بڕیاردانداــ تا کۆتایی، هەموو ئەمانەش بەهۆی ئەو پاساوبۆهێنانەوانەیە کەهەندێک کەس بۆ کاری هەندێک لەگەورە هاوەڵان کردویانە، ئەوانەی کەشەیتان تووشی خلیسکاندنی کردوون لەهەندێک ڕووداوداو، بەڕێنماییەکانی ئیسلامەوە پابەند نەبوون لەهەندێک هەڵوێستی سیاسیدا.

پێگەی کەسەکان لەنێویشیاندا هاوەڵانی بەڕێز نابێت بکرێتە پاساو بۆ شێواندنی ئەو بنەما بەرزانەی کەئەو کەسانەی پایەی خۆیانیان لێیەوە وەرگرتووە، ئەگەر وابکەین دەکەوینە

[1] ـ ابن القيم: اعلام الموقعين ٤/٢٥١-٢٥٢.

دژیەکییەوەو، لەکاتێکدا دەمانویست ئیسلام سەربخەین سەرشۆڕمان کرد.

لێرەدا ئەوەی ئیبن تەیمیە جیا دەکاتەوە دەردەکەوێت کەتوانیویەتی بەپێی توانا پارێزگاری لەهاوسەنگی بکات، هەرچەندە پاڵنەری زۆرێک لەکتێبە سیاسیەکانی بریتییە لەبەرگریکردن لەکەسێتی هاوەڵانی پایەبەرز، بەڵام توانیویەتی کەکاری پارێزەرو کاری قازی پێکەوە کۆبکاتەوە، لێنەگەڕاوە بەرگیکردنەکەی بگۆڕێت بۆ چاوپۆشی لەبنەماکان، یاخود پاساودان بەستەمی سیاسی، وەک ئەوەی ئیبن عەرەبی و کەسانی تریش تێی کەوتن، ئەوەی ئەمڕۆ پێویستمان پێیەتی بریتییە لەبەرگری زیاتر لەبنەماکان، ئەگەر بخوازرێت ئەم ئومەتە شتێک لەڕێزکەی بۆ بگەڕێتەوەو، بەپێی پەیامە نەمرەکەی بژی.

## ڕێسای نۆزدەیەم
## وردبوونەوە لەچەمك و زاراوەکان
## (التدقیق فی المفاهیم والمصطلحات)

لەمەزنترین بەربەستەکانی کەبۆتە ڕێگر لەبەردەم موسڵمانان‌دا کەلێکۆڵینەوە لەژیانی هاوەڵانی سەرەتای هاتنی ئیسلام بکەن لێکۆڵینەوەیە لە لەبەرچاوگرتن و بیرکردنەوەو هەڵسەنگاندن، دەوترێت ئەوکارە قسەپێوتنی بەهاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت)و، تانەدان لەدادپەروەریانو، ((قسەکردنە)) لەوەی کەزانایانی ئەهلی سوننە ڕێگریان کردووە قسەی تێیدا بکرێت، بەڵام هەریەک لەو بەربەستانە کاتێ لێی دەکۆڵیەوە دەبینیت بۆ تێکەڵکردن لەزاراوەو، تێنەگەیشتنی زۆر لەموسڵمانانی ئەمڕۆ لەمانای زاراوەکانی وەک: ((دادپەروەری هاوەڵان)) و((قسەپێوتن))و ((قسە تێداکردن))... لەمانا

شەرعیە بنەڕەتیەکەی دەگەڕێتەوە، یاخود لەو واتا زاراوەییە کەزانایانی موسڵمانی پێشین مەبەستیان بووە، لێرەدا ڕوونکردنەوە سەبارەت بەهەندێک لەڕووەکانی تێکەڵکردنی ئەم زاراوانە دەخەینە ڕوو:

پێشتر ئەو وتەیەی زەهەبیمان سەبارەت بەیەزیدی کوڕی معاویە هێنا: ((یەزید لەو کەسانەیە کەقسەی پێناڵێین و خۆشمان ناوێت..))، پاشان بینیمان چۆن ئەوە بۆتە تکاکار کەیەزید وا پێناسە دەکات کە: (( کەسێکی دەمارگیری وشکی دڵڕەقی بێ مێشکی، مەشروبخۆری، خراپەکار بوو))، ئایا ئەمە دژیەکییە لەزەهەبیدا؟ ئایا هیچ قسە پێوتنێک هەیە ڕەقتر بێت لەوەی بەیەزیدی وتووە؟ لەڕاستیدا ئەوە دژیەکی نیە، بەڵکو کارەکە بۆ زاراوەی قسەپێوتن و ماناکەی دەگەڕێتەوە بەوجۆرەی کەزەهەبی لەمیانی قسەکردنیدا لەبارەی مێژوویی سەرەتای ئیسلام تێی گەیشتووە.

زاراوەکانی (قسەپێوتن)و (جنێودان) و(سەرکۆنە) لەکاتی قسەکردن لەسەر ئاشوبە سیاسیەکانی سەرەتای هاتنی ئیسلام جگە لەنەفرەتکردن هیچ واتایەکی تر ناگەیەنێت، هەرچەندە ئەم زاراوانە لەمانا زمانەوانیەکانیاندا جگە لەوە هەر وەسفێکی بێزراو دەگرنەوە، لەڕاستیدا ئەم زاراوانە -بەمانای نەفرەت- لەگەڵ دەسەڵات گرتنە دەستی معاویەو گۆڕینی خەلافەت بۆ پاشایەتی هاتنە ناو فیکری سیاسی ئیسلامییەوە، پێشتر چەندین دەقمان هێنایەوە کەئەو مانایەی دەگەیاند، لەوانەقسەکەی سەهلی کوڕی سەعد: ((کەسێک لەئالی مەروان کرایە فەرمانڕەوای مەدینە، دەڵێت: سەهلی کوڕی سەعدی بانگکردو، فەرمانی پێکرد کەجنێو بەعەلی بدات، دەڵێت: سەهل ڕەتی کردەوە، پێی وت: ئەگەر بەوە هەر ڕازی

نابيت، ئەوا بڵێ: نەفرەتی خوا لەئەباتوراب...)) [١]، تۆ وای دەبینیت کەئەو ئەمیرە ئەمەوییە لێرەدا مەبەستی لەجنێوپێدان جگە لەنەفرەتکردن شتێکی تر بێت، لەبەر ئەوەیە دەگەڕێتەوەو دەڵێت: ((ئەگەر بەوە هەر ڕازی نابیت، ئەوا بڵێ نەفرەتی خوا لەئەبا توراب). لەقسەکەی ئیبن تەیمیەشدا: ((یەزید لای زانایانی پێشەوای موسڵمانان پاشایەکە لەپاشاکان، وەک پیاوچاکان و وەلیەکانی خوا خۆشیان ناوێت و، جنێویشی پێنادەن، چونکە ئەوان پێیان خۆش نیە بەداریکراوی نەفرەت لەموسڵمانێک بکرێت)) [٢]، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر هاوواتایی جنێوپێدان و نەفرەت لێکردن لەنەریتی ئەو کاتەی خەڵکیدا.

کاتێکیش ئیبن جەوزی کتێبەکەی ناونا: ((الرد علی المتعصب العنید المانع من ذم یزید)) مەبەستی لەوشەی ((ذم)) جگە لەنەفرەت شتێکی تر نەبووە، ئەوە بابەتی ناکۆکی نێوان ئەو و شێخ عبدالمغیث بووەو لەبەر ئەوە ئیبن تەیمیە لەبارەی ناکۆکی نێوان ئیبن جوزی و عبدالمغیث وتوویەتی: ((ئەبو فەرەجی بن جوزی کتێبێکی هەیە لەرێگەپێدانی نەفرەت لێکردنی یەزید، تێیدا وەڵامی شێخ عبدالمغیث حربی داوەتەوە، کەڕێگری لەوە دەکرد)) [٣].

ڕوگەی ناکۆکییەکە لێرەدا بریتییە لەنەفرەتکردن، بەڵام خراپ باسکردن یەزید بەواتا زمانەوانیەکەی و، قسەکردن لەبارەی کارە خراپ وقیزەونەکانیەوە ئەوە کارێکە ئەوانەی نەفرەتیان لێکردووەو ئەوانیشی ڕازی نەبوون بەنەفرەت لێکردنی لەسەری هاودەنگن، خۆ ئەگەر مەبەست لەقسەپێوتن واتا زمانەوانییە دانراوەکەی بوایە

---

[1] ـ مسلم ١٨٧٤/٤ والبیهقي ٤٤٦/٢.

[2] ـ مجموع الفتاوی ٤١٢/٣.

[3] ـ منهاج السنة ٥٧٤/٤.

ئەوا زەهەبی ئەو قسانەی سەبارەت بەیەزید نەدەکرد، لەکاتێکدا ڕایدەگەیەنێت کەقسەی پێناڵێت.

لەو زاراوانەی دیکە کەتیکەڵکردن تێیاندا ڕوویداوەو بۆتە بەربەستێکی مێشکی ودەروونی لەبەردەم لێکۆڵینەوە لەو قۆناغە زاراوەی ((دادپەروەری هاوەڵان))ە، زۆرکەس دادپەروەری گێڕانەوە -کە ڕاستگۆیی و وردی لەوەی دەیگێڕێتەوە پێویستە تێیدا- تێکەڵیان کردووە لەگەڵ دادپەروەری هەڵس وکەوت بەمانا فیقهیە دادگاییەکەی کەپێویستی بە ((خۆ دورگرتن لەگوناهە گەورەکان و نەکەوتنە گوناهە بچوکەکان بەدەگمەن نەبێت و، دوورکەوتنەوە لەڕێگەپێدراو (مباح)ی کەمکەرەوە لەپیاوەتی)) هەروەک شەرعزانان وتوویانە.

ئەو دادپەروەریەی هاوەڵان کەفەرموودەناسان باسی دەکەن تەنها مەبەستیان لێی دادپەروەری گێڕانەوەیە، ئەگەر نا ئەوا هەندێکیان نەدەکەوتنە ئەوەی کە سزای حەد بەسەر هەندێکیاندا جێبەجێ بکرێت لەکاتێکدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەژیاندا بووەو پاش ئەویش، هەروەها هەندێکیان تووشی گوناهـ و سەرپێچی بوون وەک ئەوەی لەکتێبی فەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە، بەبێ ئەوەی ئەوە بەکارێکی زیانەدەر لەڕاستگۆیی لەو فەرموودەی گێڕاویەتەوە دابنرێت.

فەرموودەناسان لەو ڕوانگەیەوە دادپەروەری گێڕانەوەیان لای هەموو هاوەڵان وەرگرتووە، بەبێ پێویستی گەڕان بەشوێن پاشینەیاندا، کە ئەمە کارێکی باشە، هۆیەکەی ئەوەیە کەبواری گێڕانەوە بوارێکی گومانییە و، تەنها بەدەستهاتنی گومانی ڕاستگۆبوون لێرەدا بەسە بۆ زاڵکردنی چاکە لەچینی هاوەڵاندا، خەڵکی لەو نەوەیەدا درۆکردنیان بەدەم پێغەمبەری خواوە (صلى

اللــه عليــه وسـلم) بـهگـهوره سـهيـر دهكـرد، عــهلائـی ئـهوهی بـه(لـهبـهرچـاوگرتنی حالّـهت –استـصحاب الحـال)) نـابردووه، واتـه حوكمـدان بـهپێـی زۆرينـه بـهسـهر خـهڵكـی ئـهو نـهوه چاكـهدا بهڕاستگۆيی لهگێڕانهوهو بهئاگابوون لهسهركهشی لهگوازتنـهوهداو، دهڵێت: ((... بهمـهدا ڕوون دهبێتـهوه كـهمانـای دادپـهروهری هـهمـوو يـهكێک لـههـاوهڵان (خـوا لێيـان ڕازی بێت) ئـهوه نيـه كـهبێگونـاهی (عصمهتی) چهسپابێت و، گوناهكردنی ئهستهم بێت، بهڵكو بـهمانـای ئهوهيه كهگێڕانهوهكـهی قبوڵكراوهو قسهكـهی ڕاسـتگۆيانهيـه، وهک جگه لههاوهڵان پێويستيان بهپاكانه نيـه، چونكـه بـهباشـزانی حالّيـان تهنها ئهو مانايه دهگهيهنێت)) [1]، هەيسەمی بـهجيـاواز دهروازهيـهكـی له (مجمع)هكـهيدا بـهناونيشانی : ((بـاب لا تـضر الجهالـة بالـصحابة لانهم عدول)) تهرخان كردووهو، پاشان ئهم فهرمووده‌يـهی هێنـاوه: ((له حومهيدهوه وتويـهتـی: لـهگـهڵ ئـهنـهسـی كـوڕی ماليكدا بـووين وتی: سوێند بهخوا هەموومان ئهوهی لـهپێغـهمبـهری خـواوه (صـلی الله عليـه وسـلم) بيستوومانه بۆتـان بـاس دهكـهين، بـهڵام درۆمـان لهگهڵ يهكتر نهدهكرد)) [2]، پاشان خويندنـهوهو ئـهزمـوون پشتيوانی ئهم گوازتنهوهيان كرد، ئيبن تهيميهش دهڵێت: ((هاوهڵانی پێغـهمبـهر (صـلی اللــه عليــه وسـلم) –سـوپاس بـۆ خـوا– لـهقـسهكردنـدا ڕاستگۆترينن، نـهزانـراوه كـهسيان بـهئـهنقـهست بـهدهميـهوه درۆی كردبێـت، ئـــهمـــه وێــڕای ئـــهوهی كـــهيـــهكێكيـــان كـــهوتبێتـــه خراپـهكارييـهكـهوهو، گوناهيـان هـهبـووهو بێگونـاهـ نـهبـوون، لـهگـهڵ ئـهمـهشـدا ڕهخنـهگـران و تاقيكـاران ((زانايـانی جـهرح وتـهعـديل)

[1] ـ العلائی: تحقيق منيف الرتبة لمن ثبت له شرف الصحبة، ص١٠٢.

[2] ـــ مجمـــع الزوائـــد ١٥٣/١–١٥٤، هيثمـــی وتويـــهتـــی: ((طبرانـــی لـــه (الكبيـــر)دا گێڕاويهتيهوهو گێڕهرهوهكانی گێڕهرهوهی صهحيحن)).

فـەرمـوودەكانيـان هـەڵسـەنگاندوون و، بـەوپێيـەی فـەرمـودەی پـێ دەپـشكێندرێ فـەرمـودەكانيـان (پـشكنيووە) و لـەهيچكاميانـەوە ڕوينـەداوە بـەئـەنقـەسـت درۆ بكـات)) [1]، ئـەمـەش كارێكـە هـەمـوو ئەوانەش دەگرێتەوە كەڕێگەيەكی سياسـی نـەگونجاويـان گرتـەبـەر، وەک معاويـەو جگـە لـەو، ئيـبن عـەبـاس دەڵێـت: ((معاويـە لای پێغـەمبـەری خـوا (صـلی اللـه عليـه وسـلم) تۆمـەتبـار نـەبـوو)) [2]، محـەمـەدی كـوڕی سـيرينيش دەڵێـت: ((معاويـە لـەفـەرمـوودە گێڕانەوەدا لەپێغەمبەرەوە (صلی الله عليه وسلم) تۆمەتبار ناكرێت)) [3]، ((لەقاسمی كوڕی محەمەد لەمعاويەوە دەگێڕێتەوە كەپێغەمبـەری خوا (صلی الله عليه وسلم) گێڕاويەتيەوە كەبەخەڵكی فەرمووە: ((ان صلی الامام جالسا فصلوا جلوسا)، واتە: (ئەگەر ئيمام بەدانيشتنەوە نـوێژی كـرد، ئـەوا ئێـوەش لـەپـشتيەوە بـەدانيـشتنەوە نـوێژ بكـەن)، دەڵێت: خەڵكی سەيريان لەڕاستگۆيی معاويە دەهات)) [4].

بـەڵام هـەنـدێک لـەپاشـين بـەخـراپ لـەدادپـەروەری هـاوەڵان تێگـەيـشتوون و، بـەوجـۆرە لـەو زاراوەيـە تێگـەيـشتوون كـەهـاوەڵ گونـاه ناكـات مـەگـەر تـەئـويلی بـۆ بكرێـت، هـەمـوو ئـەو نـاكۆكی وكوشـتارەی بـەرپـايـان كـرد تـەنهـا ئيجتيهـاد بـووەو، هـيچ بـوارێكی ويـست وئـارەزووو چـاوچنۆكی دونيـايی تيـدا نـەبـووە، ئـەمـەش

---

[1] ـ منهاج السنة ٤٥٧/٢.

[2] ـ احمـد ٩٥/٤ وطبرانـي لـە(الكبيـر)دا ٣٠٩/١٩، هـەروەهـا بڕوانـە ابـن كثيـر: جـامع المسانيد والسنن ٥٩٦/١١-٥٩٧.

[3] ـ ابوداود ٦٧/٤ واحمد ٩٣/٤ والبخاري: التاريخ الكبير ٣٢٧/٧.

[4] ـ ابـن ابـی شـيبة ١١٥/٢ وطبرانـي لـە (الكبيـر)دا ٣٢٢/١٩ و، هيثمـی وتويـەتـی: ((گێڕەرەوەكانی گێڕەرەوەی صەحيحن)) بڕوانە: مجمع الزوائد ٦٧/٢.

زیادەڕەویی وشاردنەوەی حەقیقەتەکانی شەرع ومێژوو سروشتی مرۆییە.

ئەوکەسی بەیەکچاو سەیری عەماری کوڕی یاسرو ئەبی غادیەی بکوژی دەکات لەدادپەروەری و ئیجتیهاددا کەخاوەنەکەی پاداشتی بۆ هەیە بیپێکێت یان نا... ئەوا ئەو کەسە هیچ بەرچاوڕوونیەکی نیە، دیارە کە ئەبی غادیش هاوەڵ بووە، بەواتا زاراوەییە فراوانەکەی کەفەرموودەناسان کاری پێدەکەن و، زەهەبیش لەکتێبی (سیر أعلام النبلاء)دا بەناونیشانی: ((أبو الغادیة الصحابی)) ژیاننامەکەی هێناوەو، ((بوخاری دەڵێت: هاوەڵ بووە)) [1]، مسلم وتویەتی: ((هاوەڵ بووە)) [2]، لەگەڵ ئەمەشدا ئیبن حەجەر لەباسکردنی ژیاننامەی ئەبو غادیەدا وتوویەتی: ((ئەبو غادیەی جهنی: ناوی (یساری کوڕی سبع)ە، لەشام نیشتەجی بووەو چۆتە واسیت، گەیشتووە بەپێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)و لێیەوە ئەم فەرموودەیەی بیستوە: ((لا ترجعوا بعدی کفارا یضرب بعضکم رقاب بعض))، واتە: (پاش من نەگەڕێنەوە بۆ بێباوەڕی وهەندێکتان لەگەردنی هەندیکی ترتان بدات)، کەلسومی کوڕی جبرو جگە لەو فەرموودەیان لێیەوە گێڕاوەتەوە، عوسمان خۆشی ویستووە، ئەم پیاوە عەماری کوڕی یاسری کوشتووە، ئەگەر بیویستایە مۆڵەت بۆ چوونە لای معاویەو جگە لەویش وەربگرێت دەوترا: ((بکوژی عەمار لەبەر دەرگایە)) بەوە دڵخۆش دەبوو.

سەرنجی ئەم کارە سەیرە بدەن: لەپێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەگێڕێتەوە کەنەهی کردووە لەکوشتارو پاشان کەسی

---

[1] ـ سیر أعلام النبلاء ٢/٥٤٤.

[2] ـ هەمان سەرچاوەو بەش و لاپەڕە.

وەک عەمار دەکوژێت)) [١]، پێشەوا ئەحمەد لەئەبی غادیەوە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە: ((أن دماءكم وأموالكم عليكم حرام)) [٢] واتە: (خوێنتان وماڵ و سامانتان لەسەرتان حەرامە)، ئیبن حەجەر وتوویەتی: ((زۆر سەیریان لێدەهات کەئەوەی بیستووە: ((أن دماءكم وأموالكم عليكم حرام)) پاشان عەمار دەکوژێت)) [٣].
کەلسومی کوڕی جەبر سەبارەت بەئەبو غادیە، کەئەو شادی دەربڕینی کوشتنی عەمار لێیەوە گێڕاوەتەوە، دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: ((کەسم نەبینیووە گومڕاییەکەی ئاشکراتر بێت لەم)) [٤].

ئایا دەگونجێت ڕەوشی عەماری کوڕی یاسرو ئەبی غادیەوە بەپاساوی ئەوەی هەردووکیان هاوەڵن وەک یە تەماشا بکەین؟! لەکاتێکدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((من يعاد عمارا يعاده الله، ومن يبغض عمارا يبغضه الله)) [٥]، واتە: (هەرکەس دژایەتی عەمار بکات خوای گەورە دوژمنایەتی دەکات، هەرکەس عەمار نیگەران بکات خوای گەورە ئەو کەسە نیگەران دەکات) [٦]،

---

[1] ـ مسلم: الكنى والاسماء ٦٦٩/١.
[2] ـ ابن حجر: تعجيل المنفعة ٥٠٩/١ و هەمان شت لای حسيني: الاكمال ٥٤١/١ وابن عبدالبر: الاستيعاب ١٧٢٥/٤.
[3] ـ احمد ٧٦/٤.
[4] ـ ابن حجر: الاصابة ٣١١/٧.
[5] ـ مجمع الزوائد ٢٩٨/٩ و هيثمی وتوویەتی: ((طبرانی هەمووی گێڕاوەتەو وعبداللهش بەكورتی گێراويەتيەوەو گێڕەرەوەكانی يەكێك لەگێڕانەوەكانی طبرانی گێڕەرەوەی صحيحن)).
[6] ـ أحمد ٩٠/٤و النسائي: فضائل الصحابة ٤٩/١و سير أعلام النبلاء ٤١٥/١و، شێخ شعيب ئەرنائوتی لێكۆڵەری دەڵێت: رجاله ثقات، وأخرجه أحمدو الحاكم، وصححه ووافقه ذهبي)).

ئیتر ئەبێت حاڵی کەسێکی دەستدرێژکار چی بێت کەخوێنی عەمار بڕژێت؟

چینی هاوەڵانیش کۆمەڵگەیەکی مرۆیی بوون و ستەمکارو دەستگر (مقتصد)و پێشبڕکێکاری لەچاکە (السابق بالخیرات)ی تێدایەو، زۆرینەبوونی چاکە لەخەڵکی ئەو نەوەیەدا بەس نیە بۆ گشتاندن و ڕەهایی و، پێدانی خەسڵەتی پیرۆزی بەهەموو تاکەکانی، بەجۆرێک کەلەگەڵ ڕاستیەکانی شەرع پێش ڕاستییە مێژووییەکان دژ بێت، خۆ ئەگەر فەرموودەناسان پاساویان هەبێت بۆ وەرگرتنی گێڕانەوە لەهەموو هاوەڵان بەبێ هەڵاوێرد، ئەوا گوازتنەوەی دادپەروەری گێڕانەوە لێرەدا بۆ دادپەروەری لەهەڵس وکەوت کەهەموو هاوەڵێک بگرێتەوە تێکەڵکردنە لەزاراوەداو، شێواندنی ڕاستیەکی ڕوونە کەشیاو نیە بۆ موسڵمانێک کەحەق پێشی کەسەکان دەخات هەرچەندە کەسەکان بەرز بن کاری لەو جۆرە بکات.

لەو زاراوانەی دیکە کەلەهزری قوتابیانی زانست و موسڵمانان بەگشتی تێکەڵ کراون ((وازهێنان لەوەی لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویداوە)) کەزۆر لەکتێبەکانی عەقیدەو وتەکان و فیرەقەکاندا دووبارە بۆتەوە، تا دواتر بووتە بنچینەیەک لەبنچینەکانی ئەهلی سوننەو جەماعەت و، لەمبارەیەوە لالکائی لە ((اعتقاد أهل السنة)) دەڵێت: ((داوای لێخۆشبوون بکرێت بۆ هەموو هاوەڵانی محەمەد (صلی الله علیه وسلم)و واز بهێنرێت لەوەی ڕوویداوە لەنێوانیاندا)) [1].

[1] ـ أبو القاسم اللالكائي: اعتقاد أهل السنة ١٧٧/١.

هۆکاری ئەم تیکەڵکردنە لێرەدا تێنەگیشتنە لەزاراوەکە بەپێی ئەو سەردەمەی کەزانایانی موسڵمانی بەکاریان هێناوە، گەورە زانایینی ئیسلام بەو زاراوەیە دوو مانایان ویستووە: یەکەمیان جڵەوگیری لەو کەسانەی کەلەسەرچاوەی متمانەپێکراوەوە ئاگاداری ئەو ڕووداوانەو وردەکاریەکانی نین تاقسەی تێدا بکەن، ئەمەش وەک هۆشداری لەبارەی لەخۆوە گوازتنەوەو درۆکردن لەسەر هاوەڵان و، دووەمیشیان: ڕێگری لەو قسەکردنەی دەبێتە هۆی نەفرەتکردن لەهاوەڵان یاخود بەکافردانانیان...وەک ئەوەی بیدەعەچیەکان لەسەری راهاتبوون.

بەڵام پاشینەکان لێرەدا وا لەقسەکانی پێشین تێنەگەیشتن کەئەوان مەبەستیان بووەو، وا لێکیان دایەوە کەمەبەست لێی بەڕەهایی قسەنەکردنە لەو بابەتە یان خۆنەدان لەقەرەی، با بۆ مەبەستی ریشەدارکردنی شەرعی و پەند وەرگرتنی مێژوویش بێت، بەمەش فراوانێکیان تەنگ کردەوەو، خەڵکیان بەشتیکەوە پابەند کرد کەنەدەبوو پێیەوە پابەند بکرێت.

خۆ ئەگەر ناودارانی ئیسلام لە(( وازهێنان لەوەی ڕوویداوە لەنێوان هاوەڵاندا)) تێبگەشتنایە کەخەڵکی ئەمڕۆ تێی دەگەن، ئەوا بەهەزاران بەرگ کتێبیان سەبارەت بەم بابەتە نەدەنووسی، دیارە ئەوان مەبەستێکی تریان هەبووە، بۆ نمونە ئەوەتا زەهەبی دەڵێت: ((ڕێبازی ئێمە داواکردنی لێخۆشبوونە بۆ هەموویان و، خۆشمان دەوێن و، وازدەهێنین لەوەی کەڕوویداوە لەنێوانیاندا)) [1]، لەبابەتێکی تردا دەڵێت: ((ڕێبازی ئێمە وازهێنان وداوای لێخۆشبوونە بۆ هاوەڵان و، ئەوەی ڕوویداوە لەنێوانیاندا پێمان

[1] ـ سير أعلام النبلاء ٣٧٠/٧.

خۆش نیەو، پەنا بەخوا دەگرین لێی و، ئەمیری باوەڕداران عەلی بەڕاست دەزانین (ونتولى أمير المؤمنين عليا))) [1]، ئێمە دەزانین کەزەهەبی هەزاران لاپەڕەی لەسەر ئەو ڕووداوانە نووسیوە، خۆ ئەگەر تەنها ئەوەی لەکتێبەکانی (تاريخ الاسلام)و (سير أعلام النبلاء)دا نووسیوەیەتی کۆبکرێتەوەچەندین بەرگی گەورەی لێدەردەچێت.. ئەوەی لەسەر زەهەبی هاتوەتە دی لەسەر ئیبن کەسیرو کەسانی دیکەش لەزانایانی دیاری ئەهلی سونە دێتە جێ.

## ڕێسای بیستەم

## جیاکردنەوەی هەڵەو تاوان و، ناتەواوی وکەمتەرخەمی

## (التمييز بين الخطأ والخطيئة، بين القصور والتقصير)

لەمەزنترین هۆکارەکانی تێکەڵکردن لەتوێژینەوەی ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان (خوا لێی ڕازی بێت) تێکەڵکردنی باوی نێوان هەڵەو گوناه و، حوکمدانە لەسەر کردارەکان بەهۆی دەرئەنجامەکانیەوە نەک بەهۆی شێوەو مەبەستەکانیەوە.

لەنمونەکانی ئەمەش ئەمیری باوەڕداران عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) هەندێک هەڵەی سیاسی لەمامەڵەی لەگەڵ بەشداربووانی (جمل)و (صفين)و لەگەڵ (خەوارج)و، زۆرێک لەوانەی لێکۆڵینەوەیان لەو قۆناغە مێژووییە کردووە بەکاریگەری پێشخۆیی گەیشتوونەتە ئەوەی کە بۆ عەلی واباشتر بوو کەلەشوێنکەوتنی خەڵکی (جمل) هەڵنەچوایەو، واباشتر بوو ڕوی بدایەتە معاویەو بەدانانی لەشام لەگەڵی هەڵیبکردایە تا ئەوکاتەی کارەکە پاش شەهیدبوونی عوسمان جێگیر دەبوو، دەروونەکان هێور

---

[1] ـ هەمان سەرچاوە ٣٩/٣.

دەبوونەوە، دواتر ئەگەر ویستی لەسەر بوو هەوڵی لادانی بدایە و، لەگەڵ خەواریجەکانیش هەڵیبکردایەو لێگەڕابا چۆنن ئاوا بمیننەوە لەکاتێکدا ئەو لەلایەنی دوژمنێکی لەوان بەهێزتر وڕێکخراوتر و پلاندارەتر و، مەترسیدارتر لەوانەوە هەڕەشە لەسەر سیستمی خەلافەت هەبوو کەخەواریجەکان –وێڕای لادانیان- باوەڕی تەواویان بەخەلافەت هەبوو.

حوسەینی کوڕی عەلیش هەندێک هەڵەی ئەنجامدا کە لەمەزندەکردنی هێزی لایەنگرانیدا لەعێراق بەهەڵەدا چوو بوو، لەو هاوکێشە سیاسیەش تێنەگەیشتبوو کەلەوێ هەبوو، لەو گۆڕانە ڕەوشتی و دەروونیەی کەبەسەر کۆمەڵگادا هاتبوو لەگەڵ فراوانبوونی فتوحاتەکاندا، کەوایکردبوو دڵی هەندێک کەس لەگەڵی بێت وشمشێرەکانیان لەدژی بێت..

لەنمونەی ئەمەش بەهەمان شێوە ئەو هەڵە مەزەندەکردنە بوو کەخەڵکی مەدینە تێی کەوتن لەشۆڕشەکەیاندا لەدژی یەزید، کەبەکارەساتی (حره) کۆتایی پێهات و، یەزید کردیە بیانوو بۆ ئەوەی خراپەکاری لەشاری پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بڵاوبکاتەوەو، ئەو هاوەڵانەی کەمابوون لەناو ببات..

لەنمونەی تریش پشتبەستنی عبداللە کوڕی زوبیر بەهێزی کەسانێک کەزۆر بەخێرایی لەبگرەوبەردەکە کشانەوەو، لەگەڵ ژمارەیەک لەهاوەڵانی پاڵەوانیدا بەتەنیا بەجێیان هێشتن ڕوبەڕووی توندوتیژی و خوێنڕێژی ودەستدرێژی بۆ سەر حەرامکراوەکانی ئیسلام و ماڵی خوای گەورە لەلایەن حەجاجی کوڕی یوسفەوە ببنەوە.

لەهۆکارەکانی هەموو ئەو هەڵانە ئەوە بوو کەخەڵکی مەدینەو حجاز لەمەڵبەندی خەلافەتدا لەگەڵ سوپاکانی جیهاددا ڕاهاتبوون،

ئەوانەش سوپای خۆبەخش بوون کەتەنها ئیمان پاڵنەریان بوو بۆ جیهادکردن و، لەرەوشێکدا کەئاڵا ئاشکرا دیارەو هیچ ناڕوونیەکی نیەو، سوپای شام لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا گۆڕاوە بۆ سوپایەکی ڕێکخراو، پاش ئەوەی کەمعاویە سیستمی کارگێڕی و سەربازی کەلەدەوڵەتی بیزەنتینیەکانەوە لەشام مابوەوە خستە ناو سوپاکەیەوە، پاشان ئاڵاکە کەمتر ڕوون بوو چونکە جەنگەکەی ئێستا لەنێوان موسڵمان وبێباوەڕدا نیە، بەڵکو لەنێوان موسڵمانی دادپەروەرو موسڵمانی دستدرێژکاردایە.

سوپای خۆبەخشەکان لەو ڕەوشەدا بەوجۆرە نەبوو کەتوانای شکست پێهێنانی سوپایەکی ڕیکخراوی هەبێت و، دەروونەکانیش وەک رۆژانی سەرەتای فەتح و غەزاکان ئامادەی شەڕ نەبوو، لەوانەیە ئەو گەورانە لەو ڕاستیە نوییە تێنەگەیشتبن، سەرەتا لەعەلیەوە، تا دەگاتە حسەین وخەڵکی مەدینەو، بەئیبن زوبیر کۆتایی پێدێت.

بەڵام توێژەران لێرەدا تووشی تێکەڵکاری مەنهەجی دەبن، کاتێ هەڵەی سیاسی و سەربازی وەک یەک سەیر دەکەن کەخاوەنەکەی بۆ داواکردنی ڕاستی ئیجتیهادی تێدا کردبوو، لەهەوڵەکانیدا پابەندیش بوو بەڕێسا شەرعیەکانەوە، هەروەها لەنێوان گوناهی شەرعیەت ومەبدەئی کەخاوەنەکەی هیچ هەوڵێکی بۆ داواکردنی حەق نەداوەو، لەهەوڵەکانیدا پابەند نەبووە بەبنەما شەرعیەکانەوە.

لەکاتێکدا هەڵەی عەلی و حسین وخەڵکی مەدینەو ئیبن زوبیر لەمەزندەی سیاسی و سەربازیدا وایان لێناکات بەگوناهبار دابنرێن، بەڵکو ئەوان لەداواکردنی حەق وسەرخستنیدا بەهۆکارەکانی حەق و کەرەستەکانی ئیجتیهادیان کردووەو، هەڵەکەیان لێبوراوەو لەجۆرەیە کەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) قسەی لەسەر

کردووەو دەفەرموویێت: ((ان الله تجاوز عن أمتی الخطأ والنسیان وما استکرهوا علیه)) [١]، واتە: (خوای گەورە خۆشبووە لەهەڵەو لەبیرکردن و ئەو کارەی بەزۆر پێیان دەکرێت)، بەڵکو ئەوە ئیجتیهادە کەخاوەنەکەی بیپێکێت یان هەڵە بکات پاداشتی بۆ هەیە لەسەری، هەروەک پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) دەفەرموویێت:((اذا حکم الحاکم فاجتهد ثم أصاب فله أجران، واذا حکم فاجتهد ثم اخطأ فله أجر)) [٢]، واتە: (دادوەر ئەگەر ئیجتیهادی کردو پێکای ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە، ئەگەر ئیجتیهادی کردو هەڵەی کرد ئەوا یەک پاداشتی بۆ هەیە).

لەڕاستیدا عەلی و حسین وخەڵکی مەدینەو ئیبن زوبیر لەپێناوی حەق ودادپەروەریدا شەڕیان کرد و، رکابەرەکەشیان لەپێناوی دەسەڵات وساماندا جەنگان، هیچ حەق و ویژدانیکی تێدا نیە هەردوولایان بخەینە یەک ئاستەوەو، هەڵەی یەکێکیان بەگوناهی لایەکەی تر رێک بکرێت، لەبەر ئەوەیە زەهەبی وتوویەتی: ((خەڵکی مەدینە لەبەر خوا راپەڕین)) لەشۆڕشەکەیدا دژی یەزید، پێشتر تەواوی قسەکانیمان هێناو، ئیبن عەرەبی سەبارەت بەحسین دەڵێت ئەو تورە بووە ((لەپێناوی ئایندا وبۆ حەق شۆڕشی کردووە))، دواتر قسەکانی دەهێنینەوە.

ئاشکرایە کەدروستکاری بونەوەر سەرکەوتنی دونیایی بۆ هەموو ئەوکەسانە دەستەبەر ناکات کەلەپێناویدا تێدەکۆشن، بەڵکو یەکێک لەدوو باشیەکەیان بۆ دابین دەکات: سەرکەوتن یان شەهیدبوون.

---

[1] ـ ابن حبان ٢٠٢/١٦ والبیهقي ٨٤/٦ وابن ماجة ٦٥٩/١ والدار قطني ١٧٠/٤ والحاکم ٢١٦/٢و دەڵێت: ((صەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری ومسلم)).

[2] ـ البخاري ٢٦٧٦/٦ ومسلم ١٣٤٢/٣وابن حبان ٤٤٧/١١ و جگە لەوانیش.

پێوەری دروست لەبڕیاردانادا بریتییە لەهەوڵدان لەپێناوی حەق و، پابەندبوون بەڕێساکانی شەرعەوە لەو هەوڵەیدا، نەک ئەو دەرئەنجامە دونیاییەی کەبەهۆی کارەکەوە دێتە ئاراوە.

قورئانی پیرۆز فێرمان دەکات کەئەنجامدانی هەڵەی کرداریی وەک پێویست ئەو واتایە نادات کەخاوەنەکەی تاوانبارەو، هیچ ناتەواویەک لەهەوڵ و جیهادیدا لەسەرئەنجامدا دروست نابێت، لەمەشدا بەدواداچونێکی قورئانی جوان سەبارەت بەغەزای ئوحود بۆ موسڵمانان هەیە بەبێ ئەوەی بەڕوونی باسی ئەوە بکات کەمتەرخەمییان کردو توشبوون: ((**قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ**))[1]، بەڵام پێی ڕاگەیاندوون بەبێ دوودڵی کەکوژراوەکانیان شەهیدن: ((**وَيَتَّخِذَ مِنْكُمْ شُهَدَاءَ**))[2].

باشترین نمونەش لەسەر جیاکردنەوەی هەڵەو گوناه بەو واتایەی کەلێرەدا مەبەستمانە، ئەوکارەیە کەزانای ناودار ئیبن خەلدون کردویەتی، کاتێ ئیبن خەلدون لە (مقدمة) کەیدا باسی کوژرانی شەهید حسین (خوا لێی ڕازی بێت) لەکەربەلا دەکات، ڕوونی کردۆتەوە کەحسین بەهەڵەداچووە لەمەزندەکردنی ئامادەیی وهێزی شوێنکەوتووانی لەعێراق، بەڵام ئیبن خەلدون لەوە بێئاگا نەبووە هۆشداری بدات کەئەوە ((هەڵەیەکی دونیاییە، نەک ئاینی)) بەپێی دەربرینەکەی ئەو[3]، واتە ناتەواوی لەپلان وجێبەجیکردندا، نەک کەمتەرخەمی لەشەرع و مەبدەئدا، ئەوەش هەڵەیە نەک گوناه

---

[1] ـ سورەتی ال عمران ئایەتی ١٦٥.

[2] ـ سورەتی ال عمران ئایەتی ١٤٠.

[3] ـ مقدمة ابن خلدون ص٢١٧.

بەپێچەوانەی ئەوەی دوژمنەکانی ئەنجامیاندا، کەئەوەیان تاوانو گوناهێکی ڕێپێنەدراوە.

ئەوەی ئیبن خەلدون سەبارەت بەحسین وتوویەتی دەتوانرێت بەرانبەر عەلی و خەڵکی مەدینەو ئیبن زوبیرو ئیبن ئەشعەس و، هەر کەس کەخوێنی لەپێناوی چەسپاندن یاخود گێڕانەوەی خەلافەتی ڕاشیدین لەسەدەی یەکەمی کۆچیدا دابێتی و، لەو هەوڵەیدا لەبەرانبەر زۆری هێزو توندوتیژیانەوە شکستی هێنابێت بوترێت.

ئەم هاوکێشەیەیە کەناتەواوی لەکەمتەرخەمی و، هەڵە لەگوناه جیا دەکاتەوە، هەر ئەم هاوکێشەیەیە کەلێکۆڵەرانی مێژووی سەرەتای یەکەم تا ئەمڕۆ نیانە.

## ڕێسای بیست ویەکەم

## جیاوازیکردن لەنێوان گوتاری شەرعی و گوتاری قەدەری

## (التمییز بین الخطاب الشرعی والخطاب القدری)

فەرمودەی زۆر لەپێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) لەبارەی ئاشوبەوە هاتووە، لەگەڵ ئەو بەڵاو موسیبەت و، جەنگە نێوخۆیی و، دابەشکاری مەزهەبی و تائیفیانەی لەمێژویدا تووشی ئەم ئومەتە دەبێت، هێندە بەسە بۆ ئاگاداربوون لەکتێبەکانی فەرموودەدا دەروازەی ((الفتن والملاحم)) بخوێنینەوە.

بەڵام زۆرێک لەموسڵمانان -لەنێویشیاندا زانایانی پایەرز- بەتێگەیشتنێکی جەبری لەم فەرموودانە تێگەیشتوون، چونکە بەچاکی نەیانتوانیووە جیاکاری بکەن لەنیوان گوتاری شەرعی و گوتاری قەدەریدا.

گوتاری شەرعی –لای ئوصولییەکان- ئەوەیە کەفەرمانکردن و ڕێگری کردن لەخۆ دەگرێت و، ڕووی لەویژدانی دروستکراوە لای باوەڕدار، ڕێگای ژیانی کرداری بۆ ڕۆشن دەکات، بەڵام گوتاری قەدەری ئەمەیان دەچێتە چوارچێوەی غەیبیاتەکانەوەو، ئەنجامدانی کردار یاخود ڕێگری لێی لەخۆ ناگرێت، بەڵکو ئیمان و بەڕاستزانینی لەخۆ دەگرێت.

لەنمونەکانی گوتاری قەدەری پەیوەندار بەبابەتەکەمانەوە فەرموودەی عامری کوڕی سەعد لەباوکیەوە: ((کەپێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێکیان لەسەرەوە دەهات، تاگەیشتە مزگەوتی بەنی معاویەو چووە ژورەوەو دوو ڕکات نوێژی تێدا کردو، ئێمەش لەگەڵی نوێژمان کردو، زۆر لەخوا پاڕایەوە، پاشان هات بۆ لای ئێمەو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ((سألت ربي ثلاثا، فأعطاني اثنتين ومنعني من واحدة، سألت ربي أن لايهلك أمتي بالسنة فأعطانيها، وسألته أن لايهلك أمتي بالغرق فأعطانيها، وسألته أن لايجعل بأسهم بينهم فمنعنيها)) [1]، واتە: (سێ شتم لەخوا داواکرد، دوانیان پێ بەخشیم و لەیەکێکیان بێبەشی کردم، داوام لەخوا کرد ئومەتەکەم لەبێ ئاویدا تیا نەچێت بە، پێی بەخشیم، داوامکرد ئومەتەکە بەنغرۆبوون لەناونەچێت پێی بەخشیم، داوامکرد توندیان نەکەوێتە نیوان خۆیانەوە پێی نەبەخشیم).

کاتێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەم فەرمودەیەو جگە لەمەشدا هەواڵمان پێدەدات کەئەم ئومەتە جەنگ وکوشتاری تاڵ بەخۆیەوە دەبینێت، ئەمە گوتارێکی قەدەرییەو باوەڕمان وایە

[1] ـ مسلم ٤/٢٢١٦.

کەڕوودەدات، بەڵام پێویستە لەیادمان نەچێت کەگوتاری شەرعی داوای کارێکی ترمان لێدەکات کەزیاترە لەتەنها باوەڕهێنان بەڕوودانی ئاشوب وکوشتارەکان.. داوامان لێدەکات ئاشتەوایی لەنێوان باوەڕدارانـدا بکەین و، بەڕووی دەستدرێژیکاراندا بووەستین و، دەستی ستەمکار لەکاربخەین: ((وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ))[1].

خۆ ئەگەر موسڵمانان بێلایەن ڕاوەستان و، وتیان: نێوانی براکان چاک ناکەین و، شەڕ لەدژی دەستدرێژیکار ناکەین، چونکە ئەوەی ڕوویداوە بەڕاستەدەرخستنی پێشبینیەکەی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم).. ئەوا گوناهی تێدا نیە ئەمە لادانە لەتێگەیشتنی مەبەستی شەرع و، دەستبەردانە لەبەرپرسیارێتی رەوشتیی.

هاوشێوەی ئەمانە لەو فەرموودانەدا هاتووە کەپێشبینی ڕوودانی ئاشوبی لەنێوان هاوەڵاندا (خوا لێیان ڕازی بێت) تێدا هاتووە، چونکە بێلایەنی ڕەوشتیی باو لەفیکری ئیسلامیدا لەخستنە بەرباسی ئەو ڕووداوانەدا بەشێکی بۆ تێکەڵکردن لەنێوان گوتاری شەرعی و گوتاری قەدەری دەگەڕێتەوە، ئەمەش بێلایەنیەکە کەموسڵمانان بێبەش دەکات لەلێکۆڵینەوەی هەڵسەنگێنەر بۆ ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان و، پەند وەرگرتن لییان بۆ ئایندە.

لەبەر ئەوە جیاکاری لەنێوان گوتاری شەرعی وگوتاری قەدەریدا کەرەستەیەکی مەنهەجی گرنگە لەتوێژینەوەی ئەو قۆناغە مێژووییەو کەسەکانیدا.

---

[1] ـ سورەتی حجرات، ئایەتی ٩.

## ڕێسای بیست ودووەم

## بڕیار بەهۆی ڕووکارەوەیەو خوای گەورە بڕیار لەپەنهانەکان دەدات

## (الحكم على الظواهر والله يتولى السرائر)

ئەم ڕێسایە کۆکەرەوەی هەموو کارەکەو پوختەکەیەتی، ئەگەر موسڵمانان پابەند بن پێیەوە ئەوا لەزۆر بگرەو بەردەو مشتومڕ لەسەر ئەم بابەتە ڕزگاری دەکردن و، دەیانتوانی مێژووی سەرەتای هاتنی ئیسلام بەشێوەیەکی بابەتیانە بخوێننەوە، کەتێیدا پێگەی کەسەکان وپیرۆزی بنەماکانی لەهەمان کاتدا بۆ دەپاراستن و، سودی بۆ ئێستاو ئایندەشیان دەبوو و، لەهەڵخلیسکانەکانی ڕابردوو درێژەکێشانی خراپیەکانی بۆ ئێستاو مەترسیی لەسەر ئایندە دەیپاراستن.

شەریعەتی ئیسلامی هەمووی لەسەر بڕیاردان بەپێی ڕووکاری خەڵک بونیات نراوەو، پەنهان وشاراوەکانیان بۆ خوای گەورە بەجێ دەهێڵدرێت، لەبەر ئەمەیە عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: ((کەسانێک هەبوون لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بەهۆی وەحییەوە هەڵوێستی بەرانبەر وەردەگیرا، بەڵان ئێستا وەحی نەماوە، لەبەر ئەوە بەپێی ئەو کردەوانەی دەریدەخەن بەرانبەرتان دەجوڵێینەوە، هەرکەس چاکەی نیشاندا ئەوا لێی دڵنیا دەبین ونزیکی دەکەینەوە، هیچمان بەسەر پەنهانیەوە نیە، خوای گەورە لەسەر پەنهانەکانی لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکات، هەرکەسیش خراپەی دەرخست ئەوا لێی دڵنیا نابین و بڕوای پێناکەین، با

بشلێت پەنهانی زۆرباشە)) [1]، هەر دادوەرێک بەپێی ڕووکاری خەڵکی بڕیار بدات ستەمکار نیە بەرانبەریان، تەنانەت ئەگەر ئەو حوکمدانەش هەڵە بێت، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کەوەحی بۆ دەهات بەخەڵکی ڕاگەیاندووە: ((انما أنا بشر، وانكم تختصمون الي، ولعل بعضكم أن يكون ألحن بحجته من بعض، فأقضى على نحو ما أسمع فمن قضيت له بحق أخيه شيئا فلا يأخذه، فانما يأخذ قطعة من النار)) [2]، واتە: (منیش وەک ئێوە مرۆڤم، ئێوە ناکۆکیەکانتان دەهێننە لای من، لەوانەیە هەندێکتان بەڵگەکەی لەهەندێکی ترتان بەهێزتر بێت و منیش وا داوەری دەکەم مافێکی براکەی بۆ وەرگرم کەمافی نیە، ئەوە پارچەیەکە لەئاگرەکە) توێژەران لەناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) کار بەم ڕێسایە بکەن، بەبێ هەڵدانەوەی پەنهانەکان و، دوور لەزۆر لەخۆکردن لەتەئویل و تەئەول، ئەوا کاتێکی زۆری هەڵەکانیان بۆ دەگەڕایەوەو، دەیانتوانی ئەزموون وپەند لەناکۆکییەکانی سەرەتای هاتنی ئیسلام بەجۆرێک وەربگرن کەسوودی بۆ ئێستاو ئایندەی ئیسلام هەبێت.

ئەو کەسەی بەڕێساکانی شەرعەوە لەحوکمدان بەسەر ڕووکاردا پابەند بێت، تێدەگات کەجیاوازییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان لەشەوی سەقیفەدا دەستی پێکردو، کاتێک دوو کەسایەتی ناودار لەنێو هاوەڵان بەیعەتیان نەدا بەئەبوبەکر زیاتر دەرکەوت، کەئەوانیش عەلی کوڕی ئەبو تالب وسەعدی کوڕی عوبادە بوون بەوجۆرەی کەپێشتر قسەمان لەسەر کردن و ڕوونمان کردەوەو

---

[1] ـ البخاري ٩٣٤/٢.

[2] ـ البخاري ٢٦٢٢/٦ ومسلم ١٣٣٧/٣ وجگە لەوان.

دواتریش قسەی لەسەر دەکەین، بەڵام وەرعی ئەو دوو کەسە ناودارەو دەسەڵاتی تێگەیشتوانی کۆمەڵگا لەسەردەمی خەلافەتی ڕاشیدیندا، عەلی هاندا کەبەحەقەکەدا بچێتەوەو، سەعدیشی والێکرد گۆشەگیر بێت و ئاشوب ناکۆکی دروستە نەکات.

لەکۆتاییەکانی خەلافەتی عوسمانیشدا (خوا لێی ڕازی بێت) جۆرێکی تر لەناکۆکی دەستی پێکردەوە، کەبۆ لادانە سیاسیەکان و، خۆویستی وپێشخستنی دەسەڵات وسامان دەگەڕایەوە، بەڵام گەورە هاوەڵان –سەرەڕای نیگەرانیان لەسیاسەتەکانی عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت)- پابەندبوون بەو بەیعەتەی لەگەردنیاندا بوو بەرانبەر خەلیفەو، هەوڵیاندا ئەوەی دەکرێت چاک بکرێت چاکسازی تێدا بکەن بەباشە.. پاشان کەسانێک بۆ تۆڵەسەندنەوە هەڵچوون کەهیچ باشەیان تیدا نەبوو، لەسەر پابەندبوون بەپەیمانەکانی ئیسلام وبەڵێننامەکانی پەروەردە نەبوبوون، پەلاماری خەلیفەی شەهیدیان داو بەناڕەوا کوشتیان، پاش ئەوەی تۆبەکردنی خۆی ڕاگەیاندو سووربوونی خۆی لەسەر چاکسازی دووپات کردەوەو، لەمەدا هەڵوێستی هەندێک لەخزمانی عوسمان وەک مەروانی کوڕی حەکەم وجگە لەئەو یارمەتیدەریان بوو، کەگوێگرتن لەحەقیان ڕەت دەکردەوەو، دونیایان بەسەر ئایندا پێش دەخست و... خەڵکی لەرەوشێکی ئاڵۆزدا بەیعەتیان بەخەلیفەی چوارەم دا، ئەوە بوو بەشداربووانی (جمل) لەدژی دەرچوون و، ئەوانەش لەهاوەڵە گەورەکان بوون کەکوژرانی خەلیفەی شەهیدیان پێ ناخۆش بوو، لەکارەکەیاندا پەلەیان کردو پابەند نەبوون بەو ڕێکارانەی تاوانکارییکەبەپێی شەرع پێویست بوو پابەند بن پێیانەوە، ئەمەش وا پێویست دەکات داواکەیان لەلایەن خزمانی

نزیک کوژراوەکەوە بەرز بکرێتەوەو، دەسەڵاتی شەرعی داوەری تێدا بکات..

پاشان خەڵکی شام لەدژی خەلیفە هەستان، ئەوانیش کەسانێک بوون گومانی کوژرانی خەلیفەی شەهیدیان تێکەڵ بەگومانی دەسەڵات و چاوچنۆکی دونیا کردبوو ((گومانی معاویەو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون داواکردنی خوێنی عوسمان بوو، لەڕووی شەرعیەوە لەسەریان پێویست بوو بچونایەتە بەیعەتەکەوە، پاشان لەڕێگا شەرعییەکانەوە داوای بکەن، خاوەنی خوێنەکەش لەڕاستیدا منداڵەکانی عوسمان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بکوژانی عوسمان دیاری نەکرابوون)) [1]، ئەوەبوو معاویەو ئەوانەی کەلەگەڵیدا بوون ئومەتیان تووشی جەنگێکی ناهەموار کرد کەتێیدا حەفتا هەزار لەباشترینی موسڵمانان کوژران.. خراپتر لەوەش ئەوان بوونە هۆی تێکدانی پایەکانی خەلافەتی ڕاشیدین، نەئەوان پابەند بوون بەڕێساکانی شەریعەتەوە لەداوەریکردن سەبارەت بەخوێنی خەلیفەی شەهید، نەئەمانیش مەنهەجی پێغەمبەریان لەسیاسەت و حوکم پاراست پاش ئەوەی کارەکە لەسەر دەستیان سەقامگیر بوبوو، بەڵکو بیدعەی پاشایەتیان داهێنا، ئەمەش یەکەم بیدعە بوو لەئیسلامداو لەهەموویان زیاتر کاریگەری لەسەر ئومەت هەبوو، بەهۆی ئەوەی پاشایەتی ((ئەوە دەخوازێت هەندێک لەوەی ئاین پێویستی کردووە دەستی لێ هەڵبگیرێت)) وەک ئیبن تەیمیە دەڵێت، لەبەر ئەوە ئەوانەی دایانهێنا بەوکارەیان زنجیرێک لەزنجیرەکانی ئیسلامیان پچڕاند و، کەلێنیکیان لەکیانی ئومەتدا دروست کرد کەتا ئەمڕۆش پڕ نەکراوەتەوە.. خوای گەورە کۆمەک کارە.

---

[1] ـ ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب في اخبار من ذهب ٢١٢/١-٢١٣.

## چەند تێبینییەك لەسەر مەنهەجی ئیبن تەیمیە

ئەم ڕێسا مەنهەجیانە -زۆربەیان لەکتێبەکانی ئیبن تەیمیەوەیە- گوزارشـتن لـەسـەر تێگـەیـشتنی ئـەم زانایـەو قـوڵیی تێگـەیـشتنی شەرعی ومێژوویی و، توانای لەسەر هاوسەنگی لـەنێوان بـەرگری لەپێگەی پیاوانی ئیسلام وپیرۆزی بنەماکانی ئیسلام لەهەمان کاتدا، ماوەتەوە هەندێک ڕخنەی لاوەکی بخەینە ڕوو کەوامان بینیـووە نـە لەگەڵ بەڵگەکەدا گونجاوە، نـەلـەگـەڵ ئاڕاسـتەی گشتی تێگـەیشتنی ئیـبن تـەیمیـەو مـەنهـەجـەکـەیدا، هـەروەک لـەڕێساکانی ڕابـردوودا ڕونمان کردۆتەوە.

ئێستاش دەسـتدەکـەیـن بـەڕوونکردنـەوەی کـارێکی پـڕ بایـەخ، ئـەویش بریتییـە لـەوەی ئیـبن تـەیمیـە کـاتێ کتێبـەکـەی سـەبـارەت بـەناکۆکییـە سیاسـیـەکـانی نێـوان هـاوەڵان نووسـیووە، ئامـانجی ڕیشەدارکردنی فیقهی سیاسی ئیسلامی نـەبـووە وەک ئـەوەی ئێمـە ئەمڕۆ مەبەستمانە، بەڵکو بۆ ئـەوە نوسـیوویەتی وەڵامـی ڕەخنـەو تانەی شیعە لەپێگەی خەلیفەکانی ڕاشـیدین وهـاوەڵانـی دیکـە (خـوا لێیـان ڕازی بێـت) بداتــەوە، لــەبــەر ئــەوە خوێنــەری بــەدیقــەت هەندێکجار کاردانەوەی توند لەکتێبەکانی شێخی ئیسلامدا دەبینێت، هەیانە بۆ توندی ونابەجێی تۆمەتەکە دەگـەڕێتـەوەو، هـەندێکیشیان بۆ مەزاج وسروشتی خودی ئیبن تەیمیە دەگەڕێتەوە.

هەرچەندە ئیبن تەیمیە هەوڵیداوە هاوسەنگی خۆی بپارێزێت و، لـەزۆربـەی کاتـدا لـەمـەدا سـەرکـەوتـوو بـووە، بـەڵام هـەنـدێک زۆرلـەخـۆکردن و شـڵـەژان-هـەنـدێکجاریش دژیـەکـی- لـەهـەنـدێک

بەرگریدا لەسەرکردەکانی سوپای شام لە(صفین) بەگشتی و، معاویە بەتایبەتی دەردەکەوێت، ئیبن تەیمیە لەقسەلەسەرکردنی جەنگی (صفین)دا دەشڵەژێت، هەندێکجار پەنجە دەخاتە سەر قوڵایی بابەتەکە و، هاوار دەکات کەئەمە جەنگی نێوان دادپەروەران و زیادەڕەکارانەو، دەڵێت: ((عەلی لەخەلیفەکانی ڕاشیدینەو، معاویەش یەکەم پادشایە، بابەتەکە لەمجۆرەیەو، جەنگی نێوان پادشا خۆسەپێنەرەکانە لەگەڵ دادپەروەران وشوێنکەوتووانی ڕەوتی خەلیفەکانی ڕاشیدین)) [1].

هەندێکجاریش زۆرلەخۆی دەکات و دەرچوونی خەڵکی شام بۆ سەر عەلی بۆ دوو قۆناغ دابەش دەکات: قۆناغی پاش ناوبژیوانیەکەو، قۆناغی پێش ناوبژیوانیەکەو، دەڵێت: ((ڕووی دووەم ئەوەیە (مەبەستی خەڵکی شامە) لەو کاتەدا بۆ زیادەڕەوکار، بەهۆی ئەوەی لەدانانی پێشەوادا لێیان دەرکەوت و، ناونانی بەئەمیری باوەڕداران و، ئەوانەی نەفرەتیان لەپێشەوای حەق و ئەوانە کرد، ئەمانە زیادەڕەوکارن بەپێچەوانەی شەڕکردن بەرلەوە (واتە پێش ناوبژیوانیەکە)، کەئەمەیان کوشتاری ئاشوبە)) [2]، بەگوێرەی ئەم دابەشکارییە زۆرلەخۆکردووە ئیبن تەیمیە دەگاتە ئەوەی کەهاوەڵانی عەلی هەڵەیان کرد کاتێ لەگەڵیدا جەنگان پێش ناوبژیوانیەکە-چونکە ئەو جەنگەیان لەوکاتەدا جەنگی ئاشوب بووە- وهەڵەیان کردووە کاتێ پاش ناوبژیوانیەکە نەجەنگان بۆی -چونکە شەرکردن بووە جەنگی نێوان دادپەروەران و زیادەڕەوکاران [3].

---

[1] ـ مجموع الفتاوى ٤/٤٤٤.

[2] ـ مجموع الفتاوى ٤/٤٤٣.

[3] ـ بروانە قسەکردنی لەمبارەیەوە لە مجموع الفتاوى ٤/٤٣٤-٤٥٢.

ئەگەر ئیبن تەیمە پێچەوانەی ئەمەی بوتایە قسەکانی وردترو زیاتر لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەردا –صلی الله علیە وسلم- گونجاوتر بوو: لەپێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) بەتەواوتری گێڕدراوەتەوە کەفەرموویەتی عەمار دەستەیەکی زیادەڕەوکار دەیکوژێت، بەپێی ئەوەی کۆدەنگی لەسەرە عەمار بەر لەناوبژیوانیەکە کوژراوە، ئیتر ئەبێ زیادەڕەوی خەڵکی شام کەی بوبێت ئەگەر پێش ناوبژیوانیەکە نەبێت، کاتێ کەشمشێرەکانیان وەشاندو عەماریان کوشت؟!

ئەمە تەنها نمونەیەکە لەسەر ئەو شڵەژانەی کەئیبن تەیمیە تیی دەکەوێت لەکاتی باسکردنی جەنگی (صفین)دا، ئەمەش شڵەژانێکە تەنانەت لەدەربڕین و شێوازیدا دەردەکەوێت و، هەرکەس هاوڕێیەتی کتێبەکانی شێخی کردبێت و کاری تێدا کردبن هەستی پێدەکات.

لەدەرکەوتەکانی ئەم شڵەژان وزۆرلەخۆکردنە دووبارەکردنەوەیەتی لە((منهاج السنة))و کتێبەکانی دیکەیدا کە معاویە لەکاتێکدا عەلی لەژیاندا بووە هەوڵی خەلیفایەتی نەداوە و، ململانێی لەگەڵ عەلیدا لەسەر خەلافەت نەکردووە، هەندێکجار بەڕەهاییەو، کاتێ کەباسی عەلی دەکات –بۆ نمونە- دەڵێت: ((.. لەسەردەمی خەلافەتی عەلیدا هەرگیز بانگەشەی ئەوەی نەکردووە کەئەم لەپێشترە لەعەلی بۆ پێشەوایەتی)) [1]، هەندێکجاریش تاڕادەیەک خۆی دەپارێزێت و، ڕاشکاوانە دەڵێت کەململانێی معاویە لەگەڵ عەلیدا لەسەر پێشەوایەتی پاش بڕیاری دوو ناوبژیوانەکە بووەو، دەڵێت: ((.. بەهەمان شێوە معاویە هیچ کەس بەیعەتی

[1] ـ منهاج السنة ٣٢٨/٦.

لەسەر پێشەوایەتی پێنەداوەو، ئەو کاتەشی لەگەڵ عەلیدا دەجەنگا کەس بەیعەتی لەسەر پێشەوایەتی پێنەداوەو، ناوی ئەمیری باوەڕدارانیشی لێ نەنراوەو، هیچ کەس بەوە ناویان نەبردووەو، معاویەش پێش بڕیاری دوو ناوبژیوانەکە بانگەشەی ئەوەی نەکردووە)) [1].

هەموو ئەم زۆرلەخۆکردنە لەلێکدانەوە، دژیەکە لەگەڵ دەقی ڕاستی ڕاشکاودا.

بەڵگەکانی چاوچنۆکی معاویە بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات لەکاتی ئاشوبەکەدا زۆر زۆرەو، هەموو گوزارشت لەوە دەکەن کەمەبەستی دەرچوونی لەدژی خەلیفەی چوارەم عەلی تەنها بۆ تۆڵەسەندنەوەی خەلیفەی سێیەم نەبوو، بەڵکو لەهەوڵەکانیدا لەیەکەم هەنگاوەوە چاوی بڕیبووە دەسەڵات، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کەلەسەر شێوازی تۆڵەسەندنەوە -بەبێ دادگایکردن- بەشێوەی سەردەمی نەفامی عەرەب لەدەوڵەتی ئیسلامیدا هیچ جێگایەکی نەمابوو، لەبەڵگەکانی کەململانێی معاویە لەگەڵ عەلیدا لەسەر خەلافەت بووەو، چاوی بڕیوەتە ئەوەی ببێتە پادشا:

**یەکەم:** فەرموودەکەی بوخاری لەچیرۆکی ناوبژیوانیەکەدا: ((لەعیکریمەی کوڕی خالید لەئیبن عومەرەوە، دەڵێت: چوومە لای حەفصە، نینۆکەکانی ئاوی لێدەچوڕا، وتم: خەڵکی ئاوایان بەسەرهاتووە کەدەبینیت ومن هیچم لەکارەکەدا نیە، حەفصە وتی: لەڕاستیدا ئەوان چاوەڕوانت دەکەن و، مەترسی ئەوەم هەیە خۆ دورگرتنت لەوان جیابوونەوەی لێ بکەوێتەوە، هیچ لێ نەگەڕا هەتا ڕۆشت، کاتێ جیابوونەوە ڕویدا معاویە قسەی بۆ خەڵک کردو،

---

[1] ـ منهاج السنة ٦/٣٣٠.

وتی: هەرکەس دەیەوێت لەمەدا قسە بکات باسەردەمی خۆیمان بۆ بخاتە ڕوو، ئێمە لەخۆی و لەباوکیشی لەپێشترین، حەبیبی کوڕی مسلمە وتی: ئایا وەڵامت دایەوە؟ عبداللە وتی: ویستم وهات بەبیرمدا وەڵامی بدەمەوەو بڵێم: بۆ ئەم کارە لەتۆ لەپێشترم، ئەی کێ لەسەر ئیسلام لەدژی تۆو باوکت جەنگا، ترسی ئەوەم هەبوو قسەیەک بکەم و خەڵکەکە جیابوونەوەیان تێبکەوێت و، خوێنڕێژی لێبکەوێتەوەو، ئەوەم بکەوێتە سەرشان و، ئەوەی خوای گەورە لەبەهەشتدا ئامادەی کردووە هاتەوە یادم، حەبیب وتی: خۆت پاراست وبێگوناه بوویت)) [1]، لەگێڕانەوەی تەبەرانیدا: ((لەئیبن عومەرەوە، وتی: کاتێ ئەو ڕۆژە هات گەخەڵکی بۆ عەلی ومعاویە لە دەومەت جەندەل کۆبوونەوە، حەفصە پێی وتم: بۆ تۆ گونجاو نیە لەئاشتەواییەک دوا بکەویت کەخوای گەورە نێوانی ئومەتی محەمەد (صلی اللە علیە وسلم)ی تێدا ڕێکدەخات، تۆ زاوای پێغەمبەری خوایت و کوڕی عومەری کوڕی خەتابیت، معاویە لەو ڕۆژەدا بەختێکی گەورەی هەبوو، وتی: کێ چاوی بڕیوەتە ئەم کارە یان ئاواتەخوازیەتی یان گەردنی بۆ بەرز دەکاتەوە؟ ئیبن عومەر دەڵێت: بەر لەو ڕۆژە لەدڵی خۆمدا باسی دونیام نەکردبوو، هات بەخەیاڵمدا بڵێم: ئەو کەسە دەیەوێت کەلەسەر ئیسلام لەتۆ و باوکی تۆیدا تا موسڵمانی کردن، بەڵام بەهەشت وخۆشیەکانیم هاتەوە یاد و قسەم نەکرد)) [2]، گێڕانەوەکەی ئیبن سەعد بۆ ئەم چیرۆکە ڕاشکاوانەترە لەدووانەکەی پێشتر: ((لەحەبیبی کوڕی ئەبی سابتەوە، لەئیبن عومەرەوە، وتی: کاتێ وادەی عەلی ومعاویە بوو

---

[1] ـ البخاري ١٥٠٨/٤.

[2] ـ مجمع الزوائد ٢٠٨/٤ و هیثمی دەڵێت: طبرانی لە (الکبیر)دا گێڕاویەتیەوەو گێڕەوەکانی متمانەپێکراون))و لەگەڵ (سیر أعلام النبلاء) ٢٢٤/٣ بەراوردی بکە.

لەدەومەت جەندل هیچ شتیک لەوە مەترسیدارتر نەبوو لای معاویە کەئەو وعەلی لەخەلافەت دەربچن، بۆیە لەو رۆژەدا معاویە هاتە سەر بەختی من و وتی: ئەوە کێیە چاوی بڕیوەتە ئەم کارە یاخود گەردنی بۆ درێژ دەکات، ئیبن عومەر دەڵێت: پێش ئەوە باسی دونیام لەدڵی خۆمدا نەکردووە، هات بەخەیاڵمدا بڵێم: ئەوکەسە چاوی لێیەتی کەلەتۆ وباوکی تۆیدا لەسەری هەتا هێنانیە ناوی، پاشان بەهەشت و خۆشیەکان وبەروبومەکانیم هاتەوە یادو وەڵامم نەدایەوە)) [1].

گوزارشتی ئەم چیرۆکە بەسە بۆ ئەوەی بزانین کرۆکی ململانێی معاویەو عەلی لەسەر بکوژانی عوسمان نەبوو، بەڵکو سەبارەت بەخەلافەت و دەستگرتنە بەجڵەوی فەرمانڕەوایەتی کاروباری موسڵمانانەوە بوو، معاویە مەترسی ئەوەی ڕێگای هەوڵدانی بۆ بەدەستهێنانی خەلافەت لێ بگیرێت، زیاتربوو لەهەڵهاتنی بکوژانی خوێنی خەلیفەی شەهید، لەبەر ئەوە پاش ئەوەی کارەکەی بۆ یەکلا بوویەوەو، دەوڵەتی ئیسلامی لەهەموو لایەکەوە گرتە دەست لەدژی بکوژان نەجولایەوە، بەپێی خودی ئیبن تەیمیە لەقسەکانی پێشترو ئەمانەشیدا.

**دووەم:** ((لەئەبو بردەوە (کوڕی ئەبو موسای ئەشعەری) لەئەبو موساوە دەڵێت: معاویە بۆی نووسیم: دواتر، عەمری کوڕی عاص بەیعەتی پێداوم لەسەر ئەوەی کەدەمەوێت، سوێند دەخۆم بەخوا ئەگەر تۆش وەک ئەو بەیعەتم پێ بدەیت ئەوا یەکێک لەکوڕەکانت دەکەمە فەرمانڕەوای کوفەو، یەکێکیشیان بەفەرمانڕەوای بەسرە و، هیچ دروازەیەکت بەڕوودا داناخرێت و، هەموو پێویستیەکت بۆ

---

[1] ـ ابن سعد: الطبقات الكبرى ١٨٢/٤.

جێبەجێ دەکرێت و، ئەم نامەیەشم بەخەتی خۆم نووسیووە بۆت، تۆش بەدەستی خۆت بۆم بنوسەرەوە، ئەویش (ئەبو موسا) بۆی نووسی: دواتر، تۆ سەبارەت بەمەترسیدارترین کاری ئەم ئومەتە نامەت بۆ نووسیم، باشەچی بەپەروەردگارم بڵێم کەگەڕامەوە بۆ لای، هیچ پێویستم بەوە نیە کە بۆت پێشنیار کردووم و، والسلام علیک)) [1]، زەهەبی لەسەر ئەم نامە گۆڕینەوەیە قسەی کردووەو دەڵێت: ((وتم: ئەبو موسا ڕۆژوەوان و شەونوێژکارو دونیانەویست و خواپەست بوو، لەو کەسانە بوو کەزانست و کارو جیهاد و سنگپاکی تێدا کۆبووبووەوە، دەسەڵاتداری نەیگۆڕی و، دونیا کاری نەکردە سەری)) [2].

ئەم نامە گۆڕینەوەیە جیاوازی دونیا بینی ئەبو موسای ئەشعەری بۆ بابەتی خەلافەت دەریدەخات، کەبە((مەترسیدارترین کاری ئەم ئومەتە))ی داناو لەخوای گەورە دەترسێت لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات لەسەری، لەگەڵ دونیابینی معاویە کەهیچ نارەحەتیەکی لەدەستبەسەرداگرتن و دابەشکردنی دەستکەوت و پۆستەکاندا نەدەبینی، شمشێرو ڕمەکانی دەهاویشت، وەک ئەوەی نامەکە دەریدەخات کەئیبن تەیمیە ورد نەبووە لەجەخت کردنەوەی لەسەر ئەوەی کەمعاویە((هیچ کەس لەسەر پێشەوایەتی بەیعەتی پێنەداوەو، ئەو کاتەشی کەلەدژی عەلی دەجەنگا کەس لەسەر پێشەوایەتی بەیعەتی پێنەدابوو))!!

ئەوەتا معاویە خۆی لێرەدا هاوار دەکات کەعەمری کوڕی عاص لەسەر ئەوەی کەدەیەوێت بەیعەتی پێداوە، جا دەبێ عەمر لەسەر

---

[1] ـ سیر أعلام النبلاء ٣٩٦/٢و، شێخ شعیب ئەرنائوتی لێکۆڵەری کتێبەکە دەڵێت: ((سەنەدەکەی صەحیحە)).

[2] ـ سیر أعلام النبلاء ٣٩٢/٢.

چی بەیعەتی پێدابێت؟ لەوانەیە هەندێک لەزۆرلەخۆکاران بڵێن: عەمر! بەیعەتی لەسەر تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان پێدابێت!! بەڵام معاویە ئەو کاتەی جڵەوی فەرمانڕەوایی ئومەتی کەوتە دەست وازی لەبابەتی بکوژانی عوسمان هێنا، وەک ئەوەی ئەو بابەتە لەئارادا نەبوبێت، ئەمە بەدانپێدانانی خودی ئیبن تەیمیە گەدەڵێت: ((معاویە (خوا لێی ڕازی بێت) کەئەوانەی پشتیوانی بوون دەڵێن: ئەو لەشەڕ کردن لەگەڵ عەلیدا لەسەر حەق بوو، چونکە داوای کوشتنی بکوژانی عوسمانی دەکرد، کاتێ دەسەڵاتی کەوتە دەست و خەڵکی لێی کۆبوونەوە بکوژانی عوسمانی نەکوشت، ئەگەر کوشتنیان واجب بوبێت ئەوا خۆ ئەو توانای هەبوو، ئەنجامدانی ئەو کارە بەبێ شەڕکردن لەگەڵ موسڵمانان لەپێشتر بوو لەوەی لەدژی عەلی وهاوەڵانی لەپێناوی ئەوەدا بجەنگێت، خۆ ئەگەر معاویە بکوژانی عوسمانی بکوشتایە، ئەوا ئاشوبی گەورەتر لەوەی لەشەوانی (صفین)دا رویدا رووی نەدەدا... ئەوەشی دەڵێت: کوژرانی ئەو خەڵکە زۆرەی لەنێوان ئەو وعەلیدا کوژران معاویە ڕاست بوو چونکە لەپێناوی کوشتنی بکوژانی عوسماندا بوو، ئەوا کوژرانی لەوە کەمتر لەپێناوی کوشتنی بکوژانی عوسماندا لەپێشتر بوو بۆ ئەوەی لەسەر ڕاست بێت، ئەو کەفەرمانڕەوایی کەوتە دەست ئەو کارەی ئەنجام نەداو، بکوژانی عوسمانی نەکوشت)) [1].

پاشان مانای بەڵێندانی معاویە لەنامەکەیدا بۆ ئەبو موسا چییە کەکوڕەکانی دەکاتە فەرمانڕەوای بەسرەو کوفە -کەئەو دوو شارە

---

[1] ـ بڕوانە: (فیض القدیر شرح الجامع الصغیر)ی مەناوی (٤٤٧/١، ٤٤٨) فەرموودەی ژمارە (٦١٥).

لەژێر دەسەڵاتی عەلیدا بوون لەو ڕۆژەدا- جگە لەوەی کەمعاویەو عەمر ململانێیانلەگەڵ عەلیدا لەسەر خەلافەت دەکردو، بەلەوە کەمتر ڕازی نەبوون؟

لەڕاستیدا پێشەوا حەسەنی بەسری چاکی کردووە کاتی بەبێ زۆرلەخۆکردن بابەتی ناوبژیوانیەکەی دیاری کردووەو دەڵێت: (( دوو داوەرەکە ئەبو موساو عەمر، یەکێکیان دونیای دەویست و، ئەویتریان قیامەتی دەویست)) [1].

**سێیەم:** ((لەمیمون (کوڕی مهران) گێڕاویەتیەوە: معاویە عەمری کوڕی عاصی هاندا تابزانێت (عبداللە)ی کوڕی عومەر بیر لەچی دەکاتەوە، شەڕکردنی دەوێت یان نا، وتی: ئەی باوکی عبدالرحمن چی ڕێگرە لەوەی بێیتە دەرەوەو بەیعەتت پێ بدەین، لەکاتێکدا تۆ هاوەڵی پێغەمبەری خوایت (صلی اللە علیە وسلم) و، کوڕی ئەمیری باوەڕدارانیت و، تۆ لەهەمووان ڕەواتری بۆ ئەم کارە؟ وتی: ئایا هەموو خەڵکی لەسەر ئەو قسەیەی تۆن کەدەیکەیت؟ وتی: بەڵێ تەنها چەند کەسێکی کەم نەبێت، وتی: ئەگەر تەنها سێ کەسی ناتەواو ناڕازی (أعلاج بهجر) بمیننەوە ئەوا هیچ پێویستیم پێ نیە. (میمون)وتی: تێگەیشت کەشەڕکردنی ناوێت. وتی: ئایا بەیعەت بەکەسێک دەدەیت کەخەریک بێت هەموو خەڵکی لەدەوری کۆببنەوەولەدوو زەویەکەو ماڵ وسامان هێندەت بۆ بنوسێت کەئیتر خۆت و کوڕەکەت پێویستیتان بەهیچ نەبێت؟ وتی: ئۆف لەدەست تۆ! لای من بچۆ دەرەوەو ئیتر نەیەیتە لام، تیابچیت! ئاینی

[1] ــ سیر أعلام النبوة ٢/٤٠١و شێخ شعیب ئەرنائوتی لیکۆڵەری دەڵێت: ((گێڕەرەوەکانی متمانەپێکراون)).

من بەدینارو درهەمی ئێوە ناکڕدرێت و، هیواخوازم بەدەستی سپی پاکەوە لەدونیا دەربچم)) [1].

هەوڵدانی بۆ کڕینی بەیعەت لەعبداللە کوڕی عومەر، کە پاش داوەریەکە-وەک دواتر دەبینین- رکابەری یەکەمە بۆ وەرگرتنی کارەکەو هیچ تێکەڵکردنێک لەبارەی پاڵنەرەکەی معاویەو عەمر ناهێڵێتەوە، خوای گەورە لەئێمەو ئەوانیش خۆش ببێت.

**چوارەم:** بەردەوامبوونی معاویە -بەهاوکاری عەمر- لەکڕینی بەیعەت بەپارەو سامان و لەسیاسەتیشدا ڕێگای وایان گرتەبەر کەبەدرێژایی ماوەی حوکمڕانیەکەی گونجاو نەبوو، لەکاتی دەسەلاتدانی بەیەزیدی کوڕیشی: ((لەمحەمەد (ئیبن سیرین)ەوە، گێڕاویەتیەوە: کاتێ معاویە هاتە کوفەو خەڵک لەدەوری کۆبوونەوە، عەمری کوڕی عاص پێی وت: حەسەن لای خەڵکەکە لەپێشترە بەهۆی خزمایەتی نزیکییەوە لەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)و، تازە پێگەیشتووەو (عیی)بەمەبەست نەگەیشتووە، فەرمانی پێ بکە قسە بۆ خەلکەکە بکات، ئەویش ئەوە دەکات و لەدڵی خەلکیدا دەشکێت، ئەویش ڕازی نەبوو، هیشتا لەوێ بوون فەرمانی پێکرد، (حەسەن) هەستایەوەو چووە سەر میمبەر بەبێ ناوبردنی معاویە سوپاس وستایشی خوای گەورەی کردو، پاشان وتی: ئەگەر بتانەوێت لەنێوان (جابلق)و (جابرس) کەسێک بدۆزنەوە کەباپیری پێغەمبەر بێت ئەوا جگە لەمن و براکەم کەس نادۆزنەوە، ئێمە بەیعەتمان داوە بەمعاویەو وادەبینین خوێن

---

[1] ـ طبقات ابن سعد ١٦٤/٤و سير أعلام النبوة ٢٢٨/٣و، شێخ شعیب ئەرنائوتی لێکۆڵەری دەڵێت: ((سەنەدەکەی صەحیحە)).

نەڕشتن باشترە، نازانم لەوانەیە ئاشوب بێت بۆ ئێوەو خۆشییەکی کاتی، بەدەستی ئاماژەی بۆ معاویە کرد.

معاویە توڕە بوو، پاش ئەو وتارێکی بێئاگایانەی خراپی (عيبة فاحشة) دا، پاشان لەمیمبەر هاتە خوارەوەو وتی: مەبەستت لەو قسەیەت چی بوو ئاشوب و خۆشیە بۆتان؟ وتی: مەبەستم ئەوە بوو کەخوای گەورە مەبەستیەتی پێی)) [1]، ((لەنافیعەوە گێڕاویانەتەوە کەمعاویە ویستی ئیبن عومەر بەیعەت بەیەزید بدات، ئەویش ڕازی نەبوو، وتبووی: بەیعەت بەدوو ئەمیر نادەم، سەدهەزار درهەمی بەکەسێکدا بۆ ناردو پێی وت: چی ڕێگرە لەوە بەیعەتی پێبدەیت؟ (ئیبن عومەر)وتی: ئەوە لەبەر ئەمەیە!! –واتە پێدانی ئەو سامانە لەپێناوی بەیعەتدانادایە– ئاینەکەم کەوابوو هەرزانە)) [2].

هەموو ئەم دەقانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەمعاویە بەکردارو گوفتار هەوڵی بۆ دەسەڵات داوەو، ئارەزووی خۆی بۆ سەرکردایەتی ئومەت بەبێ پێچ وپەنا ڕاگەیاندووە، پاش ئەوە بوترێت کەململانێی لەگەڵ عەلیدا لەسەر خەلافەت نەکردووەو هەوڵی بۆ نەداوە.. خۆماندوو کردنێکی بێ ئەنجامە، واباشتر بوو بۆ شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە کەپاکی بکاتەوە لێی.

---

[1] ــ سير أعلام النبلاء ٢٧١/٣و شێخ شعیب ئەرنائوتی لێکۆڵەری وتوویەتی: ((سەنەدەی صەحیە))و، بیهقی هەندێکی لێهێناوە ١٧٣/٨، طبرانی لە(الكبير)دا گێڕاویەتیەوە ٨٧/٣و، هیثمی لەبارەی فەرموودەکەی طبرانی وتوویەتی: ((گێڕەرەوەکانی متمانەپێکراون)) (مجمع الزوائد ٢٠٧/٤).

[2] ــ فتح الباري ٧٠/١٣ وسير أعلام النبلاء ٢٢٥/٣ و شێخی شعیب ئەرنائوتی لێکۆڵەری دەڵێت: ((سەنەدەکەی صەحیحە)).

لەکاتێکدا ڕۆڵی معاویە لەوە گەورەترە کەتەنها دەرچوون بێت لەکۆمەڵ و ململانێ لەسەر تەواوی کارەکە، هەر ئەو بووسیستمی پاشایەتی خشتە جێی دەوڵەتی خەلافەت و، ئەو ڕێگا خراپەی لەئیسلامدا داهێنا و، بەهۆیەوە دەروازەی ئەو ستەمانەی کردەوە کەنەوەستاوەو، ئەو خوێنانەش کەماوەی چواردە سەدەیە وشکی نەکردووەو، بونیاتی دەسەڵاتی لەچوارچێوەی بنەماکانی شەرع دەرهێنا: وەک ڕاوێژو بەیعەت ودادپەروەری... بەرەو لۆژیکی هێزو یاسای دارستان، ئەمەش کارێکە هەتا ئێستاش موسڵمانان لەخراپەکارییەکانیدا دەژین.

ئیدی گەر لێکدانەوە بۆ هەڵوێستەکانی معاویە لەکاتی ئاشوبەکەدا بکەین یان نەیکەین، ئەوا هەڵس وکەوتی سیاسی دواتر بەجۆرێک نیە کەلێکدانەوەی باش هەڵبگرێت، ئەو ڕەفتارانەشی کاریگەری لەخودی ئاشوبەکە زیاتر بوو لەسەر ئیسلام وموسڵمانان، بگرە لەهەر ڕووداوێکی مێژوویی تر لەماوەی چواردە سەدەی رابوردوودا، چونکە ئەو ئاشوبەی کەمعاویە سەرکردایەتی کرد پایەکانی خەلافەتی ڕاشیدینی لەناوبرد، بەڵام ئەوەی پاش ئاشوبەکە معاویە ئەنجامیدا لەمیراتی دەسەڵات بۆ کوڕەکەی بەترساندن وتۆقاندن کاریگەریەکەی خراپتر بوو، دەرگاکانی گەڕاندنەوەشی داخست، ئیتر با زۆرلەخۆکاران چۆنیان دەوێت زۆرلەخۆیان بکەن لەلێکدانەوەی ئەوەی لەکاتی ئاشوبەکەدا ڕوویدا، بەڵام ئەوەی دواتر ڕویدا هیچ بۆ لێکدانەوەی نادۆزنەوە، ئەگەر بەڕاستی لەو کەسانە بن کەپیرۆزی بنەماکان بخەنە پێش پێگەی کەسەکانەوە.

لەڕاستیدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) –هەروەک پێشتر بینیمان– پاشایەتی پێ خۆش نەبوبێت ئیدی بۆ ئێمە ڕقمان لێی

نەبێت و، خۆشیمان لەو کەسەش نەیەت کەهێناویەتیە ناو ئیسلام وموسڵمانان؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردووین دەستبگرین یەسونەتەکانی وسونەتەکانی خەلیفە ڕاشیدینەکانی پاش خۆی، کەبەتوندی دەستی پێوە بگرین، ئیتر بۆ ئێمە وەک فەرمانی پێکردوین بەتوندی دەستی پێوە نەگرین؟ بۆچی بەسەرە قەڵەمێک و زۆر لەخۆکردن و لێکدانەوە بۆ کەسانێک باسی بکەین کەبێگوناھ نین و، لەپێناوی پاراستنی ئەو کەسانەدا پیرۆزی بنەما ئیسلامیەکان بەهەدەر بدەین؟

ئیبن تەیمیە خۆی دوور گرتووە لەزۆرلەخۆکردن لەلێکدانەوەدا بۆ پێشینەکانی وەک سەعدی کوڕی عوبادە-هەروەک پێشتر ڕوونمان کردەوە- بەیعەت نەدانی سەعدی بەئەبوبەکر وا لێکداوەتەوە کەسەعد ((ئارەزوو لەدڵیدا مابوویەوە)) [١]، هەروەک شرۆڤەی دواکەوتنی عەلی لەبەیعەت پێدانی ئەبوبەکر کردووە کە((ئەو فەرمانڕەوایەتی بۆ خۆی دەویست)) [٢]، لەحاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعەوە (خوا لێی ڕازی بێت) کەلەپێشینەکانی بەشداربووی بەدرە دەگێڕنەوە: ((..خراپەی ئاشکرای هەبوو، وەک نووسینی هەواڵەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ بێباوەڕان و، خراپەکانی بەرانبەر ژێردەستەکانی)) [٣].

بەڵکو ئیبن تەیمیە لێکدانەوەی بۆ دوو خەلیفە ڕاشیدەکەش عوسمان وعەلی نەکردووەو، ڕایگەیاندووە کەهەریەک لەعوسمان وعەلی مۆڵەتی بەهەندێک ڕێپێدان داوەو، هەندێک کاری ئەنجامداوە کەنابێت تێیدا شوێنی بکەون و، وتوویەتی: ((ئەوەی عوسمان

---

[1] ـ منهاج السنة ٣٣٥/٨.

[2] ـ منهاج السنة ٤٥٠/٧.

[3] ـ مجموع الفتاوى ٤٥٩/٤-٤٦٠.

وعەلی لەئیجتیهاد کردیان-کەپێش ئەوان ئەبوبەکرو عومەر باشتریان کردبوو، دەقەکان بەپەسەندتریان دەزانی-بووە هۆی پەرتەوازەیی ئومەت و، فەرمان ناکرێت بەوەی شوێنیان بکەوین تێیدا، چونکە ئەوە لەسونەتەکانی خەلیفەکانی ڕاشیدین نیە، بەهۆی ئەوەی ئەبوبەکرو عومەر بەویست و ترس و بەدەر لەلێکدانەوە لەخوێن وساماندا ئومەتیان بەڕێوە بردو، عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت) ئارەزو ولێکدانەوە لەساماندا زاڵکردو، عەلی ترس ولێکدانەوە بۆ خوێنی زاڵکرد، ئەبوبەکرو عومەر هەروەک دونیا نەویستیەکەیان لەسامان وسەرکردایەتیدا تەواومەند کردو، عوسمان دونیا نەویستیەکەی لەسەرکردایەتیدا تەواومەند کردو، عەلی دونیا نەویستیەکەی لەساماندا تەواومەند کرد)) [1]، بەلاّم مرۆڤ سەرسام دەبێت کاتیک ئاسانکاری وزۆرلەخۆکردن لەبەرگریکردن لەمعاویە دەبینێت، لەو کەسەوە دەبینێت کە ئەم قسە ڕاشکاوانەی سەبارەت بەخەلیفەکانی ڕاشیدین وپێشینەکان کردووە!!

ئەگەر سەعد لەئارەزوو پاک نەبێت و، عەلی لە((لێکدانەوە لەخوێن)) پاک نەبێت و، عوسمان لە((لێکدانەوە لەسامان)) پاک نەبیت بەپێی شیکاری ئیبن تەیمیە.. ئیتر بۆ دان نەنێین بەوەی کەمعاویەو عەمر لەچاوتێبڕینی پاشایەتی پاک نەبوون و، بەڵگەی زۆریشمان لەسەر ئەوە لەبەر دەستایە..

واباشتر بوو بۆ ئیبن تەیمیە کەدان بنێت -وەک ئەوەی هەمیشە کردوویەتی- بەسروشتی ئاوێتەی ئاشوب و، تێکەڵبوونی گومانەکان و ئارەزووەکان تێیداو، ئەوە قبول بکات کەپاڵنەرەکانی

---

1 ـ مجموع الفتاوى ٢٣/٣٥.

معاویەو عەمر تەنها گومانی تۆڵەسەندنەوەی خەلیفەی شەهید نەبووە، بەڵکو تێکەل بووە بەگومانی دەسەڵات و خۆشەویستی دونیا و، هاودەنگی بەشداربووانی (جمل)و (صفین) لەدروشمدا – داواکردنی خوێنی عوسمان- نابێتە پاساو بۆ یەکسانیکردن لەنێوانیاندا لەپاڵنەرەکاندا، پاش ئەوەی بەشدارانی (صفین) چاوتیبڕینی دەسەڵاتیان لایان بۆ ئاشکرا بوو، هەوڵی تەواویان بۆدا، بەپێچەوانەی بەشداربووانی (جمل)ەوە.

لەو باوەڕەدام کەئیبن تەیمیە گەر پابەند بووایە بەمەنهەجێکی خۆیەوە ئەو جیاواز لەوە قسەی دەکرد، تا بگونجێت لەگەڵ خستنەرووی گشتی وشیکارە قوڵەکانی بۆ ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت).

هەرچۆنیک بێت وێڕای ئەو تیبینیانە لەسەر مەنهەجی ئیبن تەیمیە، ئەوا هێشتا بەقوڵترین وفراوانترینی ئەو کەسانە دەمێنیتەوە کەلە ناکۆکییە سیاسیەکانی نیوان هاوەڵانیان کۆڵیوەتەوەو، بەردەوام تێبینی لەسەر مەنهەجەکەی بەراورد بەو هەڵانەی کەسانی تر تێی کەوتوون زۆر کەمە، هەروەک دواتر لەبەشەکانی تری ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ڕوونی دەکەینەوە.

بۆ ئەوەی ئەم ڕێسا مەنهەجیانە لەهزری خوێنەری بەڕێزدا زیاتر ڕوون ببێتەوە، ئەم توێژینەوەیە بەبەراوردێکی خێرای مەنهەجی ئیبن تەیمیەو فەرموودەناسان لەلێکۆڵینەوەی ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان لەگەڵ مەنهەجی ئیبن عەرەبی و قوتابیە هاوچەرخەکانیدا –ئەوانەی کەمن بەقوتابخانەی شیعەگەری سونی ناویان دەبەم- دەست پێدەکەین هەتا خراپەکاری مەنهەجی باو ئەمڕۆدا لەقسەکردن لەسەر ئەم بابەتانە ڕوون ببێتەوە.

قازی ئەبوبەکر ئیبن عەرەبی (٤٦٨-٥٤٣ک) بەزانایەکی ناسراو لەزانایانی مالکی پایەدارێک (لەپایەدارەکانی مالیکیەکان) [١] دادەنرێت و، لەزانایانی ئەندەلوسە کەبەشداریان هەبوو لەچەندین زانستی جیاوازدا لەوانە تەفسیرو زانستەکانی قورئان وفەرموودەو فیقهو ئوصول و ئەدەب و نەحو و مێژوو، سیوتی باسی ئەوەی کردووە کە((دانراو ولێهاتوویی و کۆکردنەوەی هەبووە لەئەدەب و ڕەوانبێژی و، ناوبانگی زۆر بووەو، لەزانستدا دەریا بووەو، عاقڵمەندو، خاوەن پێگەو، ئاکاری بەرز بووە)) [٢].

زەهەبیش باسی ئەوە دەکات کە ((زانستێکی زۆرو پشتیوانیەکی بەرزی بردە ئەندەلوس)) [٣]، ئیبن فرحون بەوە وەسفی کردووە کە

---

[1] ـ ابن حجر: فتح الباري ٢٣٨/١٠ والمباركفوري: تحفة الاحوذي ١٤٩/٦.

[2] ـ السيوطي: طبقات الحفاظ ٤٦٨/٢.

[3] ـ الذهبي: تذكرة الحفاظ ١٢٩٥/٤.

((پێشەوای ناودار حافزو دەریا بوو، کۆتا زانایانی ئەندەلوس و، دواین پێشەواو حافزیان بووە))[1].

هەروەها ئیبن کەسیر وا باسی دەکات کە ((زاناو فەقیهو دونیا نەویست و خۆاپەرست بووە)) [2].

ئیبن عەرەبی لەزۆربەی زانستەکاندا دانراوی هەیە، لەبەناوبانگترین دانراوەکانی ((أحكام القران)) و((سراج المريدين)) و((القبس فى شرح موطأ الامام مالك بن أنس)) و((عارضة الاحوذي فى شرح سنن الترمذي)).

لەنێو کتیبەکانی قازی ئیبن عەرەبیدا کتێبێکی هەیە بەناوی ((العواصم من القواصم)) تێیدا بیروباوەڕی ئیسلامی لەسەر ڕێبازی ئەشعەریەکان خستۆتە ڕوو، بەشێکیشی تەرخان کردووە بۆ ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان، بەتایبەتی هەردوو جەنگی (جمل)و (صفين).

خوالێخۆشبوو شێخ محب الدين خەتیب ئەم بەشەی لەکتێبێکی بچوکدا بڵاو کردۆتەوەو، هەندێکی لەسەر نووسیوە، کەنووسینەکەی ئەمیش لەخستنە رووی بابەتەکەدا لەمەنهەجی ئیبن عەرەبی دەرناچێت، کەزۆربەی لەکتێبەکانی مێژوو سەربوردەیە، بگرە هەندێکی دراوەتە پاڵ هاوچەرخەکان، کەهیچ پەیوەندییەکیان بەو کارە نییەو، هیچ زانیاریەکیان لێی نیە، پاش ئەوەی کتێبەکە چەندین جار چاپ کراو ناوبانگی پەیدا کردو، لەنێو قوتابیانی زانستدا بڵاو بوویەوەو، تەحیقی زۆر لەسەر نوسراو، لەگەڵیدا شێوازی نووسینی نوسەرەکەی لەنێو زۆرێک لەگەنجان و

[1] ـ ابن فرحون: الديباج المذهب ٢٨١/٢.

[2] ـ ابن كثير: البداية والنهاية ٢٢٨/١٢.

قوتابیانی زانستدا بڵاو بوویەوە. ئەو چاپەی کەئێمە پشتمان پێ بەستووە لەکتێبەکە لێرەدا چاپی (دار الجیل)ە ساڵی ١٩٩٤ لەبەیروت چاپ بووەو، لەسەر لاپەڕەکانی یەکەمی پاش لاپەڕەی ناونیشانی کتێبەکە نوسراوە: ((حققه وعلق على حواشيه العلامة الشيخ محب الدين الخطيب. خرج أحاديثه وعلق عليه الاستاذ محمد بن مهدى الاستانبولى، وثقه وزاد فى تحقيقه والتعليق عليه الدكتور محمد جميل غازى))!!

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا کتێبەکە هێشتا پێویستی بەلێکۆڵینەوەی زیاترو قسەلەسەر کردنی زۆرترە!!

## سەرنجی مەنهەجی لەسەر ئیبن عەرەبی

خراپ نیە ئەگەر هەندێک لەو خراپییە مەنهەجیانە بخەینە ڕوو کەلەنووسینەکانی قازی ئیبن عەرەبیدا دەبینرێت و، شوێنکەوتە هاوچەرخەکانیشی لەوەوە بۆیان ماوەتەوە، هەتا ستەم لەپیاوەکە نەکەین –کەزانایەکە لەزانا ناودارەکانی موسڵمانان کەڕێزیان دەگرین– قسەکردن لەسەری بۆ هەندێک لەلێکۆڵەرانی پێشین لێدەگەڕێین کەبەئاگابوون لەم خراپیانەو هۆشداریان لەبارەیەوە داوە:

**یەکەم:** بەدەسەڵات و توندوتیژبوون (السطوة والشدة): سیوتی لەمیانی قسەکانیدا سەبارەت بەژیانی قازی ئیبن عەرەبی دەڵێت: ((...كرايە قازی ئیشبیلیە، کەسێکی بەدەستەڵات وتوندو تیژ بووە..)) [1]، ئەم بەدەسەڵاتبوون وتوندوتیژییە نەنگیەکی ڕەها نیە، بەڵکو لەوانەیە هەندێکجار بۆ دادوەر لەداوەریکردنیدا بەسوود بێت.

---

[1] ــ السيوطي: طبقات الحافظ ٤٦٩/٢و، بەراوردی بکە لەگەڵ الذهبي: تذكرة الحفاظ ١٢٩٥/٤.

ئیبن عەرەبی شانازی کردووە -مافی خۆیەتی- بەجەربەزەییەکەوە لەدادگایکردنداو، وتویەتی: ((دادوەریم لەنێو خەڵکدا کردووەو، پابەندم کردوون بەنوێژو، فەرمانکردن بەچاکەو، رێگری لەخراپە، هەتا رێگری نەکراو لەزەویدا نەمێنێت و، قسەم بەرانبەر دەستبەسەرداگر توندتر بووەو، نارەحەتی لەسەر فاسقەکان زیاتر کردووە)) [1]، قازی عەیازی بەمجۆرە باسی ئیبن عەرەبی کردووە: ((قازی عەیاز وتویەتی: (ئیبن عەرەبی) کرابووە قازی لەشارەکەی خۆی، بەهۆی جەربەزەیی وتوندیی ودەسەڵاتی حوکمەکانیەوە خوای گەورە سوودی بەخەڵکەکەی گەیاند.

شێوەیەکی ترسێنەریشی هەبوو لای ستەمکاران)) [2]، بەڵام گفتوگۆ زانستیەکان وەک دادوەری نیە، دەسەڵات وتوندو تیژی تێیدا کارێکی خراپە، خاوەنەکەی بەرەو بەزاندنی سنووری دادپەروەری و مامناوەندی و ویژدان لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ کەسێک پێچەوانەی بێت دەبات، بەداخەوە ئیبن عەرەبیش کەوتۆتە ئەمەوە.

**دووەم:** نادادپەروەری بەرانبەر ئەوانەی بۆچوونیان پێچەوانەیەتی (التحامل على المخالفين)و، خواردنی مافیان و، قسەکردنی بێویژدانانە بەرانبەریان، خراپ نیە لێرەدا هەندێک نمونە لەگەڵ خستنە رووی کەسانی بەویژدانی ئەهلی عیلم بهێنینەوە لەگەڵیدا:

- ئیبن عەرەبی کەقسە لەسەر زانای پابەرز ئیبن حەزم دەکات دەڵێت: ((..پروپوچێکی بیابانی ئیشبیلیەیە بە ئیبن حەزم

---

[1] ـ ابن العربي: العواصم من القواصم ص١٤٣.

[2] ـ ابن فرحون: الديباج المذهب ٢/٢٨٣و، بەراوردی بکە لەسیوتی: طبقات المفسرين ١٠٥/٢.

ناسراوه... بانگەشەی ئەوەی کردووه پێشەوای ئومەتە، هەڵدەگرێت و دادەنێت و، حوکم دەدات و شەرع دادەنێت، شتی وا دەداتە پاڵ ئاینی خوا کەلەودا نیەو، شتی وا سەبارەت بەزانایان دەڵێت کەئەوکەسانەی بەدڵیش ڕقیان لییانە نەیانوتووەو، لەسەر ڕێگای هاوشێوەی خوای گەورەو صیفاتەکانی دەرچووەو زیادەڕەوی تێدا هێناوە... بەهۆی ئەو شارەزاییەی لەئەدەب و نەسەبدا هەیبوو دەچووە سەردانی پادشایان ئەوەش یارمەتیدەری بوو بۆ گەورەبوون، لەخۆیان دەگرت ودەیانپاراست، کاتێ کەباسی گومانی بیدعەو شیرکی بۆ دەکردن..)) [1]، وەک ئەوەی ئیبن عەرەبی لەبیری چووبێت ((ئەوەی وەک ڕەخنە ئاراستەی ئیبن حەزم دەکرێت وتنی ناشیرینترین دەربڕین و خراپترین وەڵامە بەرانبەر گەورە پێشەوایان)) [2]، ئەمیش هەمان هەڵەی کردووە. زەهەبی قسەی لەسەر ئەو قسانەی ئیبن عەرەبی دەکات بەهێنانەوەی قسەی ئەوانەی بەویژدان بوون بەرانبەر ئیبن حەزم و، دەڵێت: ((وتم: ئەمە قسەیەکی بەویژدانانەیە، ئەمە لەکوێ و قسەی ئەبوبەکری ئیبن عەرەبی و تێگەیشتنی لەزانستی ئیبن حەزم لەکوێ؟)) [3].

قورتبی کەلەوکەسانەیە زۆر ڕێزی ئیبن عەرەبی دەگرن و زۆری لێوە دەگوازنەوە، دەڵێت: ((ئیبن عەرەبی زیادەڕەوی کردووە لە وەڵامدانەوەی ئەبوحەنیفەو نکۆڵی کاتێ ئیشعاری (اشعار الهدی) نەبینیبوو، وتبووی: ((ئەڵێی ئەم (شعیرە)یەی نەبیستووە! ئەو لەنێو زانایاندا لەم بەناوبانگ ترە)) [4]، پاشان بەشێوازێکی زانستی

---

[1] ـ الذهبي: تذكرة الحفاظ ١١٤٩/٣.
[2] ـ ابن حجر: لسان الميزان ١٩٩/٤.
[3] ـ تذكرة الحفاظ ١١٥٢/٣.
[4] ـ تفسير القرطبي ٣٨/٦.

ڕەسەن ڕوونی کردۆتەوە کەئەبوحەنیفە بێئاگا نیە لەو (شعیرە)یە وەک ئەوەی ئیبن عەرەبی بەخەیاڵیدا هاتووە، بەڵکو ئەو بەدەقی دیکە لەفەرموودە وەلامی داوەتەوە کەڕێگری دەکات لەئەشکەنجەدانی ئاژەڵ و شێواندنی))، هەربۆیە قسەکردن ئاسانەو، کارەکە پێویستی بەنادادپەروەری و بێئاگایی نیە.

- بارکفوری دەڵێت: ((ئیبن عەرەبی وتویەتی: ((لەو باوەڕەدام کەسانێک لەبێئاگایان ڕێگریان کردووە پرسیار سەبارەت بەنەهامەتیەکان هەتا ڕوودەدات بکرێت))..ئەمە وەک ئەوەیە کەوتوویەتی، بەلام لەدەربڕینی ((بێئاگایان))دا وەک نەریتی خۆی خراپی کردووە..)) [1].

- ئیبن عەرەبی لەوەلامی تەبەریدا وتوویەتی: ((لەتەبەریدا سەیر ئەوەیە وای دەبینێت کەدوولایەکەی رۆژ بەیانیان و مەغریبە، کەئەوانە دوولای شەون... تەبەری دەڵێت: ((بەڵگەش لەسەری کۆدەنگی هەمووانە لەسەر ئەوەی کەیەکێک لەدوو لایەکە بەیانییە، ئەمەش وادەگەیەنێت ئەوی تر مەغریبە))، لەمەشدا کەس لەگەڵی نەبووە))، قورتبی قسەی لەسەر ئەمە کردووەووتوویەتی: ((وتم: ئەمە نادادپەروەرییە لەئیبن عەرەبیدا کەوەلام دەداتەوەو، لەوەشدا کەس دەنگی لەگەڵ ئەو نیە، لە موجاهیدەوە باسمان کرد کە لای یەکەم نوێژی بەیانییە ..)) [2].

- **سێیەم:** وەلامدانەوەی فەرموودەی صەحیح و ڕووداوی سەلمێنراو (رد الاحادیث الصحیحة والوقائع الثابتة): ئەگەر

---

[1] ـ تحفة الاحوذي ٨/٣٣٥و بەراوردی بکە لەگەڵ فتح الباري ٨/٢٨٠.

[2] ـ تفسير القرطبي ٩/١٠٩.

پێچەوانەی بۆچوونی فیقهی یاخود تێڕوانینی سیاسی بوو، ئـەمـەش چەند نمونەیەک:

ئیبن حەجەر دەڵێت: ((باسی کردووە (قازی) عەیاز لـەهیشام و عباد گێڕاویەتیەوە کەئەو دووانە ڕوودانی (جمل)یان لـەبنـەڕەتـەوە ڕەت کردۆتەوە، هەروەها ئاماژەی داوە بۆ نکۆڵی لێکردنی لـەلایـەن ئەبوبەکری ئیبن عەرەبیەوە لە ((العواصم))دا و ئیبن حەزمەوە، ئەم دووانـە لـەبنـەڕەتـەوەو بـەتـەواوەتـی ڕەتیـان نـەکردۆتـەوە، بـەڵکو نکۆڵیـان لـەڕوودانـی جـەنـگ کـردووە تییـدا بـەو جـۆرە تایبـەتـە، بـەهــەرحـاڵ ئـەوە ڕەتکـراوەیـە، چونکـە رەتکردنـەوەی ئـەوەیـە کەبەتەواتری بنبڕ سەلمێنراوە)) [1].

شوکانی دەڵێت: ((ئیبن ئەبی شەیبە لـە (المنصف)دا بـەسـەنـەدی صـەحـیح لـە ئیـبن مـسیب گێڕاویـەتیـەوە دەڵێـت: ((یـەکـەم کـەس کەبانگدانی لەجەژندا داهێنا معاویە بوو))، ئیبن عەرەبی بانگـەشـەی ئەوەی کردووە کەکەسانێک لەمعاویەوە گێڕاویانەتەوە کەمتمانەیان پێ ناکرێت)) [2].

قورتبی دەڵێت: ((ئیبن عەرەبی وتوویەتی: نەزانی هەندێک کـەس گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کەوتوویانە: کەسی ئازاد لەسـەر کۆیلەکەی خۆی دەکوژرێت، بۆ ئەمەش فەرموودەیەکیان لەحەسن لـەسمرەوە گێڕاوەتەوە کەپێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)فـەرموویـەتـی: ((مـن قتـل عبـده قتلنـاه)) واتـە: (هــەرکـەس بـەنـدەکـەی بکوژێـت دەیکوژینەوە)، ئەمەش فەرموودەیەکی لاوازە..

---

[1] ـ ابن حجر: تلخيص الحبير ٤٤/٤.

[2] ـ الشوكاني: نيل الاوطار ٣٦٤/٣و بەراوردی بکە لەگەڵ مبارکفوری: تحفة الاحوذي ٦٢/٣.

وتم: ئەم فەرموودەیەی کەئیبن عەرەبی لاوازی کردووە صەحیحەو نسائی وئیبن داود هێناویانە.. بوخاری دەڵێت لەعەلی کوڕی مدینیەوە: ((ئەوەی حەسەن لەسمرەوە گوێی لێبووە صەحیحە))و، ئەم فەرموودەیەی وەرگرتووە، بوخاری دەڵێت: ((من دەڕۆشتم بۆ لای))، ئەگەر فەرموودەکەی صەحیح نەبووایە ئەوا ئەو دوو پێشەوایە نەدەچوون بۆ لای، جابزانە کەچۆن بوون (وحسبک بهما)–)) [1].

ئیبن حەجەر دەڵێت: ((سەیرترینی قازی ئەبوبەکر ئیبن عەرەبی ئەوەیە کەوشەی (أذن) لەسەر (الاذان)ی ڕەوا لێک داوەتەوەو، تانەی لەڕاستی فەرموودەکەی ئیبن عومەر داوەو، وتویەتی: ((سەیرە کە ئەبو عیسا (ترمزی) چۆن ڕاستی کردۆتەوە، ئاشکرایە کەبانگدان بەفەرموودەی عبدالله کوڕی زەید بووە))، فەرموودەی صەحیحیش لەگەڵ توانای کۆبوونەی کەباسمان کرد ولانانرێت و، ئیبن مندە لەفەرموودەکەی ئیبن عومەردا وتوویەتی: کۆدەنگی لەسەرە کەصەحیحە)) [2].

**چوارەم:** زۆرە لەخۆکردن وخۆسەپاندن لەچەسپاندنی بیروڕای هاوبۆچوون و ڕەتکردنەوەی بۆچوونی پێچەوانەدا.

مبارکفوری سەبارەت بەفەرموودەی ((خاڵ میراتگری ئەو کەسەیە کەمیراتگری نیە)) وتوویەتی: ((قازی ئەبوبەکری ئیبن عەرەبی خۆسەپێنەر بووە لەوەڵامدانەی ئەم فەرموودەیەداو، وتوویەتی: مەبەست لەخاڵ لێردە دەسەڵاتە)) [3]، شوکانی دەڵێت:

---

[1] ـ تفسير القرطبي ٢٤٩/٢.

[2] ـ فتح الباري ٨١/٢.

[3] ـ تحفة الاحوذي ٢٣٦/٦.

((لـەوەڵامـە خۆسـەپێنـەرەکـانی ئیـبن عـەرەبـی ئـەم قسـەیـەیـەتـی: مەبەست لەخاڵ دەسەڵاتە)) [1].

**پێنجـەم:** بـەڕەهـایی ڕەتکردنـەوە بـەڵگـەکـان، ئـەوانـەی کـەپێـی نەگەیشتوون یاخود لەیادی نەبووە، لەنمونەی ئەمانەش:

١- ئیبن حەجرە وتوویەتی: ((ئەم قسەیەی ئیبن عەرەبی جێی سـەرسـوڕمانە: هـیچ فـەرمـوودەیـەک سـەبـارەت بـەپۆشـاکی زەرد نەهاتووە))، لەکاتێکدا چەندین فەرموودەی لەبارەوە هاتووە)) [2].

٢- ئیبن حەجەر دەڵێت: ((ئیبن عەرەبی وتوویەتی: ((سەبارەت بەکراس هیچ فەرموودەیەکی صەحیحم نەبینیووە تەنها لەو ئایەتەو لەچیرۆکی ئوبەیدا نەبێت، ئەوەی پەیوەنددار بێت بـەپێغـەمبـەرەوە (صـلی اللـه علیـه وسـلم) سـێیەمـم لـەبـارەیـەوە نـەدیـووە)) ئـەمـەی لـەکتێبـی ((سـراج المریـدین))دا وتـووە، ئـەڵێـی ئـەم کتێبـەی پـێش (نووسینی) (شرح الترمذی) داناوە، فەرمـوودەکـەی ئـوم سـەلـەمـەو، فەرمـوودەکـەی ئـەبـو هـورەیـرەو.. فـەرمـوودەکـەی ئـەسـمائی کچـی یەزیدو.. فەرمـوودەکـەی معاویـەی کـوڕی قـورەو.. فـەرمـوودەکـەی سـەعیـد... کـەهـەمـوویـان لـەسـوننەکانـدان و، زۆربـەیـان لـەترمزیـدا هاتوون)) [3].

٣- شوکانی لەقورتبییەوە هێناویەتی دەڵێت: ((زۆر سەیرە ئیبن عەرەبی دەڵێت: ((ئەو قسەیەیان (رمۆزن (ممسوخ) نەوەیان نابێت) بانگەشەیە، ئەمە کارێکە بەعەقڵ درکی پێناکرێت، بـەڵکو بـەڕێگـەی

---

[1] ـ نیل الاوطار ١٨١/٦.

[2] ـ فتح الباري ٣٠٥/١٠.

[3] ـ فتح الباري ٢٦٧/١٠.

نەقڵ دەزانرێت، کارەکە شتێکی تێدا نیە بکرێتە هۆ بۆی))، وەک ئەوەی لەصەحیحی موسلیمدا بەرچاوی نەکەوتبێت)) [1].

٤- شوکانی وتوویەتی: ((ئیبن عەرەبی زیادەڕەوی کردووە کەوتوویەتی: هیچ فەرموودەیەک سەبارەت بەئیزهار نەهاتووە)) [2].

**شەشەم:** تۆقاندن وزیادەڕەویکردن، لەوکەسانەی بەئاگابوون لەمە ئیبن حەجەرە کەدەڵێت:

١- ((.. بەردەوام بووە (ئیبن عەرەبی) لەسەر ڕەوتەکەی خۆی لەتۆقاندن (تهویل) ودەستپێشخەری لەگوازتنەوەی کۆدەنگی لەکاتێکدا کەڕاجیایی لەسەر ئەو کۆ دەنگییە هەبووبێت)) [3].

٢- ((وەک پیشەی خۆی ئیبن عەرەبی زیادەڕەوی کردووەو، وتوویەتی: باسکردنی سەعدی کوڕی مەعاز لەچیرۆکی ئیفکدا دوورە لەڕاستی..)) [4].

٣- ((وتم: زیادەڕەوی کردووە (ئیبن عەرەبی) وەک نەریتی خۆی لەشێواندنی ئەوانەی کەفەرموودەیان بەپێی ڕووکارەکەی وەرگرتووەو، ئەوانەی جگە لەخۆی وتوویانە هیچ دوور نیە)) [5].

**حەوتەم:** گوازتنەوەی کۆدەنگی لەوبابەتانەی جیا ڕاییان لەسەرە، لەبڕگەی پێشوودا قسەکەی ئیبن حەجەر لەو بارەیەوە هاتبوو، خراپ نیە لێرەشدا بەهەندێک درێژیەوە بیهێنینەوە، ئیبن حەجەر دەڵێت:

---

[1] ـ نيل الاوطار ٢٨٩/٨-٢٩٠و، بەراوردی بکە لەگەڵ فتح الباري ٦٦٧/٩.

[2] ـ نيل الاوطار ٥٤/٧.

[3] ـ فتح الباري ١٦١/١٣.

[4] ـ فتح الباري ٤٧٢/٨.

[5] ـ فتح الباري ٣٢١/١١.

١-  ((ئیبن عەرەبی بانگەشەی ئەوەی کردووە کەهیچ جیا ڕایی لەوەدا نیە کەخەدیجە باشتر بووە لەعائیشە، پێشتر ئەوە هاتووە کەجیاڕایی لەڕابردودا چەسپاوە، باپەسەندیش ئەوە بێت کەخەدیجە باشترە)) [١].

٢-  بەڵام ئەو قسەیەی ئیبن عەرەبی (سەبارەت بەدوو ڕکات پێش مەغریب): ((هاوەڵان لەسەر بۆچوونی جیاوازیان هەبووەو، پاش ئەوان کەس ئەنجامی نەداوە))، ئەمەش بەقسەی محەمەدی کوڕی نصر ڕەتکراوەیە: ((لەکۆمەڵێک لەهاوەڵان وشوێنکەوتووانەوە گێڕاومانەتەوە کەئەوان دوو ڕکات نوێژیان پێش مەغریب کردووە ((پاشان ئەمەی بەسەندی جیاواز هێناوە)) [٢].

٣-  ((سەیرترین قسەی ئیبن عەرەبی ئەوەی کەباسی کۆدەنگی کردووە لەسەر ئەوەی ڕاکردنی صەفاو مەروا (سعی) لەعومرەدا پایەیە..)) [٣].

٤-  ((سەیرترینی ئیبن عەرەبی گوازتنەوەی کۆدەنگییە کە (جمعە) تا کاتی مەیلانی خۆر پێویست نیە.. لەکاتێکدا ئیبن قدامە لەکۆمەڵێک لەپێشینەوە هێناویەتی)) [٤].

٥-  قورتبی دەڵێت: ((.. لەگەڵ ئەوەدا قازی ئەبوبەکری ئیبن عەرەبی لەکتێبی ((القبس)یدا باسی ئەوەی کردووە کە: ((زانایانمان ڕەحمەتی خوایان لێ بێت وتوویانە: ((ئەم فەرموودەیە بەکۆڕا ڕەتکراوەیەوە))، وتم: ئەمە ڕاست نیە، ئەو و جگە لەویش باسی

---

[1] ـ فتح الباري ١٣٩/٧.

[2] ـ فتح الباري ١٠٨/٢.

[3] ـ فتح الباري ٤٩٩/٣.

[4] ـ فتح الباري ٣٨٧/٢و، بەراوردی بکە لەگەڵ (العظیم الایادي: عون المعبود ٣٠٠/٣.

ناکۆکی و ململانێیان کردووه، ئەوەی کەبەکۆڕا باسم کردووه ڕاست نیه، هەر خوای گەوره پشتیوانه)) [1].

**هەشتەم:** تەبعی توند بووه، ئیبن عەرەبی –رەحمەتی خوای لێ بێت- لەو کەسانەیه کەبەشێوازێکی پەلامار دەرانه دەنووسێ و وەخته بەدەستیش هێرش بۆ بەرانبەرەکی ببات و، تەنها بەزمان واز نەهێنێت، گوێ ڕادێره بۆی لەکاتێکدا قسه لەسەر قسەکانی (الغرابیة) دەکات –کەدەستەیەکن لەزیاده ڕۆکارانی شیعه-، دەڵێت: ئەم قسانه ((کوفرێکی سارده، تەنها گەرمی شمشێرەکان دەتوانێت گەرمی بکاتەوه، پێویسته گفتوگۆکه گەرم بێت ئەگەرنا کاریگەری لەسەری نابێت)) [2]، چاوی خوێنەریش لەسەرنجدانی کتێبی (احکام القران) و (العواصم)دا بەهەڵەدا ناچێت و ئەم تەبعەی تێیاندا بەدی ئەکات، لەوانەیه هەندێک کەس ئەم جۆره مامەڵەیه لەبەرەنگاربوونەوەی بیدعەچیەکاندا بەخراپ نەزانن، بەڵام ئەو شوێنەواره خراپەیان لەیاد نیه کەلەسەر دەروونی خۆی بەجێی دەهێڵێت لەوەی بەباشی شیکارەکەی بکات و، دادپەوەر بێت لەحوکمدانیدا.

لێرەدا پێویست دەکات جەخت لەوه بکەینەوه کەباسکردنی ئەم خراپییه مەنهەجیانه کەلەنوسینەکانی ئیبن عەرەبیدا بەدی دەکرێت ئامانج لێی شوێنکەوتنی نەنگیەکانی نیه، بەڵکو هۆشداری دانه لەجێکەوتەی ئەو خراپیانه کاتێ باسی لەناکۆکییه سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان بکرێت و، ئەوەی ئیبن عەرەبی بۆ لاوانی موسڵمان

---

[1] ـ تفسیر القرطبي ٥/٣٦٠.

[2] ـ العواصم ص ٢٥٩.

و قوتابیـانی هاوچـەرخـی زانـستخواز لـەلادان لـەمـەنهـەجـدا لەباسکردنیدا بەجێی هێشتووە.

ئەم خراپیە مەنهەجیانە وایکردووە لەنووسینەکانی ئیبن عەرەبی لـەبابـەتـی ناکۆکییـە سیاسـیەکـانی نێـوان هـاوەڵانـدا دوور بێـت لەمەنهەجی هاوسەنگی و میانگیری کـەشێخی ئیسلام ئیبن تـەیمیـە بانگـەشـەی بـۆ کـردووە، هـەربۆیـە کاردانـەوەی تونـدی بـووەو، سنووری دادپەروەری و میانگیری بەزاندووە.

ئەوەی لەمشتومڕی باوی ئێستای گۆڕەپانی ئیسلامی سەبارەت بەم بابەتە ڕابمێنێت تێدەگات تا چ ڕادەیەک ئەم خراپیە مەنهەجییانە کاریگەرییان هەیە تێیدا: سەرەڕۆیی وتوندی، ستەمکردن لـەوانـەی پێچـەوانـەی بۆچـوونی ئـەمیـان هـەیـە، ڕەتکردنـەوەی فـەرمـوودەی صـەحـیح و ڕووداوی سـەلمێنـراو، زۆرلـەخـۆکردن و زیـادەڕەوی لـەگوازتنـەوەو شـیکاردا، بـەڕەهـایی ڕەتکردنـەوەی ئـەو بـەڵگانـەی کەمەبەستی گفتوگۆکار نەگـەیشتووەو، زیـادەڕەوی و خۆسـەپانـدن و، گوزاتنەوەی کۆدەنگی لـەو کاروبارانـەدا کـە نـاکۆکی بـەرچـاوی تێدایە... هتد.

لەکاتیکدا ئێمـە هـەوڵ دەدەیـن ئـەم هۆشـداریە لـەسـەر هـەندێک لـەهـەڵـە زانـستی و مـەنهـەجیـەکـان بـدەیـن کـەئیـبن عـەرەبی تێـی کـەوتـووە لـەکتێبـی (العواصـم)داو بـەشـوێن ئـەودا لێکۆڵـەرانـی کتێبـەکـەو، بـەسـەدان هـەزار فێرخـوازی زانـستخوازی دیکـە تێـی کـەوتـوون، مـەبـەسـتمان ئـەوەیـە بـۆ خوینـەری بـەڕێـزی ڕوون بکـەینـەوە کـەچ جیاوازییـەکی زۆر هـەیـە لـەنیوان مـەنهـەجی ئیبن عـەرەبی ومـەنهـەجی ئیـبن تـەیمیـەدا: مـەنهـەجی هاوسـەنگی و میـانگیری ولێکۆڵینـەوەی زانـستی و، مـەنهـەجی خۆسـەپانـدن و گشتاندن و لێکۆڵینـەوە نـەکردن، تـا هـەمووان بزانن کـەمـەنهـەجی

ئەهلی سوننە بێدەنگکردنی بەرانبەر نیە بەحەق و بەناحەق، بەڵکو مەنهەجی دادپەروەری و هاوسەنگی و میانگیرییە.

ئێمە لەبەهای هەوڵەکانی ئیبن عەرەبی -خوا پەنامان بدات- کەم ناکەینەوە، بگرە داندەنێین بەفەزڵیداو، لەخوا گەورە داواکرین کەئەو هەوڵانەی لێ وەربگرێت و، بەپێی نیەتی خۆی وخۆشەویستی بۆ هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) دامەزراوی بکات.

بەڵام مەبەستی چاک شتێکەو، لێکۆڵینەوەی زانستی شتێکی ترەو، زیادەڕەویکردن لەگەل نیەت باشیدا دەچێتە نێو خەڵکیەوە هەروەک چۆن لەگەڵ نیەت خراپیشدا دەچێت، هێندە بەسە کەئیبن حەجەر دیاردەی بوونی خەواریجی پێ لیکداوەتەوە، ئەو (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: ((زۆربەی خەڵکی عێراق لەو قورئانخوێنانە بوون کەزیادەڕۆییان دەکرد لەئاینداریداو، پاشتر خەواریجیان لێ پەیدا بوو)) [1].

---

[1] ـ فتح الباري ٢٨٩/١٣.

## چەند تێبینیەك لەسەر كتێبی ((العواصم))

لێرەدا هەندێ تێبینی لەسەر ئەو كتێبە دەخەینە ڕوو، بۆ سێ پۆل دابەشیان دەكەین: حوكمەكانی سەر دەقەكان و، حوكمەكانی سەر ڕووداوەكان و، حوكمەكانی سەر كەسەكان.

**یەكەم:** حوكمەكانی سەر كەسەكان:

**نمونەی یەكەم:** ئیبن عەرەبی ئەوەی ڕەتكردۆتەوە كەمەروانی كوڕی حەكەم هەستابێت بەكوشتنی تەڵحە لەرۆژی (جمل)دا لەكاتێكدا كەلەنێو سوپاكەیدا بووەو، دەڵێت: ((كێ ئەوە دەزانێت جگە لەخوا كەئاگاداری پەنهانەكانە، هیچ سەلمێنراوێك بۆی نەگوازوینەتەوە)) پاشان لێكۆڵەری كتێبەكە دەڵێت: ((ئافاتی ئەو ڕووداوانە گێڕەرەوەكانیانە... ئەم هەواڵەش لەبارەی تەڵحەو مەروانەوە هەواڵێكی بێ خاوەنەو كەس نازانێت كێ هێناویەتی، بەهۆی ئەوەی بەسەلمێنراوی و بەسەنەدێكی زانراوەوە لەكەسانی متمانە پێكراوەوە نەگوازراواتەوە ئەوا قازی ئیبن عەرەبی بۆی هەیە لەبارەیەوە بڵێت: كێ ئەوە دەزانێت جگە لەخوا كەئاگاداری پەنهانەكانە؟!))[1].

لەڕاستیدا بەسەلمێنراوی ئەم هەواڵە گوزراراوەتەوەو ڕاستكراوەتەوە: ئیبن حەجەر دەڵێت: (( ئیبن عساكر لەچەند ڕێگەیەكەوە گێڕاویەتیەوە كەمەروانی كوڕی حەكەم بووە تیری تێ گرتووە (لەتەڵحەی گرتووە)و كوشتویەتی، ئەبو قاسم بەغەوی

---

[1] ـ العواصم من القواصم ص١٦٠.

بەسەنەدێکی صەحیح لە جارود کوڕی ئیبن ئەبی سبرە هێناویەتی)) [١].

زەهەبی دەڵێت: ((لەقەیسەوە دەگێڕنەوە دەڵێت مەروانی کوڕی حەکەم بینی ئەو کاتەی تیرێکی گرتە تەڵحە، بەر ئەژنۆی کەوت، خەریکی سڕینی بوو هەتا مرد))، حاکم و ئیبن سەعد بەسەنەدێکی صەحیح هێناویانە [٢]، هیثمی دەڵێت: ((تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو گێڕەرەوەکانی متمانەپێکراون)) [٣].

لەو فەرموودەناسانەی دیکەش کەباسیان لەکوژرانی تەڵحە بەدەستی مەروان کردووە ئیبن عبدالبر، ئەمەشی بۆ زیاد کردووە: ((زانایانی متمانەپێکراو ڕاجیا نین کەمەروان لەو رۆژەدا تەڵحەی کوشتووە کەلەسوپاکەیدا بووە)) [٤]، لەوانەش عجلی [٥] و ئیبن حبان [٦] و کلابازی [٧].

**نمونەی دووەم:** ئیبن عەرەبی فەرموودەی (الحوأب)ەی ڕەتکردۆتەوەو، وتوویەتی: (هیچ شتیک لەوەی باستان نەکردووە هەرگیز نەبووەو، پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم)یش ئەو فەرموودەیەی نەوتووەو، ئەو قسەیە نەکراوە)) [٨]، پاشان شێخ محب الدین قسەی لەسەر کردووەو وتوویەتی: ((ئەو قسەیەی داویانەتە پاڵ پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)و، بانگەشەی ئەوەیان کردووە

---

1 ـ ابن حجر الاصابة ٢٢٢/٢و، بەراوردی بکە لەگەڵ فتح الباري٨٢/٧.
2 ـ بڕوانە: سير أعلام النبلاء ٣٥/١-٣٦.
3 ـ مجمع الزوائد ١٥٠/٩ و، بەراوردی بکە لەگەڵ (ابن ابى شيبة) ٧/ ٥٣٦.
4 ـ الاستيعاب ٧٦٦/٢.
5 ـ العجلي: معرفة الثقات ١٥٥/٢.
6 ـ بڕوانە ئەم دوو کتێبەی ابن حبان: مشاهير علماء الامصار ٧/١و الثقات ٢٨٣/٢.
7 ـ بڕوانە: الكلاباذي: رجال صحيح البخاري٣٧١/١.
8 ـ العواصم ص ١٦٢-١٦٣.

کە عائیشە لەکاتی گەیشتنیان بەو ئاوە باسی کردووەو هیچ شوینێکی نیە لەکتێبە باوەڕپێکراوەکانی فەرموودەدا)) [1].

لەڕاستیشدا فەرموودەکە صەحیحەو، لەکتێبە باوەرپێکراوەکانی فەرموودەدا بوونی هەیە، لەوانە مەسنەدی پێشەوا ئەحمەدو، مستەدرەکی حاکم و، صەحیحی ئیبن حەبان و حاکم و زەهەبیش هاوڕایان بووەو، ئیبن حەجەر دەڵێت: ((سەنەدەکەی لەسەر مەرج صەحیحە))و، هەیسەمی لەگێڕانەوەکەی ئەحمەددا بۆی وتوویەتی: ((گێڕەرەوەکانی ئەحمەد گێرەرەوەی صەحیحن))و، لەگێڕانەوەی بزازدا: ((بزاز گێڕاویەتیەوەو گێڕەرەوەکانی متمانەپێکراون)) [2].

**نمونەی سێیەم:** لەبەرگریکردنی ئیبن عەرەبی لەوەلیدی کوڕی عقبە دەڵێت: ((بەڵام وەلید ئەوا هەندێک لەموفەسیرین گێڕاویانەتەوە کەخوای گەورە لەم ئایەتەدا ناوی ناوە فاسق: (إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ...)، بەپێی قسەی ئەوان سەبارەت بەو ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارەوەو... جیا ڕایی تێدایەو، وتراوە: لەبارەی ئەوەوە دابەزیووە (واتە وەلید)و وتراویشە: لەبارەی عەلی و، وەلید لەچیرۆکێکی تردا)) [3]، پاشان شێخ محب الدین بەدرێژی قسەی لەسەر کردووەو، خۆی دوور گرتووە لەو هەواڵانەی سەبارەت بەم بابەتە هاتووەو، دەڵێت: ((ببینیم لەسەر مجاهد یاخود قتادە یان

---

[1] ـ بڕوانە: (فیض القدیر شرح الجامع الصغیر)ی مەناوی (١/٤٤٧، ٤٤٨) فەرموودەی ژمارە (٦١٥).

[2] ـ بڕوانە: سیر أعلام النبلاء ٢/١٧٧-١٧٨و مجمع الزوائد ٧/٢٣٤و مستدرک الحاکم ٣/ ١٢٩ وصحیح ابن حبان ١٥/ ١٢٦ ومسند أبی یعلي ٨/٢٨٢و مسند الامام أحمد ٦/٥٢و مسند اسحاق بن راهویة ٣/٨٩١ وفتح الباري ١٣/٥٥و تعلیق الالباني فی ختام کتابە ((العواصم)) ص ٢٧٦-٢٧٨.

[3] ـ العواصم: ص ١٠٢-١٠٣.

ئیبن ئەبی لەیلی یان یەزیدی کوڕی رومان وەستاوەو، هیچکام لەوانە ناوی گێڕەڕەوەکانی ئەو هەواڵەیان لەماوەی سەد ساڵ یان زیاتر کەلەنێوانیان ئەوا سەردەمی ڕووداوەکەدا بووە باسیان نەکردووە))، هێرشی کردۆتە سەر ئەوانەی ((کەدونیایان پڕ هەواڵی گوماناوی کردووە کەهیچ بەهایەکی زانستییان نیە))، پاشان باسی ئەوەی کردووە کەئەو دوو هەواڵە دەگەنەوە بەم کارە لەم ئوم سەلەمەوەیەو گێڕەرەوەکانی لاوازن یاخود نەناسراون... هتد[1].

وادیارە شێخ خەتیب وردبوونەکانی ناپاکیان لەگەڵ کردووە لێرەدا: چونکە ئەم فەرموودەیە ئەحمەدو ئیبن ئەبی حاتەم و تەبەرانی و ئیبن مندەو ئیبن مەردویە لەحارسی کوڕی بن ئەبی زڕاڕ گێڕاویانەتەوە، ئەویش هاوەڵەو باوکی جویەریەی دایکی باوەڕدارانە، هەروەها ڕاستگۆترین شاهێد عەیانەو، سەرگەورەی هۆزی بەنی موستەلەقە کەوەلیدی ناردووە بۆلایان، ئەمە گێڕانەوەکەی ئوم سەلەمە نیەو، لەو هەواڵە ڕاگیراوانەش نیە کەشێخ خەتیب لەسەریان وەستاوە، سیوەتیش فەرموودە بەم ڕێگایە بووبێت وتوویەتی ((سندە جید)) [2]، هەیسەمی دەڵێت: ((ئەحمەدو تەبەرانی گێڕاویانەتەوەو، گێڕەرەوەکانی ئەحمەد متمانەپێکراون)) [3]، بەڵام قسەکەی ئیبن عەرەبی: ((لەبارەی عەلی وتراوە))، ئەوەی من بزانم کەس پێش ئەو ئەوەی وتبێت، یان دوای

---

[1] ـ العواصم: هامش ص١٠٢-١٠٣.

[2] ـ بڕوانە سیوەیتی: الدار المنشور فی التفسیر بالمأثور٦/٩١و، شوکانی: فتح القدیر ٥/٨٠و، ابن القیم: بدائع التفسیر ١٧/٤و، ابن ابي حاتم: تفسیر القران العظیم ٣٣٠٣٠/١٠.

[3] ـ مجمع الزوائد ١٠٩/٧و بڕوانە پێشەوا ئەحمەد ٢٧٩/٤ و معجم الطبرانی الکبیر ٢٧٤/٣..

ئـەو وتبێتـی، بـەتایبـەت کـەموفـەسیرەکـان  هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایـەتـەیـان بـەسـەر وەلیـدا جێبـەجێ کـردووە، تـەنانـەت نـەسـەفی کۆدەنگیـانی لـەسـەر ئـەوە گوازتۆتـەوە[1]. بنـەڕەتـی قسـەکـەی ئیـبن عەرەبی ئەوەیە کەهەندێک لەئەهلی عیلم باسـی ئـەوەیـان کـردووە کەئەم ئایەتە: (أَفَمَنْ كَانَ مُؤْمِنًا كَمَنْ كَانَ فَاسِقًا لَا يَسْتَوُونَ) سـەبـارەت بەوەلیدی کوڕی عقبەو عەلی کوڕی ئـەبو تالـب [2]هاتۆتـە خـوارەوە، بـەڵام بـاوەڕداری لـەفاسـق جیاکردۆتـەوە، کـارەکـەش لای ئـەوان شـاراوە نـەبـووە، لـەبـەر ئـەوەیـە شـاموخی پـاش هێنـانی ئـەم گێڕانـەیـەوە وتوویـەتـی: ((بـاوەڕدارەکـە عـەلـی کـوڕی ئـەبـو تالبـەو، فاسـقەکـەش وەلیـدی کـوڕی عقبـەیـە[3]، هیـوادارم پـەرۆشـی ئیـبن عەرەبی بۆ بێبەریکردنی وەلید  پاڵنـەر نـەبووبێت بۆ وتنی ئـەوەی کەئەو مانایە بگەیەنێت ئەمیری باوەڕداران عـەلـی (خـوا لێـی ڕازی بێت) فاسقە.

**نمونەی چوارەم:** لەهەوڵیاندا بۆ پاڵپشتی بۆچوونی ئیبن عەرەبی دەربـارەی چیرۆکـی وەلیـد شـێخ محـب الـدین بـەڵگـەی بەفەرموودەیەکی بەیهەقی هێناوەتەوە کەئەو مانایە دەبەخشێت کە وەلید لەرۆژی فەتحدا منااڵ بووە، بۆیە ناگونجێت نێردرابێت بۆلای بەنی موستەلـەق[4]، بـەڵام ئـەوەی لـەیـاد چـووە کـەلـەسـەنـەدەکـەیدا

[1] ـ النسفي: مدارك التنزيل ١٦٧٧/٣.

[2] ـ بڕوانە: تفسير القرطبي ١٠٥/١٤-١٠٦و فضائل الصحابة لعبدالله بن الامام أحمد وتأريخ بغداد ٣٢١/١٣.

[3] ـ أحاديث الشاموخي ص٤٥..

[4] ـ البيهقي: السنن الكبرى ٥٥/٩.

نەناسراو هەیە، مزی دەڵێت: ((فەرموودەکە مونکەری شێواوە ڕاست نیە)) [1].

ئیبن حەجەرو ئیبن عبدالبرو جگە لەوان جەختیان لەوە کردۆتەوە کەوەلید لەڕۆژی فەتحدا پیاو بووە [2]، لەڕووداوەکانی ژیانیدا شتی واهاتووە کەئەو مانایایە دەگەیەنێت: تەنها ئەوە بەسە کەهەندێک لەهاوەڵان لەمەسنەدەکانیانا گێڕاویانەتەوە ((ژنەکەی وەلید هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وتی ئەی پێغەمبەری خوا وەلیدی لێی دەدات –نەسری کوڕی عەلی لەفەرموودەکەیدا دەڵێت: سکاڵای لەدەستی دەکرد– پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: پێی بڵێ پەنای داوم (اجارنی)، ماوەیەکی زۆری پێنەچوو گەڕایەوەو، وتی لێدانمی زیاتر کردووە، چمکێکی کراسەکەی گرت گرت وپێی داو فەرمووی: پێی بڵێ کەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پەنای داوم، زۆری پێنەچوو گەڕایەوەو وتی: لێدانمی زیاتر کردووەو چاک نەبووە، پێغەمبەر دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی: خوایە سزای وەلید بدە دووجار تاوانی بەرانبەر کردم)) [3].

**نمونەی پێنجەم:** شێخ محب الدین خەتیب دەڵێت: ((پێشەوا ترمزی لەئەبو ئیدریس خولانی کەلەگەورە زانایانی تابعینەو زاناترین کەسی شام بووە پاش ئەبو دەرداء گێڕاویەتیەوە کە عومەری کوڕی خەتاب کاتێ عومەیری کوڕی سەعدی ئەنصاری

---

[1] ـ المزي: تهذيب الكلام ٥٦/٣١.

[2] ـ الاصابة ٦١٦/٦.

[3] ـ الهيثمي: مجمع الزوائد ٣٣٢/٤و وتويەتی عبدالله کوڕی احمد و بزاز و ئەبو يعلى گێڕاویانەتەوەو گێرەرەوەکانیان متمانەپێکراون و، مقدسي: الاحاديث المختارة ٣٣٢/٢و، لێکۆڵەرەکەی وتوویەتی: اسناده حسن.

ئەوسی لادا لەوالییێتی حمص و معاویەی خستە جێگای، عومەیر وتی: تەنها بەچاکە باسی معاویە بکەن، چونکە گویێم لەپێغەمبەری خوا بووە (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو: ((اللهم اهد به)) واتە: ((خوایە بەهۆیەوە هیدایەت بدە)). دەگێڕنەوەکە ئەو کەسەی ئەم شاهێدیەی بینیوە بۆ معاویە ئەمیری باوەڕداران عومەر بووە..)) بەڵام شێخ خەتیب دوو شتی لەیاد چووە کەتوێژینەوەی زانستی وادەخوازێت فەرامۆش نەکرێن: یەکەمیان باسی قسەی ترمزی لەسەر فەرموودەکە نەکردووە، لەسوننەنی ترمزیدا راستەوخۆ پاش گێڕانەوەی فەرموودەکە هاتووە: ((ئەبو عیسا وتوویەتی ئەم فەرموودەیە غەریبە، دەڵێت: عەمری کوڕی واقد لاوازکارە)) [1]، دووەمیشیان ئەوەیە کەگێڕانەوەی چیرۆکەکە لەعومەرەوە ڕاست نیە هەربۆیە هۆشداری دان لەوبارەیەوە باش بوو بۆ کەسێک کەبەڵێنی بەخوێنەرانی داوە لەدرۆکانی مێژوونووسان وهەواڵ گێڕەوەکان ڕزگاریان بکات،ز دهەبی لەعومەرەوە ئەم فەرموودەیەی هێناوەو پاشان وتوویەتی: ((ئەمە پچڕاوە)) [2].

**دووەم: حوکمدان لەسەر ڕووداوەکان:**

**نمونەی یەکەم:** شێخ محب الدین خەتیبی لیکۆڵەری کتێبەکە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: ((ئەو بەیعەت پێدانەی عەلی ((واتە پاش شەش مانگ لەدەستپێکی جێنشینی ئەبوبەکرەوە) ئەوە دووەم بەیعەت پێدانی بووە پاش بەیعەت پێدانی یەکەم لەسەقیفەی بەنی ساعیدە)) [3]، ئەمەش کارێکە پێچەوانەی دەربڕاوی ئەو

---

[1] ـ سنن الترمذي ٦٨٧/٥.
[2] ـ سير أعلام النبلاء ١٢٦/٣.
[3] ـ العواصم ص ٥٥ الهامش ١٥.

فەرمـوودەیـەیـە کـەلـەهـەردوو صـەحیحـەکـەدا لـەعائیـشەوە گێڕدراوەتەوە، پێشتر ئاماژەمان بەو فەرموودەیە دا، لێرەدا تەواوی دەقەکەی دەهێنینەوە: ((لەعائیشەوە دەگێڕنـەوە کەفاتیمـە (سـەلامی خوای لێ بێت) کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناردی بۆلای ئەبوبەکر داوای میراتی خۆی لـەپێغـەمبـەری خـوا (صـلی اللـه علیـه وسلم) لەوەی کەخوای گەورە لەمەدینەو فدک و ئـەو پێنج یـەکـەی خەیبەر دەکرد، ئـەبوبـەکر وتـی: پێغـەمبـەری خـوا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) فـەرموویـەتـی: ((میراتـی بـەجـێ نـاهێڵین ئـەوەی بـەجێمـان هێشتووە صـەدەقـەیـە، خانـەوادەی محـەمـەدیـش (صـلی اللـه علیـه وسلم) لەوە دەخۆن))، منیش سوێند بەخوا لەصەدەقەی پێغەمبەری خـوا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) لـەو حاڵـەتـەی کـەهـەبـووە نـاگۆڕم کەلەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی اللە علیە وسلم) لـەسـەری بووەو، بەوە کاردەکەم کەپێغەمبـەری خـوا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) کاری پێکردووە، ئەبوبەکر ڕازی نەبوو هیچ بەفاتیمـە بـدات، فاتیمـە لەسەر ئەوە لەئەبوبەکر زویر بوو، بـەجێی هێشت وقسـەی لـەگـەڵ نەکرد تا وەفاتی کردو، فاتیمە شـەش مانگ پاش پێغـەمبـەر (صـلی اللە علیە وسلم) ژیـا، کاتێ وەفـاتی کـرد عـەلـی هاوسـەری بـەشـەو ناشتی و، مۆڵەتی لەبەئەبوبەکر وەرنەگرت و، خۆی نوێژی لـەسـەر کردو، عەلی بەهۆی فاتیمەوە لەناو خەڵکیدا ڕێزی زۆر بوو، کاتێ وەفاتی کرد عەلی هێشتا بـەیعـەتـی نـەداوە ڕێزی لای خـەڵک ڕوو لەکەمی بوو، ویستی ئاشتەوایی لەگەڵ ئەبوبەکردا بکات و بەیعەتی پێ بدات و، کە لەو چەند مانگەدا بەیعەتی پێنەدابوو، نـاردی بـۆلای ئـەبوبـەکر: وەرە بۆ لامـان، بـا کـەسـت لـەگـەڵ نـەیـەت، پێی خـۆش نـەبـوو عومـەر لـەگـەڵی بچێت، عومـەر وتـی: نـەخێر بـەخـوا نابێت بەتەنها بچیت بۆلایان، ئەبوبەکر وتی: گومان دەبەیت چیم بەرانبـەر

بکەن، سوێند بەخوا دەچم بۆلایان، ئەبوبەکر چووە لایان، عەلی شاهێدی دەدات ودەڵێت: ئێمە ئاگاداری فەزڵی تۆو ئەوەین خوا پێی بەخشیویت و ئیرەیت پێ نابەین، خێرێک ناگێڕینەوە کەخوا بۆتۆی ناردبێت، بەڵام لەوکارەدا ڕاوێژت پێ نەکردین، ئێمە وامان دەبینی بەهۆی نزیکیمانەوە لەپێغەمبەر خوا (صلی الله علیه وسلم) لەوەدا قسەیەکمان دەبوو، چاوی ئەبوبەکر فرمێسکی لێ هات، کاتێ ئەبوبەکر قسەی کرد وتی: سوێند بەخوا نزیکایەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لام خۆشەویستترە لەبەجێهێنانی خزمایەتیم، بەڵام ئەوەی ڕوویدا لەنێوانماندا لەسەر ئەو ماڵ وسامانە ئەوا تەنها بۆ چاکە بەلایدا چووم و هیچ کارێکم واز لێنەهێناوە کەبینیبێتم پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەنجامی دابێت منیش ئەنجامم داوە، عەلی بەئەبوبەکری وت: وادەمان نیوەڕۆ بێت بۆ بەیعەتدان، کاتێ ئەبوبەکر نوێژی نیوەڕۆی کرد چووە سەر مینبەرو (اشهد ان لا الله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله)ی کردو باسی پایەی عەلی و دواکەوتنی لەبەیعەتدان کردو، بەوەی کەبۆی باسکردبوو پاساوی دواکەوتنەکەی بۆ هێنایەوە، پاشان داوای لێخۆشبوونی کردو عەلی قسەی کرد، مافی ئەبوبەکری بەرز ڕاگرت، باسی ئەوەی کرد ئەوەی وایکرد ئەو کارە بکات خۆبەگەورە زانین نەبووە بەسەر ئەبوبەکردا، یان نکوڵی کردن لەو فەزڵەی خوا پێی داوە، بەڵام ئێمە وامان دەبینی کەلەو کارەدا ڕاوێژمان پێ دەکرێت، ئەوە بەسەرماندا زاڵ بوو، شتیکمان لەدڵدا بۆ دروست بوو، موسڵمانان بەوە دڵخۆش بوون وتیان: ڕاستت

وت، موسڵمان عەلی لەدڵیاندا نزیکتر بوو کاتێ کارەکەی بەچاکە گێڕایەوە)) [1].

ئەوەی سەیرە شێخ خەتیب بەشێک لەم فەرموودەیەی لەصەحیحی بوخاری هێناوە تاگەیشتۆتە ئەوەی وتی: ((ئیدی ئاشتەوایی لەگەڵ ئەبوبەکر کردو بەیعەتی پێدا)) پاشان وەستاوەو، ئەم ڕستەیەی دواتری باس نەکردووە: ((ئەو چەند مانگە بەیعەتی نەدابوو)).. چونکە لەگەڵ بۆچوونە پێشوەختەکەیدا سەبارەت بەڕووداوەکان یەک ناگرێتەوە، بەراستیش ئەمە کارێکی نامۆیە، بەتایبەت کەئیبن عەرەبی و محب الدین خەتیب بەدرێژایی لاپەڕەکانی کتێبەکە خۆیان دەپارێزن لەو هەوالانەی کەجگە لەمتمانەپێکراوان دەیگێڕنەوەو، سوورن لەسەر پشت بەستن تەنها بەفەرموودەناسان، تا گەیشتۆتە ئەوەی ئیبن عەرەبی هەموو موفەسیرو مێژوونووسانی بەدرۆزن تۆمەتبار کردووە، ئەوەی زیاتر جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کەشێخ محب الدین لەلێکۆڵینەوە لەکتێبی (فتح الباري)یدا لەگەڵ خوالێخۆشبوون زانای گەورە محەمەد فوئاد عبدالباقی بەشداری کردووە، هەربۆیە لەو کەسانە نیە کەبێئاگا بێت لەفەرموودەکانی بوخاری لەم بابەتەدا، پاشان قسەی شێخ مەحمود محەمەد ئستانبوڵی دێت کەلەگەڵ مەنهەجی ئیبن عەرەبی و محب الدیندا لەخۆسەپاندن یەکدەگرێتەوە، گێڕانەوەی هەردوو صەحیحەکەشی وەلا ناوەو، دەڵێت: ((گێڕانەوەکان لەڕوونکردنەوەی هەڵویستی عەلی کوڕی ئەبو تاڵب سەبارەت بەخەلافەتی ئەبوبەکری صدیق جیاوازن و، پاشان دەسیسەکان رۆڵیان هەبوو، هەڵبەستراوو درۆیان لەبارەیەوە هێنا

---

[1] ـ صحيح البخاري ١٥٤٩/٤ ومسلم ١٣٨٠/٣ وابن حبان ١٥٣/١١.

بەمەبەستی لەقکردنی متمانە بەئیسلام بەشێوەیەکی گشتی و، بەهاوەڵان بەشێوەیەکی تایبەتی و، دەرخستنیان بەرووکاری خراپەکارو لەناوبەر لەسەر پۆست وپایەو سامان با ئەوە بەهۆی سەرپێچی شەریعەتیشەوە بێت، ئێمەش لێرەدا ڕاسترینی گێڕانەوەکان سەبارەت بەهەڵوێستە بەرزەکەی عەلی دەهێنین، پاشان ئاوڕ لەهەندێ گێڕانەوەی تر دەدەینەوە کەباسی ئەوە دەکات تا وەفاتی فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئامادەنەبووە بەیعەت بدات و، درۆو هەڵبەستراتی ئەوە روون دەکەینەوە)) [١].

پێویستە خوێنەر چاوەڕوانی دەروازەی زانستی بەهێز لەشێخ ئیستانبوڵی بکات و، بەپەرۆشەوە لەخوێندنەوەی بەردەوام دەبێت، بەتایبەت کاتێ بۆچوونی خۆی لەچوارچێوەی بەرگری لەڕێزی هاوەڵانی پابەرزو پێگەیان دەخاتە ڕوو، بەڵام گومانەکەی تووشی بێئومێدی دەبێت کاتێ ئەم برگەیەی دواتری ئەم قسانەی دەخوێنێتەوە، کە دەڵێت: ((زانای پایەبەرز محەمەد عزە دروزە لەکتێبەکەیدا ((الجنس العربى)) وتوویەتی..!!)) پاشان چیرۆکێکی هێناوە کەمامۆستا دروزە لە (تاريخ الطبرى) وەریگرتووە، دەڵێت کەعەلی ((هەواڵی بۆ هات لەبارەی دانیشتنی ئەبوبەکر بۆ بەیعەت وەرگرتن، بەکراسێکەوە هاتە دەرەوە کەقۆپچەی پێوە نەبوو، لەپەلە پەلیدا کەپێی خۆش نەبوو لەبەیعەتدان دوا بکەوێت)) [٢]، شێخ ئیستانبوڵی لەسەر ئەوە دەڵێت: ((گێڕانەوەی تری تێکەڵ و درۆ هەیە کەعەلی و بەنی هاشم رەتیان کردۆتەوە بەیعەت بەئەبوبەکر

---

[1] ـ العواصم ص ٥٥ هامش ١٦.

[2] ـ العواصم ص٥٦ هامش ١٦.

بـدەن، بـەهـۆی بێبـەهاییانـەوەو، لـەبـەر ئـەو گێڕانـەوە زۆرانـەی کەدەیسەلمێنێت عەلی بەپەلە بەیعەتی بەئەبوبەکر داوە ئاوڕمان لەو لاپەڕانە نەداوە)) [1]، بەسـەرنجدان لـەبنـەڕەتـی چیرۆکـەکـە لـە(تـاریخ الطبـری)دا دەبینـین کـەلـەسـەنـەدەکـەیـدا سـەیـف کـوڕی عومـەر هەواڵگێڕەوەی بەناوبانگ هەیە کەکتێبەکانی (جرح وتعدیل پڕ بـووە لـەهۆشـداریدان لـەبـارەیـەوەو خـۆدوورگرتن لـەدرۆکـانی، ئـەمـەش هەندێک لەوەیە کەزانایان لەبارەیەوە وتوویانە: زەهەبی وتوویەتـی: ((بـەهـاودەنگـی وازلێهێنـراوە)) [2]، ئیـبن حبـان دەڵێت: ((فـەرمـوودە موضوعەکان سەبارەت بەسەلمادن دەگێڕێتـەوە)) [3]، ئیبن عـەجمـی دەڵێـت: ((سـەیـف فـەرمـوودەی دادەنـاو تۆمـەتبـار بـوو بـەزەنـدیق بوون)) [4]، نسائی و دار قوتنی وتوویانە: (لاوازە)) [5]، ئیبن ئەبی حاتم دەڵێـت: ((فـەرمـوودەکـانی وازلێهێنـراوە قسـەی ئـەو وەک قسـەی واقدی وایـە)) [6]، ئـەبـو نـەعـیم ئـەصـفەهـانی دەڵێت: ((لـەئاینـەکـەیـدا تۆمەتبارە، بەزەندیق زانراوە، فەرمووەدەی ڕاست نیە، هیچە)) [7].

جا ئایا چیرۆکێک سەیفی کوری عومەر لەگێڕانەوەکەیدا بێت – شێخی ئیستانبوڵی لە -تأریخ الطبری- بەناڕاستەوخۆ هێنابێتی- بۆ ئەوە دەست دەدات بکرێتە نەیاری فـەرمـوودەی بوخـاری ومسلم؟ یـان ئایـا کتێبـی ((الجـنس العربـی)) بـۆ ئـەوە دەگونجێـت ببێتـە

---

1 ـ الذهبي: المغني فی الضعفاء ٢٩٢/١.
2 ـ ابن حبان: كتاب المجروحين ٣٤٥/١.
3 ـ العقلي: الضعفاء ١٧٥/٢.
4 ـ ابن العجمي: الكشف الحثيث ١٣١/١.
5 ـ ابن الجوزي: كتب الضعفاء والمتروكين ٣٥/٢.
6 ـ ابن أبي حاتم: الجرح والتعديل ٢٧٨/٤.
7 ـ أبو نعيم الاصفهاني: كتاب الضعفاء ٩١/١.

رکابەرێکی زانستی هەردوو کتیبی صەحیحەکە؟ کوا ئەو بەڵینەی شێخ کەوتی ((ڕاستترین گێڕانەوەکان سەبارەت بەهەڵویستی عەلی)) دەهێنێت؟ کوا ((گێڕانەوە زۆرەکان کەپەلەکردنی عەلی لەبەیعەتپێدانی ئەبوبەکردا دەسەلمێنێت))؟! ئایا گێڕانەوە صەحیحەکان لەنێو ئەو گێڕانەوەدان ((تێکەڵ و درۆیانەدایە لەرەتکردنەوەی عەلی وبەنی هاشم بۆ بەیعەتی ئەبوبەکر))؟

لەڕاستیدا شێخ محب الدین و شێخ ئستانبوڵی لەتوانایاندا بوو شاهیدی بۆ بۆچوونەکەیان بهێننەوە -بەو زۆرلێکردنەوەیەوە کەتییدا بێ- بەوەی ئیبن حەجەر باسی کردووەو، وتوویەتی: ((ئیبن حەبان و جگەلەو ئەو فەرمودەی ئەبو سەعیدی خدریان ڕاست کردۆتەوە کەعەلی لەیەکەمجاردا بەیعەتی داوە بەئەبوبەکر)) [1]، واتەبەیعەتە گشتییەکە کەلەمزگەوتدا بوو رۆژی پاش بەیعەتی سەقیفە، ئەم گێڕانەوەیە بەهێزترە لەگێڕانەوەکانی تەبەری، با گەردو تۆزی دووشتیشی لەسەر بێت:

١- ئیبن حەبان لەڕاستکردنەوەکانیدا ئاسانکاری کردووە، هەتا زۆرێک لەزانایانی فەرمووده‌و هاوچەرخەکان ناڕازین لەڕاستکردنەوەکانی، لەوانەش لەپێشینەکاندا: زەهەبی و ئیبن حەجەرو سەخاوی و صەنعانی، لەهاوچەرخەکانیش عبدالفتاح ابو غدەو شعیب ئەرنائۆت وحسین سلیم ئەسەد[2]و هۆکارەکەی ئەوەیە کەئیبن حەبان مەنهەجێکی هەیە لەڕاستکردنەوەدا کەجیایە لەمەنهەجی فەرموودەناسانی دیکە، ئەو متمانە دەداتە گێڕەرەوە نەناسراوەکان و، ئەم ئاسانکاریە زیادەڕۆیە پێچەوانەیە لەگەڵ

[1] ـ فتح الباري ٤٩٥/٧.

[2] ـ بڕوانە: محمد عبدالله أبو صعيليك: ((الامام الحاف؟ أبو حاتم محمد بن حبان البستي)) ص١٦٣-١٦٦.

هەموو فەرموودەناسان، ئەمەش کاریگەری خراپی هەبووە لەسەر (صحیح ابن حبان)) چونکە لە((دابەشکاریەکانیدا قسەو لێکدانەوەی دوورو فەرموودەی منکەری سەیری تێدایە)) بەپێی قسەی زەهەبی[1]، سەبارەت بەوازهێنانی ئیبن حەجەر -کەڕەخنەگری بەراوردکارە- لەسەر ئیبن حەبان لەمەدا ئاماژەیەکی پێویست هەیە سەبارەت بەلاوازی ئەم هەواڵە.

٢- ئەو گێڕانەوەیەی پێشەوە کەلەهەردوو صەحیحەکەدا هاتووە -بەهەمانشێوە ئیبن حەبانیش گێڕاویەتیەوە!- لەڕاشکاوی وڕوونیدا گەشتۆتە ڕادەیەک کەنەتوانرێت وەلا بنرێت، چونکە چونکە دەتوانین لەم دەربڕینانە تێبگەین، وەک: ((عەلی لەناوخەڵکی ڕێزی کەمی دەکرد، بۆیە ڕۆشت ئاشتەوایی لەگەڵ ئەبوبەکر کردو بەیعەتی پێدا))، ئەگەر پێشتر عەلی بەیعەتی پێدابێت؟باشەی ئەی واتای ئەم قسەیی عائیشە چییە: (( -ئەبوبەکر- باسی کێشەی عەلی و دواکەوتنی لەبەیعەت پێدان دەکات))، ئەی مانای ئەم قسەیەی عائیشە: ((لەو چەند مانگەدا بەیعەتی نەدابوو)) ئەگەر عەلی پێشتر بەیعەتی دابێت بەئەبوبەکر؟

ئەم هەمووو پینەوپەڕۆیە هۆکارەکەی زیادەڕەوی قسەی خۆسەپاندن و، هەنگاو هەڵگرتنە لەرێگەی هەڵەوە، وەک ئەوەی گوتراوە دواکەوتنی عەلی لەبەیعەتپێدانی ئەبوبەکر مەبەست لێی ((لاوازکردنی متمانەیە بەئیسلام بەشێوەیەکی گشتی و، بەهاوەڵان بەشێوەیەکی تایبەتی و، دەرخستنیان بەشێوەی بەکرێگیراو هەڵپەکار بۆ پۆست و پارە بائەوە بەسەرپێچیکردنی شەریعەتیش بێت))!! بەگوێرەی قسەی شێخی ئیستانبوڵی، کارەکەش بەوجۆرە

[1] ـ الذهبي: سير أعلام النبلاء ٩٧/١٦.

نیە کەشێخ لێی تێگەیشتووەو، بەو شێوەیەش نیە کەئەو پێشەوا پابەرزانەتێی گەیشتوون و هەموو تەمەنیان تەرخان کردووە بۆ بەرگری لەهاوەڵانی پایەبەرز، وەک ئیبن تەیمیەو زەهەبی و قورتبی، پێشتر لێکدانەوەی ئیبن تەیمیەمان سەبارەت بەبەیعەتپێدانی ئەبوبەکر هێنایەوە کە عەلی ((دەیویست خۆی ببێتە فەرمانڕەوا)) [١]، لێکدانەوەی بۆ دواکەوتنی سەعدی کوڕی عوبادە لەبەیعەتپێدان بەئەبوبەکر بەوەی کەسەعد: ((ئەو ڕێزەی لێنرابوو کەلەلایەن ئەنصارەوە ئەو ببێتە ئەمیر، ئەوەش ڕووینەدا، ئەوە لەناخیا مایەوە، هەرکەسیش شتێک لەبەر ئارەزووی واز لێ بهێنێت ئەوا وازهێنانەکەی هیچ کاریگەری نابێت)) [٢]، ئایا مەبەستی ئیبن تەیمیە لێرەدا ((نەهیشتنی متمانە بووە بەئیسلام بەشێوەیەکی گشتی و، بەهاوەڵان بەشێوەیەکی تایبەتی)) یاخود لای ئەو پابەندبوون بەحەقەوە لەپێشترە لەشوێنکەوتەیی؟

لەڕاستیدا هیچ شتێک گوزارشت لەمەزنی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) –ئەبوبەکرو عەلیش بەتایبەت- ناکات وەک گێڕانەوەکەی لەدوو صەحیحەکەدا هاتووە، بەڵگەیە لەسەر ئامادەیی عەلی بۆ پێداچووە بەحەقەکەداو چوونە نێو کۆمەڵی موسڵمانان، لەمەدا قوربانی بەویستە کەسییەکەی و ئارەزووی دونیایی خۆی دەدات، هەروەها لەچوونی ئەبوبەکر بۆ ماڵی عەلی لێبوردەیی ئەو وەک خەلیفەی موسڵمانان دەردەکەوێت –هەرچەندە لێردا عەلی هەڵەیە- ئەمەش بۆ ڕێزگرتنە لەماڵی پێغەمبەرو، یەکخستنی دڵی موسڵمانان و، یەکخستنی قسەیان، ئەو قسەیەی

---

[1] ـ منهاج السنة ٤٥٠/٧.

[2] ـ منهاج السنة ٣٣٥/٨.

قورتبی لەبارەی ئەم چیرۆکەوە کردوویەتی زۆرجوانە: ((قورتبی دەڵێت: هەرکەس لەوەی لەنێوان ئەبوبەکرو عەلیدا لەسەرزەنشتکردن و پۆزش هێنانەوە و ئەو بەویژدانیەی کەتێیدا ڕوویدا ڕابمێنێت، تێدەگات کەهەریەکەیان دانی دەنا بەفەزڵی بەرانبەرەکەیداو، دەڵەکانیان هاودەنگ بووە لەسەر ڕیزو خۆشەویستی، باسروشتی مرۆیش هەندێکجار زاڵ بوبێت، بەلاَم ئایینداری ئەوەی ڕەتکردۆتەوەو، خوای گەورە پشتیوانە)) [١]، ئەمەش مەزنی دەروونی مرۆڤی پارێزکارە هەروەک قورئانی پیرۆز وەصفی کردووە: ((إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ)) [٢]، نەک مەزنی فریشتەکان کەئیبن عەرەبی و قوتابیەکانی هەوڵی دۆزینەوەی دەدەن، بەوکارەش ژیانی هاوەڵان لەمانا شەرعیەکەی و ناوەرۆکە مرۆییەکەی دەردەکەن.

بەلاَم چیرۆکەکە واتای دیکەی هەیەو هەردوو جێنشینەکە ئەبوبەکرو عەلی (خوا لێیان ڕازی بێت) تێدەپەڕێنێت، ئەویش بریتییە لەوەی کەخەلافەتی ڕاشیدین لەدایکبووی کۆمەڵگەیەکی تێگەیشتووە: وێڕای مەزنی پێگەی عەلی کوڕی ئەبو تالب لەدڵی موسڵماناندا، لەگەڵ ئەمەشدا ئەو (( ڕێزی لای خەڵکی کەمی دەکرد)) کاتێ لەکۆمەڵ دابڕاوە ((هەستا بەبەیعەتپێدانی ئەبوبەکرو ئاشتەویای لەگەڵیدا))، ئیبن حەجەر ئاماژەی بۆ کاریگەری دەسەلاَتی کۆمەڵ لێرەدا لەسەر بەیعەتپێدانی عەلی بەئەبوبەکر (خوا لێیان ڕازی بێت) کردووەولەشرۆڤەی فەرموودەکەدا دەڵێت: ((عەلی لەناو خەڵکیدا وەک فاتیمە بوو)) واتە خەڵکی چۆن ڕێزیان

---

[1] ـ فتح الباري ٤٩٤/٧.

[2] ـ سورەتی الاعراف، ئایەتی ٢٠١.

لەفاتیمە دەگرت ڕێزیشیان لەم دەگرت، کاتێ فاتیمە مردو ئەم بەردەوام بوو لەسەر نەچوون بۆلای ئەبوبەکر خەڵکەکە ئەوەیان لەسەر ڕێزگرتن قەتیس کردەوە، بەهۆی هەبوونی ویستی بۆ ئەنجامدانی ئەوەی خەڵکی کردوویانە، لەبەر ئەوەیە عائیشە لەکۆتایی فەرموودەکەدا دەڵێت کاتێ هات وبەیعەتیدا ((کاتێ بەچاکی بەکارەکەدا چووەوە خەڵکی لێی نزیک بوون))، وەک ئەوەی کەپاساو بدەنە دواکەوتنەکەی ئەو کاتەی کەفاتیمە لەژیاندا بووە بەهۆی سەرقاڵییەوە بەفاتیمەو نەخۆشکەوتنیەوەو، دڵنەوایی دانیەوە لەو خەمەی بەهۆی وەفاتی باوکیەوە کەئەوی تیدایە، هەروەها بەهۆی ئەو وەڵامەی ئەبوبەکرەوە بۆ فاتیمە کاتێ پرسیاری میراتی لێکرد عەلی وای بینی کەهاوڕایی بێت لەدابڕانەکەدا)) [1].

لەبەر دوو هۆکار عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) بەهەڵوێستەکەی سەبارەت بەبەیعەتپێدانی ئەبوبەکر چووەوە: یەکەمیان ئەو تەقواو چاکەیەی لەدڵیدا بوو وای لێکردبوو کەبیری لێ بکاتەوەو بەحەقەکەدا بچێتەوە، دووەمیشیان ئەو بەرەنگاریەی لەکۆمەڵی موسڵمانانەوە بەرانبەری ڕوویدا، بەمجۆرە دەسەڵاتی کۆمەڵ کەمتر نەبوو لەدەسەڵاتی تەقوا لەخەلافەتی ڕاشیدیندا، کۆمەڵگا ئیسلامیەکانی دواتر ئەمەیان لەنێودا نەما بۆیە لەناوچوون.

عەلی دواتر ستایشی هەردوو خەلیفە ئەبوبەکرو عومەری بەجوانترین شێوە دەکرد، ئەوەی لەمبارەیەوە گێڕاویانەتەوە: ((لەعبدالبرەوە وتوویەتی: عەلی کوڕی ئەبوتاڵب هەستایەوەو چووە سەر مینبەرو، باسی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ی کردو، وتی:

---

[1] ـ فتح الباري ٤٩٤/٧.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گیانی سپاردو ئەبوبەکر بوویە خەلیفە، ئەمیش لەسەر ڕێگای ئەو جوڵایەوەو کاری کرد هەتا گیانی سپارد، پاشتر عومەر بوویە خەلیفە، ئەمیش لەسەر ڕیگای ئەوان ڕۆشت وکاری کرد هەتا وەفاتی کرد لەسەر ئەو ڕێیە بوو)) [1]، هەروەها ((ئەبوبەکر پەنای بەخوا دەگرت لەهەر نارەحەتیەک کەئەبو حەسەنی لەگەل نەبووایە)) [2] مەبەستی عەلییە، ئەم گوزارشتانە بەسە بۆ ئەوەی کەگیانی خۆشەویستی لەنێویاندا بڵاو بووەو، ناکۆکی سیاسی نێوانیان تەنها هەوری هاوین بووە.

ئەوەتا عەلی بەبۆنخشۆترین دەربڕین ماڵئاوایی لەعومەر بەرو دوا مەنزڵی دەکات: ((لەئیبن عەباسەوە دەڵێت: عومەر خرایە سەر پێخەفەکەی، خەڵکەکە دەورەیان دابوو دەپاڕانەوەو نوێژیان دەکرد بەرلەوەی کەبەرز بکرێتەوە، منیش لەنێویاندا بووم، تەنها پیاوێک ئاگایی (یرعنی) هێنامەوە کەشانی گرتم، بینیم عەلی کوڕی ئەبو تالبە، بۆ عومەر پاڕایەوەو وتی: کەس بەجێی نەهێشتووم خۆشویستتر بووبێت لەلام کە وەک ئەو بگەمەوە بەخوا وەک کارەکانی تۆ، سوێند بەخوا واگومان دەبەم کەخوا لەگەڵ دوو هاوەڵەکەتدا داتبنێ، زۆرجار من گوێم لەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەبوو کەدەیفەرموو: من و ئەبوبەکرو عومەر ڕۆشتین، من و ئەبوبەکرو عومەر چووین، من وئەبوبەکرو عومەر دەرچووین))

---

[1] ـ احمد ١/١٢٨و هیثمی وتوویەتی: ((گێڕەرەوەکانی متمانەپێکراون)) (مجمع الزوائد ٥/١٧٥-١٧٦)و، مقدسي: الاحاديث المختارة ٢/٢٨٧و لێکۆڵەرەکەی عبدالملک بن دهیش وتوویەتی: ((سەنەدەکەی صەحیهحە))، ابن ابی عاصم: السنة ٢/٥٥٢و لێکۆڵەرەکەی شێخ ناصر الدين الالباني دەڵێت: (سەنەدەکەی باشە)).

[2] ـ فتح الباري ١٣/٣٤٣.

[1]، هەروەها کە دونیای بەجێدەهێشت عەلی ستایشی ئەبوبەکریشی بەبۆنخۆشترین شێوە باسکردووە: ((لەئەبی وائیل، گێڕاویەتیەوە: بەعەلی وترا (لەکاتێکدا لەسەرەمەرگدا بوو): ئایا خەلیفەیەکمان بۆ دیاری ناکەیت؟ وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) خەلیفەی پاش خۆی دانەنا، بەڵام ئەگەر خوای گەورە چاکەی خەڵکی بوێت ئەوا لەسەر باشترینیان کۆیان دەکاتەوە، هەروەک چۆن پاش پێغەمبەرەکەی بەهۆی باشترینیانەوە کۆی کردنەوە)) [2].

**نمونەی دووەم:** ئیبن عەرەبی گفتوگۆیەکی نێوان معاویەو ئیبن عومەری سەبارەت بەبەیعەتپێدانی یەزید هێناوە، کرۆکەکەی ئەوەیە کەئیبن عومەر ڕازی نەبوو بەیعەت بدات بەیەزید، شێخ محب الدین لەسەر ئەوە قسە دەکات ودەڵێت: ((ئەم هەواڵە پێچەوانەی ئەوەیە کەلەکتێبی غەزاکانی صەحیحی بوخاریدا لەئیبن عومەرەوە هاتووە کەحەفصەی دایکی باوەڕدارانی خوشکی ئامۆژگاری کردووە کەپەلەبکات لەچوون بۆ بەیعەتدان و، وتی: لەڕاستیدا ئەوا چاوەڕوانتن، مەترسی ئەوەم هەیە دواکەوتنت ببێتە هۆی پەرتەوازەییان)) [3]، شێخ خەتیب ئاماژە بۆ ئەم فەرموودەی بوخاری دەکات: ((لەعکرمە کوڕی خالید لەئیبن عومەرەوە گێڕاویەتیەوەو وتوویەتی: چووم بۆ لای حەفصە نینۆکەکانی ئاوی لێدەچۆڕا، وتم: کاری خەڵکی بەوجۆرەیە کەدەیبینی و هیچ

---

[1] ـ بڕوانە: (فیض القدیر شرح الجامع الصغیر)ی مەناوی (٤٤٧/١، ٤٤٨) فەرموودەی ژمارە (٦١٥).

[2] ـ الحاکم ٨٤/٣و وتوویەتی: ((ئەم فەرموودەیە سەنەدەکەی صەحیحەو نەیانهێناوە))و، مبارکفوری وتوویەتی: ((بەیهەقی لە (الدلائل)دا ڕاستی کردۆتەوە)، بڕوانە: تحفة الاحوذي ٣٩٦/٦.

[3] ـ العواصم ٢٢٣ الهامش ٤١٨.

لەکارەکە بۆ من نەبوو، وتی: لەڕاستیدا ئەوا چاوەڕوانی تۆن و، مەترسی ئەوەم هەیە نەچوونت پەرتەوازەی لێبکەوێتەوە، لێی نەگەڕا هەتا ڕۆشت، کاتێ خەڵکی جیابوونەوە، معاویە وتاریداو وتی: کێ بوو دەیویست لەم کارەدا قسە بکات با باسی سەردەمی خۆیمان بۆ بکات، چونکە ئێمە لەپێشترین لەو ولەباوکی ئەویش، حەبیبی کوڕی مسلەمە وتی: ئەی بۆ وەڵامت نەدایەوە؟ عبدالله وتی: خۆم کۆکردەوەو هات بەخەیاڵمدا کەبڵێم: لەتۆ لەپێشتر ئەو کەسەیە لەدژی تۆو باوکت جەنگا لەسەر ئیسلام، ترسی ئەوەم هەبوو قسەیەک بکەم و ریزی موسڵمانان تێک بچێت و، خوین بڕژێت و، لەئەستۆی من بێت، ئەمجا ئەوەی خوا بەڵێنی داوە لەبەهەشتدا هاتە یادم، حەبیب دەڵێت: خۆتپاراست و بێگوناه بوویت)) [1].

بەڵام شێخ خەتیب لەبەر چەند هۆکارێک خۆی لاداوە لەلێکۆڵینەوە لەمە:

**یەکەمیان:** ئەم گێڕانەوەیە هیچ پەیوەندییەکی نیە بەبەیعەتپێدانی یەزیدەوە، بەڵکو لەبارەی کۆبوونەوەی دوو ناوبژیوانەکەیە لە دەومەت جەندل هەروەک ئیبن حەجەر لەشرۆڤەیدا بۆی ڕوونی کردۆتەوە، بگرە گێڕانەوەی هەریەک لە عبدالرزاق وتەبەرانی بۆ فەرموودەکە ئەوەیان راگەیاندووە، ئیبن حەجەر دەڵێت: ((قسەکەی: ((کاتێ خەڵکی جیا بوونەوە)) واتە پاش ئەوەی دوو ناوبژیوانەکە کە ئەبو موسای ئەشعەری کەلەلایەنی عەلیەوە بوو، لەگەڵ عەمری کوڕی عاص کەلەلایەنی معاویەوە بوو، ناکۆک بوون، لەگێڕانەوەکەی عبدالرزاقدا لەمعمرەوە لەفەرموودەکەدا هاتووە: ((

---

[1] ـ البخاري ١٥٠٨/٤.

کاتێ دوو ناوبژیوانەکە جیا بوونەوە))، لەکاتێکدا کەئەو مەبەستەکە لێکدەداتەوەو دیاری دەکات کەچیرۆکەکە لە (صفين) روویداوە)) [١]،پاشان ئیبن حەجەر وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە کەبەجگە لەوە لێکیان داوەتەوەو، وتوویەتی: ((هەندێکیان بەدروستیان زانیووە کەمەبەست کۆبوونەوەی کۆتایی بووە کەلەنێوان معاویەو حەسەنی کوڕی عەلیدا بوو، گێڕانەوەکی عبدالرزاق ئەوە ڕەت دەکاتەوە)) [٢]، پاشان بەپشت بەستن بەگێڕانەوەکەی تەبەرانی کارەکەی زیاتر ڕوون دەکاتەوەو، دەڵێت: ((پاشان لەگێڕانەوەکەی حەبیبی کوڕی ئەبی سابتدا لەئیبن عومەرەوە بینیم دەڵێت: کاتێ لەو رۆژەدا بووین کە عەلی ومعاویە لەدەومەت جەبەل کۆبووبوونەوە، حەفصە (بەمن) وتی: شیاو نیە بۆت کەلەئاشتەواییەک دوا بکەویت کەخوای گەورە بەهۆیەوە نێوانی ئومەتی محەمەد چاک دەکات و، تۆش زاوای پێغەمبەری خوایت و، کوڕی عومەری کوری خەتابیت، دهڵێت: لەو رۆژەدا معاویە بەختێکی مەزنی هەبوو، وتی: کێ چاوی بڕیوەتە ئەوە کارە یان بەئاواتیەتی یان گەردنی بۆ بەرز دەکاتەوە.. فەرموودەکە تەبەرانی هێناویەتی)) [٣]، لەبڕگەی تایبەت بەتێبینیەکان لەسەر مەنهەجی ئیبن تەیمیە پێشوودا دەقی تەواوی گێڕانەوەکەمان هێنا، بەهەمان شێوە دەقی گێڕانەوەکەی ئیبن سەعد لەکتێبی (الطبقات)دا کەلەوانەی پێشتر ڕاشکاوانەترە چونکە تێیدا هاتووە: ((..کاتێ وادەی عەلی و

---

[1] ـ فتح الباري ٤٠٣/٧.
[2] ـ فتح الباري ٤٠٣/٧..
[3] ـ فتح الباري ٤٠٣/٧.

معاویە لەدەومەت جەندەل هات، هیچ لای معاویە لەوە زیاتر جێی مەترسی نەبوو کەئەو و عەلی لێی دەربچن (واتە لەخەلافەت)..)) [١].

باسی ((جیا بوونەوەی دوو ناوبژیوانەکە)) لەگێڕانەوەکەی عبدالرزاقدا کراوەو، ((کۆبوونەوەی عەلی ومعاویە لەدەومەت جەندەل)) لەگێڕانەوەکەی تەبەرانیداو، ((وادەی عەلی و معاویە لەدەومەت جەندەل)) لەگێڕانەوەکەی ئیبن سەعددا.. ئەمانە بواری گومانکردن ناهێڵنەوە کەچیرۆکەکە پەیوەستە بەڕووداوی ناوبژیوانیەکەوە و، پەیوەندی نیە بەبەیعەتپێدانی یەزیدەوە.

بەهەر حاڵ شێخ خەتیب بەتەنها بەرپرسیارێتی ئەم هەڵەیە هەڵناگرێت، چەنکە بەرلەئەو هەیسەمی[٢] و ئیبن جەوزی[٣] هەمان شتیان وتووە.

**دووەمیان:** حەفصەی دایکی باوەڕداران ئامۆژگاری براکەی نەکردووە پەلە بکات لەچوون بۆ بەیعەتدان بەهیچ کەس- یەزیدو جگە لەیەزیدیش- بەڵکو بۆ چوونی بووە بۆلای کۆمەڵی موسڵمانان لەکاتێکدا بۆ ئاشتەوایی کۆبووبوونەوە، دەربڕینی فەرموودەکە لەگێڕانەوەکەی تەبەرانیدا ئەوە دەردەخات، حەفصە بەبراکەی وت: ((جوان نیە بۆت لەئاشتەواییەک دوابکەویت کەخوای گەورە نێوانی ئومەتی محەمەدە پێ چاک دەکات، لەکاتێکدا تۆ زاوای پێغەمبەری خواو، کوڕی عومەری کوڕی خەتابیت..))، لەم دەقەوە دەردەکەوێت کەعبدالله کوڕی عومەر بۆ بەیعەتداپێدانی هیچ کەس بۆ دەومەت جەندل نەچووە، بەڵکو بۆ ئامادەبوونی ئاشتەوایی و، بەهۆی سەنگینی مەعنەوی هەبوونی ئەو لەو ئاشتەواییەدا رۆشتووە، بگرە

---

[1] ـ مجمع الزوائد ٢٠٨/٤.

[2] ـ ابن سعد: الطبقات الكبرى ١٨٢/٤.

[3] ـ بڕوانە وەڵامی ئیبن حەجەر بۆ ئیبن جەوزی لە (فتح الباري)د٤٠٣/٧ا.

خودی ئیبن عومەر بەربژێر بووە بۆ وەرگرتنی جێنشینی لەو ڕۆژەدا، ئەگەر نەخشەی پلانەکە سەرکەوتوو بووایە، ئیبن عمادی حەنبەلی دەڵێت: ((لەرۆژی ناوبژیوانیەکەدا لەگەڵ بوونی عەلی و گەورە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) دیاریکرابوو بۆ جێنشینی)) [١]، زەهەبیش لەمبارەیەوە وتوویەتی: ((وتم: خەریکبوو ئەو رۆژە لەگەڵ بوونی پێشەوا عەلی و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بەیعەتی پێ بدرێت، ئەگەر بەیعەتیشی پێ بدرایە ئەوا هیچ کەس ناڕازی نەبوو لەسەری)) [٢]، هەروەها لەبارەیەوە ئەڵێت: ((یەکێکە لەپایەبەرزان لەکردارو گوفتاردا، بەشداری خەندەقی کردووە، لەبەشدارانی بەیعەتی ڕەزوان بووە، لەوانەبوو بۆ جێنشینی گونجاو بوو،لەرۆژی دوو ناوبرژیوانەکەدا لەگەڵ بوونی پێشەوا عەلی و سەعد رزگارکاری عێراق و هاوەڵانی تر (خوا لێیان رازی بێت) بۆ ئەوە دیاری کرابوو)) [٣].

بەیعەتپێدانی عبدالله کوڕی عومەر ئەگەر روییدایە ئەوا کودەتا بوو بەسەر پێوەرە سیاسیەکانی نەفامیدا کەدەستی بەدەرکەوتن کردبوو لەو رۆژەدا، ئومەتیشی دەگێڕایەوە بۆ خەلافەتی ڕاشدین لەسەر مەنهەجی پێغەمبەرایەتی، بەڵام بەداخەوە ئەو بەیعەتپێدانە ڕووینەدا، چونکە معاویە قبوڵی نەکردو، ڕایگەیاند کەئەو لەپێشترە بۆ ئەو کارە لەعبداالە کوڕی عومەرو باوکیشی!! پێشتر زەهەبی وەلامی عبداللە کوڕی عومەری بۆی خستە ڕوو کەئەم بۆ ئەو کارە لەیەزید لەپێشترە ((لەباوکی و باپیریشی)).

---

[1] ـ ابن العماد: شذرات الذهب ٣١٠/١.

[2] ـ سير أعلام النبلاء ٢٢٥/٣.

[3] ـ الذهبي: تذكرة الحفاظ ٢٧/١.

هەرچۆنێک بێت فەرموودەکە ئەوەی لێدەخویندرێتەوە کەئیبن عومەر لەکاتی خۆیدا ئامادە نەبووە بۆ بەیعەت پێدانی معاویە –ئیتر چۆن بەیەزیدی دەدات– بەوجۆرەش سەیری نەدەکردن کەهیچ یەکێکیان بۆ جێنشینی شایستە بن، لەبەر ئەوە بەخەیاڵیدا هات بەمعاویە بڵێت: ((ئەوەی لەدژی تۆو باوکت لەسەر ئیسلام جەنگا لەپێشترە بۆ ئەم کارە)).

راستە عبداللە کوڕی عومەر پاشتر بەیعەتی داوە بەمعاویەو، دواتریش بەیەزیدو، دوای ئەوانیش بەعبدالملک کوڕی مەوران، ئەمەش بەهۆی ئەو ڕەوتەی کەهەیبوو کەلەگەڵ کۆمەڵدا بێت پاش ئەوەی چاوتێبڕینی چاوچنۆکان بڕاردەی ئەمیان لەناوبرد، ئەم مەنهەجەش لەنامەی بەیعەتدان بە عبدالملک دەردەکەوێت کەتێیدا دەڵێت: ((هەواڵم پێ گەیشتووە کەموسڵمانان لەسەر بەیعەتپێدانت کۆدەنگن، منیش دەچمە نێو ئەوەی کەموسڵمانان چونەتە ناوی)) [١]، بەڵام لەصەحیحدا هاتووە کەئیبن عومەر لەکۆتاییەکانی تەمەنیدا پەشیمان بوو لەبێلایەنیەکەی و، خەمی بۆ ئەوە دەخوارد کەلەژێر بەیداخی عەلی کوڕی ئەبو تالبدا بۆ لەدژی دەستە زیادەڕەوکارەکە نەجەنگا: ((لەئیبن عومەرەوە دەگێڕنەوە، دەڵێت: ((ئیبن عومەر دەڵێت: هیچ شتیک نیە خەمی بۆ بخۆم بۆ ئەوە نەبێت لەدژی ئەو دەستە زیادەڕەوکارە نەجەنگام)) [٢]، لەگێڕانەوەیەکیشدا: لەئیبن عومەرەوە کاتێ لەسەرە مەرگدا بووە وتوویەتی: لەم دونیایەدا هیچ شتێکم لەدڵدا نیە خەمی بۆ بخۆم جگە لەوەی کەلەدژی ئەو

---

[1] ـ ئیبن سەعد بەسەنەدێکی صەحیح گێڕاویەتیەوە، بڕوانە: سیر أعلام النبلاء ٢٣١/٣.

[2] ـ الهیثمي: مجمع الزوائد ٢٤٢/٧و، دەڵێت: ((تەبەرانی بەسەنەدی جۆراو جۆر گێڕاویەتیەوە کەیەکێکیان گێڕەرەوەکانی گێڕەرەوەی صەحیحن)).

دەستە زیادەڕەوکارە نەجەنگام کەبەرانبەر عەلی کوڕی ئەبوتاڵب شەریان کرد)) [1]، لەگێڕانەوەیەکی تردا: ئیبن عومەر کاتێ لەسەرە مەرگدا بوو وتی هیچ شتێ لەدەروونما شک نابەم خەمی لێ بخۆم ئەوە نەبێت بۆ لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو تاڵبدا لەدژی ئەو دەستە زیادەڕەوکارە نەجەنگام)) [2]، ئەوانەی بەشێوازە جۆراو جۆر هاتبێت: ((لەمیمون کوڕی مهرانەوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو عبداللە کوڕی عومەر دەیوت: خۆم بەدوور گرت وبەشدار نەبووم کەجەنگان لەسەر حەق زۆرباشتر بوو)) [3]، ئەبو عبداللە حاکم وتوویەتی: ((ئەمە دەروازەیەکی گەورەیە کە کۆمەڵێک لەگەورە شوێنکەوتووان لەعبداللە کوڕی عومەرەوە گێڕاویانەتەوە)) [4]، ئەبو عومەری کوڕی عبدالبر وتویەتی: ((بەصەحیحی لەعبداللە کوڕی عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) لەچەند ڕێیەکەوە گێڕاویانەتەوە دەڵێت: بۆ هیچ شتێک خەم نەخواردووە وەک ئەوەی خەمم بۆ ئەوە خواردووە کەلەگەڵ عەلیدا (خوا لێی ڕازی بێت) لەدژی دەستە زیادەڕەوکارەکە نەجەنگام)) [5]، ئەمەش زیاد کراوە: ((ئەو (خوا لێی ڕازی بێت) بەهۆی خۆپارێزی وتەقوایەوە جەنگەکانی عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) لێی تیکەل بوبوو کەدانیشتبوو، لەکاتی سەرەمەرگدا لەوە پەشیمان بوو)) [6].

---

[1] ـ الاستیعاب ٩٥٣/٣.
[2] ـ سیر أعلام النبلاء ٢٣١/٣-٢٣٤.
[3] ـ المستدرک ٦٤٣/٣ والاستیعاب ٩٥١/٣، والطبقات ١٦٤/٤.
[4] ـ المستدرک ١٢٥/٣.
[5] ـ الاستیعاب ٧٧/٨.
[6] ـ الاستیعاب ٩٥١/٣.

عبد الله کوڕی عومەر تەمەنێکی زۆر ژیا هەتا کاریگەریەکانی ئەو هەڵگەڕانەوە سیاسیەی بۆ دەرکەوت کەبەر کۆمەڵگای موسڵمان کەوت و، دەرئەنجامەکانی ئەو لادانە خراپەی بینی کە: کوشتاری بنەماڵەی پێغەمبەر لەکەربەلاو، حەڵاڵکردنی خوێنرێژی شاری مەدینە لەڕووداوی (الحرة)داو، پەلاماردنی مەکەو سوتانی کەعبەو، وازهێنان لەبنەمای شوراو دادپەروەری لەفەرمانڕەوایی و کارداو، سەروەری ستەمی سیاسی و لەخۆبوردن و تۆڵەسەندنەوە لەڕێی دەسەڵات و سامانەوە ڕوویدا.. لەبەر ئەوە پەشیمان بوو لەسەر بێلایەن بوونی، ئەم پەشیمان بوونەوەیە گوزارشت لەحەقیقەتی کۆتا هەڵوێست و پوختەی ئەزموونی لەژیاندا دەکات و، ڕاستگۆ بووە ئەوکەسەی وتوویەتی: ئاشوب ئەگەر هات کێشە دەنێتەوە (أشكلت)، ئەگەر تەواو بوو ئەنجامەکانی دەردەکەوێت (اسفرت).

ئەمەی کە عبدالله کوری عومەر پێی گەیشتووە دوور نیە لەوەی ئیبن تەیمیە پێی گەیشتووە دوور نیە کەپێشتر هێنامانەوەو خستمان ڕوو: ((ستەمکار کەستەم دەکات خەڵکی بەئاشوبەوە گیرۆدە دەبن ئەوانەشی ستەمیان لێ نەکراوە تووش دەبن، ئەو کاتە دەستەوسان دەبن لەڕێگری لێ کردنی، بەپێچەوانەی ئەوەی ئەگەر ستەمەکە لەسەرەتاوە ڕێگری لێ بکات، ئەو کاتە هۆکاری ئاشوبەکە نەدەما)).

**سێیەم: حومکدان لەسەر کەسەکان:**

**نمونەی یەکەم:** ئیبن عەرەبی لەحوکمدانی لەسەر کەسێتی مەروانی کوڕی حەکەم دەڵێت: ((مەروان پیاوێکی دادپەروەرەو لەگەورە پیاوانی ئومەتە لای هاوەڵان و شوێنکەوتووان و شەرعزانانی موسڵمان، سەبارەت بەهاوەڵان ئەوەتا سەهلی کوڕی

سەعد فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە، شوێنکەوتووانیش ئەوا هاوڕێکانی لەسوننەنەکاندان، با ڕێگەشی پێدابن بەناوی هاوەڵیەوە لەیەکێک لەدوو بۆچووندا، سەبارەت بەشەرعزانانیش هەموویان بەمەزن سەیریان کردووەو، خەلافەتەکەیان بەبەهاپێدراو سەیر کردووەو، لەدەوری فەتواکانی بوون و، پابەندبوون بەگێڕانەوەکانیەوە، بەڵام مێژوونووسە نەفامەکان و ئەدیبەکان ئەوا بەگوێرەی خۆیان باسی دەکەن)) [1].

هەڵوەستەیەکمان لەسەر ئەم هەلسەنگاندنەی کەسێتی مەروان دەبێت:

ئەوەی کەسێکی دادپەروەر بووە، ئەمەیان بۆ جیاوازی زاراوەیی لەچەمکی دادپەروەریدا دەگەڕێتەوە، ئەگەر دادپەروەری گێڕانەوە بێت ئەوا بەڵێ، مەروانی کوڕی حەکەم –لەسەر کردەوەکانی– تۆمەتی درۆزنی لەفەرموودە گێڕانەوە لەپێغەمبەری خواوە (صلی الله علیە وسلم) نادرێتە پاڵ، بۆ ئەمەش عروەی کوڕی زوبیر شاهێدی بۆ داوەو دەڵێت: ((مەروان لەفەرموودەدا تۆمەتبار نەکراوە)) [2]، ئەو لای کۆمەڵی زانایانی فەرموودەناس لەگێڕانەوەدا تۆمەتبار نیە، ((سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی کەلەهاوەڵانە بەپشت بەستن بەڕاستگۆییەکەی فەرموودەی لێ گێڕاوەتەوە)) [3]، هەروەها کۆمەڵێک لەزانایانی شوێنکەوتووان فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە هەروەک ئیبن عەرەبی لەبارەیەوە وتوویەتی، بوخاریش لەصەحیحەکەیدا فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوەو، ئەگەرچی بوخاریش بەدەر نیە لەڕەخنە لەسەر ئەوە،

---

[1] ـ العواصم ص١٠٢.
[2] ـ ابن عبدالبر: الاستیعاب ١٣٩٠/٣ وابن حجر: تهذیب ٨٢/١٠.
[3] ـ مقدمة فتح الباري ٤٣٣/١.

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئیسماعیلی ئەوەی بەنەنگی لەسر بوخاری داناوە کەفەرموودەکەی هێناوەو، شمشێردانی لەتەڵحە کەیەکێکە لەدەکەسەکە (ئەوانەی مژدەی بەهەشتیان پێدراوە) لەرۆژی (جمل)دا یەکێکە لەتاوانە گەورەکانی، کەئەوانە هەموویان لەگەڵ عائیشەدا بوون و کوشتی، پاشان بەزەبری شمشێر بوویە خەلیفە)) [١]، و دەڵێت: ((لەبارەی خەلافەتەوە قسەی لەگەل کرا)) [٢].

قسەکردن لەسەر ئەم گێڕانەوەی مەروان بەدەر نیە لەزیادە رێز پێدان(وجاهة)، بەتایبەت پاش ئەوەی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) لەوەی بوخاری گێڕاویەتیەوە بەدرۆی خستۆتەوە: ((مەروان فەرمانڕەوای حجاز بوو، معاویە لەوێ داینابوو، وتاریداو باسی معاویەی کرد تا لەپاش باوکی بەیعەتی پێ بدرێت، عبدالرحمن کوڕی ئەبوبەکر شتیکی پێ وت، وتی: بیبەن، چووە ماڵی عائیشە، ئەوانیش نەیانتوانی بیبەن، مەروان وتی: ئەمە ئەو کەسەیە کەئەم ئایەتەی لەبارەوە هاتە خوارەوە: ((وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَكُمَا أَتَعِدَانِنِي..))، عائیشە لەپشتی پەردەوە وتی: هیچ ئایەتێک لەبارەی ئێمەوە دانەبەزیووە، تەنها ئەوە نەبێت کەخوای گەورە پاساوی منی بەئایەت نارد)) [٣]، لەگێڕانەوەی نەسائیدا: ((لەمحەمەدی کوڕی زیاد، دەڵێت پاش ئەوەی معاویە بەیعەتیدا بەکوڕەکەی، مەروان وتی: لەسەر سونەتی ئەبوبەکرو عومەر، عبدالرحمانی کوڕی ئەبوبەکر وتی: بەڵکو لەسەر سوننەتی هرقل و قەیسەر، مەروان وتی: ئەمە ئەو کەسەیە ئەم ئایەتەی لەسەر دابەزی: ((وَالَّذِي قَالَ

---

[١] ـ بابن حجر: تهذيب التهذيب ٨٢/١٠.

[٢] ـ مقدمة فتح الباري ٤٦٣/١.

[٣] ـ البخاري ١٨٢٦/٤.

لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَكُمَا..))، ئەو قسەیە گەیشتەوە بەعائیشە، وتی: درۆی کردووە، سوێند بەخوا ئەو لەسەری دابەزیووە، ئەگەر بمەوێت ئەوەی لەسەری دابەزیوە ناوی دەبەم، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەفرەتی کردووە لەباوکی مەروان ومەروان کەلەپشتی ئەوە، جا مەروان (فضض) لەنەفرەتەکەی خوا)) [١]، ئیبن حەجەر دەڵێت: ((چەند فەرموودەیەک لەبارەی نەفرەت لێکرانی حەکەمی باوکی مەروان و ئەوەی لێی دەبێت هاتووە، کەتەبەرانی و جگە لەویش هێناوەیانە، بەزۆری قسەیان لەسەرە، هەندێکیان باشە، لەوانەیە مەبەست تایبەتکردنی ئەو تازەپێگەیشتوانە(غلمان) بێت بەوە)) [٢]، لەوانەی کەسەنەدەکەیان باشە ئەوەی کەبەزاز گێڕاویەتەوە))..مەروان وتی تۆ ئەو کەسەیت ئەم ئایەتەت لەسەر هاتە خوارەوە: ((وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَكُمَا..))، عبدالرحمان وتی: درۆ دەکەیت، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەفرەتی لەباوکت کردووە)) [٣].

ئیبن حەجەر پاساو دەهێنێتەوە بۆ سەعدو، هەندێک لەگەورە شوێنکەوتووان کەلە مەروانەوە گێڕاویانەتەوە و، وتوویەتی: ((ئەوەی کەسەهلی کوڕی سەعدو، عروە (کوڕی زوبیر)و، عەلی کوری حسین و، ئەبوبەکر کوڕی عبدالرحمان کوڕی حارس – کەبوخاری فەرموودەکانی ئەوان لەوەوە گێڕاویانەتەوە

---

[1] ـ النسائي ٤٥٨/٦ و بەراوردی بکە لەگەڵ حاکم ٥٢٨/٤و هیثمي: مجمع الزوائد ٢٤١/٥ والاصابة ٣٢٧/٤، هەروەها بڕوانە سیوطي: الدرر المنثور ٤٤٤/٧و شوكاني: فتح القدير ٢٧٠/٥.

[2] ـ فتح الباري ١١/١٣.

[3] ـ مجمع الزوائد ٢٤١/٥و هیثمی وتوویەتی: ((بەزاز گێڕاویەتیەوەو سەنەدەکەی زۆرباشە)).

لەصەحیحەکەیدا هێناویەتی- کەئەو کاتە بووە کەلەلایان ئەمیر بووە لەمەدینە، پێش ئەوەی بەهۆی ناکۆکی لەسەر ئیبن زوبیر ئەوەی لێ ڕوویدا، خوداش ئاگادارترە)) [1]، ئەوان لەوەوە -بەپێی لێکدانەوەی ئیبن حەجەر- پێش ئەوەی کەبەوە پیس ببێت لێیان گێڕاوەتەوە، ئەمەش لای ئەوان پاش ئەوە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر دادپەروەری تێدا نیە، بەڕخنە وەرناگیرێت لەسەر چاکەخوازان کەپێش ئەوەی ئەو کارانە ئەنجام بدات لەمەروانەوە فەرموودە بگێڕنەوە، هاوشێوەی ئەمە لەگەڵ کوڕەکەشی عبدالملک کوڕی مەروان ڕوویدا کەسنورداربوو لای ئەهلی فیقهـ پێش ئەوەی دەستی سوور ببێت بەخوێنی موسڵمانان لەکاتی هەوڵدانیدا بۆ سەپاندنی دەسەڵاتە ناشەرعییەکەی بەزەبری هێز، ئیبن قەیم وتوویەتی: ((عبدالملک کوڕی مەروان بەموفتی دادەنرا بەرلەوەی ببێتە دەسەڵاتدار)) [2].

بەڵام مەبەست لەدادپەروەریەکەی مەروان لای ئیبن عەرەبی دادپەروەری ڕەفتارە، وەک ئەوەی لەقەسەکەی وەردەگیرێت ((دادپەروەرەو لەگەورەکانی ئومەتە)) زۆر بەدەخەوە کەمەروان لەوانە نیە، خوای گەورە لەئێمەو ئەویش خۆش ببێت، تەنانەت ئەو زانایانەشی کەبەرگریان لەگێڕانەوە لێی کردووە بەجۆرێک کەلەگەڵ ئەو دادپەروەریەدا ناگونجێت، زەهەبی وتوویەتی: ((ئەو لەتابعینەو ئەو کردەوانەی هەیە)) [3]، ئیبن حەجەر لەبارەی مەروان و زیاد کوڕی ئەبیە و مختار کوڕی ئەبوعوبەیدە دەڵێت: ((ئەوەی سەیرە کەئەو سێ کەسە ڕەچەڵەکیان لەیەک نزیکە، بەهەمان شێوە

---

[1] ـ ابن حجر: مقدمة فتح الباري ٤٤٣/١.

[2] ـ ابن القيم: اعلام الموقعين ٢٦/١.

[3] ـ الذهبئ: المغنى فى الضعفاء ٦٥١/٢.

ستەمكاریشیان لـەفـەرمـانڕەوایدا)) [١]، جا ئـەبێ ئـەو دوو هـاوەڵـەی چۆن بن!!

ئەبێ ئەو کەسەی لەچینی زیادی کوری ئەبیەو مختار کوڕی ئەوعوبەیدەی سەقەفی بێت بۆ ئەوە شیاو بێت وەسفی بکرێت کەلە ((گەورەکانی ئومەتە))؟ ئایا زەهەبی و ئیبن حەجەرو هەیسەمی- کەهەموویان فەرمـوودەی کوژرانی تەڵحەیان بەدەستی مەروان ڕاست کردۆتەوەو ڕەفتارەکانیان روون کردۆتەوە- بخرێنە ناو ((میژوونووس و ئەدیبانەی نەفامن)) کەئیبن عەرەبی مەبەستی بووە، یان لەوانەن کە ((کینەی دڵیان بەتانەدان لەمەروان و ئەوانەی لەمەروان باشترن دەردەکەن)) بەپێی دەربڕینی شیخ خەتیب؟ هەرکەس زانست و ویژدانی هەبێت تێدەگات کەئەوانە نەلە ئەمانەن و نەلەوانە، بەڵکو ئەوانە زانایانی پایەبەرزن و ئەهلی تەقواو لێکۆڵینەوەن، حەقیان بەسەر کەسدا داوەو، هیچ شتیکی وایان نەبینیووە ڕەنگرێژ کرابێت بەبەتاڵ بۆ بەرگریکردن لەمەروان.

بەڵام هێمادان بەوەی کەمەروان لەهاوەڵانە لەقسەکەی ئیبن عەرەبیدا: ((..با دروست بێت ناوی هاوەڵی لێ بنرێت))، ئەوا ئەو کەسە لەوانە نیە لێیەوە بگوزارێتەوە: ((ترمزی دەڵێت پرسیارم کرد لەمحەمەد –واتە لەبوخاری- پێم وت: مەروانی کوڕی حەکەم پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ی بینیووە؟ وتی: نەخێر)) [٢] و،

---

[1] ـ ابن حجر: لسان الميزان ٤٩٣/٢.

[2] ـ أحمد بن عبدالرحيم الكندي: تحفة التحصيل فى ذكر رواة المراسيل ٢٩٨/١و بەراوردی بکە لەگەڵ ابن حجر: تهذيب التهذيب ٨٢/١٠.

((ئەبو زرعە دەڵێت هیچی لەپێغەمبەر (صلى اللە علیە وسلم) گوێ لێ نەبووە)) [1]، زەهەبیش دەڵێت: ((ساغ نەبۆتەوە کەبیستبێتی)) [2].

هیچ شتێکم لەبارەی ڕێزی مەروان کەچاوی کەوتبێت بەپێغەمبەر (صلى اللە علیە وسلم) نەبینیووە جگە لەواقدی هەواڵگێڕەوەی درۆزن، باجی لەژیاننامەی مەرواندا وتوویەتی: ((واقدی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى اللە علیە وسلم)ی بینیوەو هیچ شتێکی لێیەوە نەبیستووە!!)) [3]، ئیتر بۆ واز لەقسەکەی بوخاری وئەبو زرعەو زەهەبی بهێنرێت -کەلەلوتکەی لێکۆڵینەوەو شارەزایانی پیاوناسین- بۆ قسەی واقدی کەهەمووان کۆدەنگن واز لەگێڕانەوەکانی بهێنرێت؟!

هەرکەس لەناکۆکییە سیاسیەکانی سەرەتای هاتنی ئیسلام بەمەنهەجێکی دادپەروەرانەو بەویژدانەوە بکۆڵێتەوە، نەک بەمەنهەجی ((شیعەگەری سوننی)) کەئیبن عەرەبی و قوتابیە هاوچەرخەکانیان پەیڕەویان لێ کردووە، تێدەگات کەمەروانی کوڕی حەکەم دەستێکی باڵای هەبووە لەسەرهەڵدانی ئاشوبەکەو تێکدانی پایەکانی خەلافەتی ڕاشیدیندا، لەمەشدا عبدالملک کوڕی و نەوەکانی تریان شوێنی کەوتن، ئەگەر خوای گەورە لەنیو بەنی مەرواندا خەلیفەی راشیدین عومەری کوڕی عبدالعزیزی نەهێنایە ئەوا گشتاندنی ئەو حوکمە بەسەر هەموویاندا ڕاست بوو، لەبەر ئەوە هەندێک لەهاوەڵان و شوێنەکەوتووان وا لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تێگەیشتبوون : ((هلكة أمتي على أيدي غلمان من قريش)) کەمەبەستی لێی بەنی مەروان بێت،

---

[1] ـ العلائي: جامع التحصيل ٢٧٦/١.

[2] ـ الذهبي: الكاشف ٢٥٣/٢

[3] ـ سليمان بن خلف الباجي: التعديل والتجريح ٧٣١/٢.

پێشەوا بوخاری وتوویەتی: ((موسای کوڕی ئیسماعیل دەگێڕێتەوە بۆمان، کەعەمری کوڕی یەحیای کوڕی سەعید کوڕی عەمری کوڕی سەعید وتوویەتی: باپیرەم هەواڵی پێدام و، وتی: لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا لەمزگەوتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەشاری مەدینە دانیشتبوون مەروانیشمان لەگەل بوو، ئەبوهورەیرە وتی: گوێم لەڕاستگۆی باوەڕپێکراو بوو فەرمووی: ((هلكة أمتي على أيدي غلمة من قريش)) واتە: (تیابەری ئومەتەکەم لەسەر دەستی مێرد منالانێک لەقورەیش دەبێت)، مەروان وتی: نەفرەتی خوا لەو مێرد منالانە بێت، ئەبوهورەیرە وتی: ئەگەر بمویستایە کەبڵێم کام بنەماڵەو بنەماڵەی ترە ئەوا دەمتوانی.

لەگەڵ باپیرم دەچوم بۆلای بەنی مەروان ئەکاتەی فەرمانڕەوای شام بوون، کاتێ منالانێکی تازە پێگەیشتووی بینین پێی وتین: لەوانەیە ئەوکەسانە لەوانە بن، وتمان: تۆ ئاگادارتری)) [1]، گێڕانەوەکەی ئەحمەد ڕونترو ڕاشکاوانەترە: ((لە سەعیدی کوڕی عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاصەوە، دەڵێت: باپیرەم سەعیدی کوڕی عەمری کوڕی سەعید هەواڵی پێدام، لەئەبو هورەیرەوە وتوویەتی: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ((هلكة أمتي على يد غلمة من قريش))، مەروان لەو کۆبوونەوەیەدا بوو پێش ئەوەی هیچ پۆستێک وەربگرێت، وتی: نەفرەتی خوا لەو مێرمنالانە، (ئەبوهورەیرە) وتی: بەلام وەلا ئەگەر بمەوێت بڵێم فلانە بنەماڵەو فلانە بنەماڵەیە ئەوا دەموت، وتی من و باوکم لەگەڵ باپیرم دەچووینە لای بنەماڵەی مەروان ئەوکاتەی فەرمانڕەوا بوون بینیمان ئەوان لەوانە بوون و، ئەوەی بەیعەتی

[1] ـ البخاري ٢٩٨٥/٣.

پێدەدرا لەلانکدا (ساوای نێو بێشکە) بوو، پێی وتین: بۆی هەیە ئەوانە لەوانە بن کەگوێت لەئەبوهورەیرە بوو باسی کردن، ئەم پاشایانە هەندیکیان لەهەندێکیان دەچن)) [1]، ئیبن حەجەر لەشرۆڤەی فەرموودەکەی بوخاریدا دەڵێت: ((مەبەست لەلەناوبردنی خەڵکی بەهۆی داواکردنی دەسەڵاتەوەو شەڕکردنە لەپێناویدا، بەوەش رەوشی خەڵکی تێک دەچێت و، بەهۆی بەشوێن یەکداهاتنی ئاشوبەکانەوە کوشتار زۆر دەبێت، لەڕاستیشدا وەک ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی دابوو روویدا)) [2].

بەڵام قسەکەی مەروان: ((نەفرەتی خوا لەو مێردمناڵانە)) ئەوە هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەئەبوهورەیرە فەرموودەکەی لەسەردەمی معاویەدا گێڕاوەتەوە هەروەک ئیبن حەجەر وتوویەتی و، بەرلەوە بووە کەمەروان هیچ پۆستێکی سیاسی بگرێتە دەست، هەروەک گێڕانەوەکەی ئەحمەد ڕوونی دەکاتەوەو، ئیبن حەجەر قسە لەسەر ئەوە دەکات و، دەڵێت: ((ئاگادارکردنەوە: نەفرەت کردنەکەی مەروان لەو مێردمناڵانە جێی سەرسوڕمانە کەدیارە لەمناڵەکانی ئەون، لەوانەیە خوای گەورە ئەوەی بەسیر زاریدا هێنا بێت تاببێتە بەڵگەیەکی توندتر بەوهیوایەی ببێتە ئامۆژگاری بۆیان، چەندین فەرموودەی تر لەسەر نەفرەت لێکرانی حەکەمی باوکی مەروان و ئەوەی لەو بێت هاتووە، کەتەبەرانی و کەسانی تر هێناویانە، بەزۆری قسەیان لەسەرە، هەندێکیشیان باشن، لەوانەیە مەبەست لەتایبەتکردنی ئەو مێردمناڵانە بێت کەباسیان کراوە

---

[1] ـ احمد ٣٢٤/٢.

[2] ـ فتح الباري ٩/١٣.

بەوە)) [1]، خراپترین ڕۆڵی مەروان لەو ئاشوبە سیاسیانەدا ئەم چوار کاروبارەیە:

**یەکەمیان:** کاریگەری لەسەر خاوەنی دوو نورەکە عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت)، ڕۆڵی سەرەکی لەدەستبەسەراگرتنی بەنی ئومەیە بەسەر دەسەڵات و ساماندا لەسەردەمی ئەودا هەبووە، بەتایبەت کەعوسمان چووبوویە تەمەن و، بەهۆی لاوازی سروشتی کەئیبن تەیمیە قسەی لەسەر کردووەو ((نەرمی لەمامەڵەدا)) کەئیبن حەجەر قسەی لەسەر کردووە، ئیبن عبدالبر ئاماژەی بۆ ئەو کاریگەریە کردووە بەوەی وتوویەتی کەمەروان ((عوسمان کردیە نوسەرو هێنایە لای خۆی و دەستی بەسەردا گرت)) [2]، قسەکانی ئیبن عبدالبر تەواو گونجاوە لەگەڵ ئەو ئاگادارکردنەوەی ئیبن تەیمیە کەخاوەن دوو نورەکە (خوا لێی ڕازی بێت) لەسەردەمی خەلافەتیدا چووبووە تەمەنەوەو، تەواو کارەکان لەدەستیدا نەمابوو، ئیبن تەیمیە دەڵێت: ((عوسمانیش (خوا لێی ڕازی بێت) چووبووە تەمەنەوە، کاری وا دەکرا ئەو لێی بێئاگابوو)) [3].

**دووەمیشیان:** ڕۆڵی لەو ئاشوبەدا هەبووە کەبووە هۆی کوژرانی عوسمان و لەشەڕی (جمل)یشدا، زەهەبی دەڵێت: (( ئەو (مەروان) ئامۆزای عوسمان بوو، ئەنگوستیلەی مۆرەکەی لابوو، ناپاکی لێ کرد، بەهۆیەوە هێنانیە سەر عوسمان، پاشان ئەو لێی دەرچوو، لەگەڵ تەڵحەو زوبیردا چوون بۆ ئەوەی داوای خوێنی عوسمان بکەن، لەڕۆژی (جمل)دا تەڵحەی کوشت و خۆی بۆی

[1] ـ فتح الباري ١١/١٣.
[2] ـ ابن عبدالبر: الاستيعاب ١٣٨٨/٣.
[3] ـ منهاج السنة ٢٤٨/٦.

دەرچوو –نەک رزگار کرابێت- پاشان بۆ چەندجارێک بووە والی مەدینە لەسەردەمی معاویەدا)) [1]. ئەوکەسەی لەو قۆناغە مێژووییە بەوردییەوە بکۆڵێتەوە، بەچاوی ڕووداوەکان نەک گریمانەی پاساو پێدەر، ئەوا دەبینێت کەرۆڵی مەروان لەئاشوبەکەدا خراپتر بووە لەرۆڵی هەرکەسێکی میژوویی تر و، دەڵێم: ((هەرکەسێکی مێژوویی تر)) چونکە من عبداللە کوری سەبەئی کەبۆچوونی جیاواز لەبوونی مێژوویی هەیە ناخەمە ئەم گشتاندنەوە، چونکە بەهێزترینی ئەوەی لەسەر رۆڵی ئیبن سەبەء لەبەردەستماندا بێت بریتییە لەگێڕانەوەی سەیف کوڕی عومەری تەمیمی وئیبن حەجەر وتوویەتی: ((سەنەدەکەی ڕاست نیە)) [2].

**سێیەمیان:** کوشتنی تەڵحەی کوڕی عبیداللە لەرۆژی (جمل)دا بەناڕەوا، لەکاتیکدا تەڵحە یەکێکە لەپێشینەکان و، لەدە مژدەی بەهەشت پێدراوەکەو لەگەورە هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە (صلی اله علیه وسلم)، بینیمان کەمەروان لەنێو سوپاکەیدا چۆن ناپاکی بەرانبەر کرد، لەکاتێکدا لەگەڵیدا بەناوی داواکردنەوەی خوێنی عوسمانەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەرچووبوو، زەهەبی قسەی لەسەر چیرۆکی کوژرانی تەڵحە لەلایەن مەروانەوە کردووەو وتوویەتی: ((وتم: بکوژی تەڵحە لەگوناهدا وەک بکوژی عەلی وایە)) [3]، ئەبێت ئەوە چەندە قێزەون بێت.

**چوارەمیان:** دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات بەخوێنڕێژی وهێز پاش ئەوەی هەموو ناوچە ئیسلامیەکان بەیعەتیاندا بە عبداللە کوڕی زوبیر وەک خەلیفەی شەرعی موسڵمانان، پاش بەیعەتپێدانی

---

[1] ـ سیر أعلام النبوة ٤٧٧/٣.

[2] ـ ابن حجر: لسان المیزان ٢٨٩/٣.

[3] ـ سیر أعلام النبلاء ٣٦/١.

ئیبن زوبیر، ((کاری بەنی ئومەیە لاواز بوو خەریکبوو تیابچێت)) [١]،
ئیبن حەجەر دەڵێت: ((زۆربەی ناوچەکان بەیعەتیان دابوو بەعبدالله کوڕی زوبیرو، دەسەڵاتی حیجازو یەمەن و میسرو عێراق و هەموو رۆژهەلات و تێکڕای شام هەتا دیمەشق هاتنە پاڵی، جگە لەبەنی ئومەیەو ئەوانەی ویستیان وەک ئەوان بوون و، لەفەڵەستین بوون)) [٢].

کوژرانی ئیبن زوبیر تەنها بەهۆی ئەوەوە دزێو نیە کە ((بەڕۆژووی شەونوێژکار بووەو، چەندین کاتژمێر لەپەرستشدا بووەو، پاڵەوانێکی بوێر بووە)) [٣]، بەڵکو بەهۆی ئەوەوە بووە مەروان بەوەستانی لەدژی ئیبن زوبیر کۆتا ئومێدی موسڵمانانی بۆ گەڕانەوە بۆ سەر ڕێبازی خەلافەتی ڕاشیدین لەناوبرد.

ئیبن عمادی حەنبەلی دەڵێت: ((ئیبن عبدالبرو زەهەبی وجگە لەوان باسی شەڕەکانی مەروانیان کردووە، بەوەی یەکەم کەس بووە بەبێگومان هێزی موسڵمانانی بەش کردووەو، نوعمانی کوڕی بەشیری کوشتووە کەیەکەم لەدایکبووە ئەنصاریەکان بووە لەئیسلامداو، لەدژی ئیبن زوبیر دەرچووە پاش ئەوەی بەیعەتی گوێڕایەڵبوونی پێداو، لەرۆژی (جمل)یشدا تەلحەی کوڕی زوبیری کوشت)) [٤].

ئێمە ناڵێین کەبەتەنها مەروان هۆکار بووە لەتێکدانی پایەکانی خەلافەتی ڕاشیدیندا، بەڵکو ئەوەی ئیبن تەیمیە وتوویەتی دەیڵێینەوە: ((کوژرانی عوسمان و ئاشوبەکە تەنها مەروان هۆکاری

---

[1] ـ ابن العماد: شذرات الذهب ٢٨٧/١.
[2] ـ فتح الباري ١٩٥/١٣.
[3] ـ ابن العماد: شذرات الذهب ٣٠٨/١.
[4] ـ ابن العماد: شذرات الذهب ٢٧٩/١.

نـەبـووە، بـەڵکـو چـەنـدین کاروبـاری هـەمـەجـۆر کۆبووبوونـەوە کـەیـەکێـک لـەوانـە خراپـی مـەروان بـووە)) [1]، بـەڵام ئـەو کاروبارانـە ئاسـان نـەبـوون، بـەڵکـو ئـەو کـەسـە لـەمـەترسـیان تێـدەگـات کـە بەبێلایەنیەوە لەو قۆناغە مێژووییەی کۆڵیبێتەوە، نەک بەمـەنهـەجی شیعەگەری سوننی یاخود شیعەگەری شیعە.

**نمونـەی دووەم:** یـەزیـدی کـوڕی معاویـە، ئیـبن عـەرەبـی کـاتێ بـەرگـری لـەیـەزیـدی کـوڕی معاویـە دەکـات دەڵێـت: ((ئـەوەش ئەحمەدی کوڕی حەنبەل-بەو خۆگری و پایە مەزنیەیەوە لـەئـاین و خۆپارێزیدا هەیەتی- لـە((کتـاب الزهـد))دا لـەبـارەی یـەزیـدی کـوڕی معاویەوە نووسیویەتی کەلەوتارەکانیدا دەیووت: ((ئەگەر یـەکێکتـان نەخۆش کەوت و شفای بۆ هات و خـەریک بـوو چـاک دەبوویـەوە، باسـەیـری باشـترین کـردەوەی خـۆی بکـات و لـەسـەری بـەردەوام بێت، سەیری خراپترین کردەوەی خۆی بکات و وازی لێ بهێنێت)).

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر مەزنی پلەو پایەی تا بیخاتە ناو کۆمەڵی دونیـا نـەویـستان لـەهـاوەڵان و شـوێنکەوتـووان کـەخـەڵکـی دەسـت بەئاکارەکانیانەوە دەگرن و لەئامۆژگارییەکانیان سوود وەردەگـرن، چی هەیە لـەوە باشـتر! بیخاتـە نـاو کۆمـەڵی هـاوەڵان پـێش ئـەوەی بچێتە نێو شوێنکەوتووان)) [2].

---

[1] ـ منهاج السنة ٢٤٨/٦.

[2] ـ العواصم ص٢٤٥-٢٤٦.

**لەم قسانەدا سێ هەڵە هەیە:**

**هەڵەی یەکەم:** ئیبن عەرەبی یەزیدی کوری معاویەی کوڕی ئەبو سوفیانی لەگەل یەزیدی کوڕی معاویەی نەخەعیدا لێ تێکەڵاو بووە، کەئەمەیان خواپەرستێکی دونیا نەویست بووەو زۆرێک لەپێشەوایان وتەکانیان لەبواری خۆپارێزی و دونیا نەویستیدا گێڕاوەتەوە، ئیبن حەجەر لەبارەی ژیانییەوە وتوویەتی: ((یەزیدی کوڕی معاویەی نەخەعی کوفی خواپەرست، ئیبن ئەبی خیسەمە باسی کردووە کەکەسێکی خواپەرستی کەم وێنە بووە)) [١]، ئیبن حبانیش وتوویەتی: ((یەزیدی کوری معاویەی نەخەعی، لەئیبن مەسعودەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، خەڵکی کوفە بووە، خەلکەکەی فەرموودەیان لێیەوە گێڕاوەتەوە، لەوڵاتی فارس لەکاتی غەزادا کوژراوە)) [٢]، هەروەک بوخاری و ئیبن ئەبی حاتەم باسی چیرۆکی شەهیدبوونیان لەوڵاتی فارس کردووە[٣].

**هەڵەی دووەم:** ئەم بۆچوونە سەبارەت بە یەزید کەداویەتە پاڵ پێشەوا ئەحمەد زۆر لەڕاستیەوە دوورە، چونکە گومانی تێدا نیە کەپێشەوا ئەحمەد یەزید وا دانانێت(( لەکۆمەڵی دونیانەویستانی لەهاوەڵان و شوێنکەوتووان بێت کەشوینی ئاکارەکانیان دەکەون و لەئامۆژگارییەکانیان سوود وەردەگیرێت)). لەپێشەوا ئەحمەدەوە کەسانێک کەزیاتر ئاگادارترن لەفیقهی ئەو بۆچوونێکیان گێڕاوەتەوە سەبارەت بەیەزید کەتەواو پێچەوانەی ئەمەیە: ((صلح کوڕی ئەحمەد (ئیبن حەنبەل) دەڵێت: بەباوکمم وت: کەسانێک دەڵێن یەزیدیان خۆش دەوێت، وتی: کوڕم، ئایا کەسێک باوەڕی

[1] ـ تهذيب التهذيب ٣١٥/١١.

[2] ـ ابن حبان: الثقات ٥٤٥/٥.

[3] ـ البخاري: التاريخ الكبير ٣٥٥/٨و ابن ابى حاتم: التعديل والتجريح ٢٨٦/٩.

بەخواو رۆژی قیامەت بێت یەزیدی خۆش دەوێت؟ وتم: بابە، ئەی بۆ نەفرەتی لێ ناکەیت؟ وتی: کوڕم، کەی بینیووتە باوکت نەفرەت لەکەس بکات؟))[1].

بەهۆی جەورو ستەمکاریەوە پێشەوا ئەحمەد ئەوەی ڕەت کردۆتەوە کەفەرموودە لەیەزیدەوە بگیڕێتەوە: ئیبن جەوزی وتوویەتی: ((یەزیدی کوری معاویە ئیسنادی فەرموودەکەی کردووەو، لەباوکیەوەو ئەویش لەپێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) گێڕاویەتیەوە، ئیسنادەکەی ئێمە بەئەو نەپچڕاو (متصل)ە، بەڵام پێشەوا ئەحمەد پرسیار دەکات: ئایا فەرموودە لەیەزیدەوە دەگێڕدرێتەوە؟ وتی: نەخێر، ڕێزی تیدا نیە (ولا کرامة)، لەبەر ئەوە ڕێگەمان بەخۆمان نەدا سەنەدی بدەینە پاڵ))[2]، ئیبن تەیمیە ئەوەی بۆ زیاد کردووە: (((پێشەوا ئەحمەد) وتی: نەخێر، ڕێزی تیدا نیە، ئایا هەر ئەو نەبوو ئەوەی بەسەر خەڵکی مەدینە هێنا؟))[3]، هەریەک لەزەهەبی و ئیبن حەجەر لەبارەی یەزیدەوە وتوویانە: ((دادپەروەریەکەی تانەلێدراوەو، لەو کەسانە نەبووە کەفەرموودەی لێوە بگێڕنەوەو، ئەحمەدی کوڕی جەنبەلیش وتوویەتی: ((نابێت فەرموودەی لێوە بگێڕدرێتەوە)) [4]، ((مهنا دەڵێت: لەبارەی یەزیدی کوڕی معاویەوە پرسیار لەئەحمەدی کوڕی حەنبەل کرا، وتی: ئەوەی بەسەر شاری مەدینەیدا هێنا هێنای، وتم: باشەی چی بەسەر هێنا؟ وتی: تالانی کرد، وتم: باشە فەرموودەی لێوە

---

[1] ـ مجموع الفتاوی ٤/٤٨٣و بڕوانە هەمان واتا لە (منهاج السنة)دا: ٤/٥٧٣.

[2] ـ ابن الجوزي: المنتظم ٥/٣٢٢و بەراوردی بکە لەگەڵ ئیبن تەیمیە: مجموع الفتاوی ٤/٤٨٣.

[3] ـ منهاج السنة ٤/٥٧٥.

[4] ـ الذهبي: میزان الاعتدال فی نقد الرجال ٧/٢٦٢و ابن حجر: لسان المیزان ٦/٢٩٤.

دەگێڕنەوە؟ وتی: نابێ فەرمووده لەوەوە باس بکرێت و، بۆ کەس نیە فەرمووده لێیەوە بنووسێتەوە)) [١].

**هەڵەی سێیەم:** ئەو قسەیەیەتی ((ئەمەش خستویەتیە نا کۆمەڵی هاوەڵان، پێش ئەوەی بچێتە سەر باسی شوێنکەوتووان)) ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ورد نەبوونی لەبواری مێژوو و پیاوناسیدا، چونکە چۆن پێشەوا ئەحمەد –ئەو لەکەسە بەئاگاکانە لەژیانی هاوەڵان و پیاوناسیدا- چۆن کەسێک کەبەدەیان ساڵ پاش وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەدایکبووە دەیخاتە نێو کۆمەڵی هاوەڵان؟!؟ ئیبن حەجەر سەبارەت بەیەزید دەڵێت: ((لەسەردەمی جێنشینی عوسماندا لەدایکبووە، ئەمەش ئەوە پوچەڵ دەکاتەوە کەبانگەشەی لەدایکبوونی لەسەردەمی پێغەمبەردا کردووە)) [٢]، ربعی دەڵێت: ((یەزیدی کوڕی معاویە لەساڵی بیست شەشدا لەدایکبووە)) [٣].

هەرچەندە ئەهلی سوننە رقیان لەوەیە کەسێک بەدیاریکراوی نەفرەتی لێ بکرێت، هەروەک لەڕێسای دەیەمدا بینیمان، هەندێکیان –لەنێویشیاندا پێشەوا ئەحمەد لەیەکێک لەدوو گێڕانەوەدا لێیەوە- بۆچوونیان وابووە کەهیچی تێدا نیە ئەگەر نەفرەت لەیەزیدی کوڕی معاویە بکرێت، ئیبن کەسیر دەڵێت: ((ئەوە گێڕانەوەیەکە لەئەحمەدی کوڕی حەنبەل کەخەلال و ئەبوبەکری کوڕی عبدالعزیز و قازی ئەبو یەعلی و کوڕەکەی قازی ئەبو حەسەن

---

[1] ـ ابن مفلح: المقصد الارشد فی ذکر أصحاب الامام أحمد ٤٤/٣.
[2] ـ ابن حجر: لسان المیزان ٢٩٣/٦.
[3] ـ الربعي: تاریخ مولد العلماء ووفیاتهم ١١٢/١.

هەڵیانبژاردووەو، ئەبو فەرەجی بن جەوزی لەدانراوێکی تەنیادا پشتگیری ئەوەی کردووەو نەفرەت لێکردنی ڕێگە پێداوە)) [١].

لەو کەسانەی تریش کەباسی نەفرەت لێکردنیان کردووە، تەفتازانی: ((تەفتازانی دەڵێت: ئێمە لەسەر خودی خۆی ناوەستین، بەڵکو لەسەر کوفرو ئیمانی قسە دەکەین، نەفرەتی خوای گەورە لەخۆی و پشتیوانانی و یارمەتیدارانی بێت)) [٢]. لەو کەسانەش کەئەم ئاراستەیان هەبووە شەرعزانی شافعی ((کیا هراسی)) [٣] ((کیا هراسی لەبارەیەوە (لەبارەی یەزید) پرسیاری لێکرا، لەمبارەیەوە بەشێکی درێژی سەبارەت بەسەرشۆڕییەکانی باسکردووە تا کاغەزەکە تەواو بووە، پاشان وتویەتی: ئەگەر کاغەزی سپی ترم بدرێتێ ئەوا زیاترم لەسەر سەرشۆڕیەکانی ئەو پیاوە دەنووسی، غەزالی ئاماژەی بەهەڵوەستە لەبارەیەوەو، خۆپاراستن لەنەفرت لێکردنی دەکات، بەڵام بەقێزەن سەیری کردەوەکانی کردووە)) [٤]لەمەشدا وانەیەک بۆ شوینکەوتوانی قوتابخانەی ((شیعەگەری سوننی)) هاوچەرخ هەیە کەبەخۆپاراستن لەنەفرەت لێکردنی ناوەستن، بەڵکو پاساو بەکردەوەکانی دەدەن، وەک دواتر ڕوونی دەکەینەوە.

بەڵگەی ئەوانەی ڕێگەیان بەنەفرت لێکردنی یەزید داوە ئەوەیە کەیەزید لەمیانی مانابەخشی زۆر فەرموودەدا نەفرەت لێکردنی هەرکەس هاتووە کەئازاری خەڵکی مەدینە بدات، لەوانە ئەم

---

[1] ـ ابن كثير: البدايةو النهاية ٢٢٣/٨و بەراوردی بکە لەگەڵ (منهاج السنه)دا ٥٧٤/٤و ئیبن تەیمیە وای دەبینیت کەئەم گێڕانەوەیە لەپێشەوا ئەحمەدەوە راست نیە.

[2] ـ ابن العماد: شذرات الذهب ٢٧٧/١-٢٧٨.

[3] ـ مجموع الفتاوى ٤٨٥/٤.

[4] ـ ابن العماد: شذرات الذهب ٢٧٨/١.

فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم): ((من أخاف أهل المدينة ظلما أخافه الله، وعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين، لايقبل الله منه يوم القيامة صرفا ولا عدلا)) [1]، واتە: هەرکەس بەستەمکاری خەڵکی مەدینە بترسێنێت ئەوا خوا دەیترسێنێت و، نەفرەتی خوای گەورەو فریشتەکانی و هەموو خەڵکی لێیە، لەرۆژی قیامەتدا خوای گەورە کارو کردەوەیەکی لێ وەرناگرێت))، هەروەها فەرموویەتی: ((اللهم من ظلم أهل المدينة وأخافهم فاخفه، وعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين لايقبل منه صرف ولا عدل)) [2]، واتە: (خوایە هەرکەس ستەم لەخەڵکی مەدینە دەکات و دەیانترسێنێت بیترسێنەو، نەفرەتی خوداو فریشتەکان و هەموو خەڵکی لێ بێت و، هیچ کارو کردەوەیەکی لێ وەرناگیرێت))، لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە: ((من أخاف أهل المدينه فقد أخاف ما بين جنبى)) [3]، واتە: (هەرکەس خەڵکی مەدینە بترسێنیت ئەوا دڵی منی ترساندووە)، هەروەها فەرموویەتی: ((اللهم اكفهم من دهمهم ببأس-يعنى أهل المدينة- ولايريدها أحد بسوء الا أذابه الله كما يذوب الملح فى الماء)) [4]، واتە: (خوایە هەرکەس بەهێز دای بەسەریاندا –مەبەستی خەڵکی مەدینەیە- بیانپارێزەو کەس نیەتی

---

[1] ـ أحمد ٥٥/٤و ابن حبان ٥٥/٩ وابن ابي شيبة ٤٠٦/٦و عبدالرزاق ٢٦٤/٩و سەنەدەکەی صەحیە، بڕوانە: سير أعلام النبلاء ٣٢٤/٣.

[2] ـ الهيثمي: مجمع الزوائد ٣٠٦/٣و وتوویەتی: ئەحمەد گێڕاویەتیەوەو پیاوەکانی پیاوی متمانەپێکراون.

[3] ـ الهيثمي: مجمع الزوائد ٣٠٦/٣و دەڵێت: ئەحمەد گێڕاویەتیەوەو گێڕەرەوەکانی گێڕەرەوەی متمانەپێکراون.

[4] ـ الهيثمي: مجمع الزوائد ٣٠٧/٣و دەڵێت: لەصەحیحەکەدا بەشێکی کۆتاییەکەی، بەزاز گێڕاویەتیەوەو سەنەدەکەی صەحیحە..

خراپەی بەرانبەریان ببێت ئەوا خوای گەورە هەروەک چۆن خوێ لەناو ئاودا دەتوێنیتەوە ئاوا لەناوی دەبات).

گومانی تێدا نیە کەیزید لەشەڕی بەناوبانگی (الحرة)دا پەلاماری شاری مەدینەی داو سەرومالّی حەلاڵکردن، ئیبن حەجەر وتوویەتی: ((مسلمی کوڕی عوقبەی مری نارد بۆ سەریاین و، فەرمانی پێ کرد کەسێ ڕۆژ سەرومالّی مەدینەی بۆ حەلاڵەو، بەیعەتیان لێ وەربگرێت کەئەوان کۆیلەو خزمەتکاری یەزیدن، کەئەوێی تەواو کرد ئەمجا بچێت بۆ مەککە بەمەبەستی شەڕکردن لەدژی زوبیر، ئیتر ئەوەبوو مسلم (کوڕی عوقبە) ئەو کارە قێزەونانەی تێدا ئەنجامداو، زۆرێک لەهاوەڵان و منالّەکانیان و گەورە شوینکەوتوانی تێدا کوشت و، کێشەکەی تەواو ئابڕوبەرانە کرد، پاشان ڕوویکردە مەککەو، پێش ئەوەی بگاتە ئەوێ خوای گەورە بردیەوەو، حەصیری کوڕی نمیری سکونی کرایە سەرکردەی سوپاکە، گەمارۆی ئیبن زوبیریان داو، مەنجەنیقیان گرتە کەعبەو، ئەوەش بووە هۆی تێکچوونی پایەکانی و تێکدرانی بیناکەی، پاشان سوتاو، لەکاتی ئەو کردەوە قێزەونانەیاندا هەوالّی لەناوچوونی یەزیدی کوڕی معاویەیان پێگەیشت، ئەوە بوو گەڕانەوەو خوای گەورە موسڵمانانی لەشەڕ پاراست)) [1]، ئیبن تەیمیە دەڵێت: (سەربازەکانی سێ ڕۆژ لەمەدینە خەریکی کوشتن و تالانکردن و، ئەتکردنی ناموس بوون کەحەرامکراوە، پاشان سوپایەکی نارد بۆ مەککەی پیرۆز، ئابلۆقەی مەککەیان داو،

---

[1] ـ ابن حجر: تهذيب التهذيب ٣١٦/١١.

لەکاتێکدا مەککە ئابڵۆقەدرابوو یەزید مرد، ئەمەش لەو ستەم ودەستدرێژیانەیە کەبەفەرمانی ئەو ئەنجامدراون)) [١].

ئەو کەسانەی کەڕقیان لەنەفرت کردن لەیزید بووە ئەم کارەیان بەهۆی بەگەورە سەیرکردنی یان ڕێز لێگرتنیەوە نەبووە، بەڵکو لەترسی کرانەوەی دەرگای نەفرەتکردن لەمعاویەو جگە لەویش بووە لەوانەی هاوەڵێتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یان کردووە یاخود بینیویانە، ئیبن تەیمیە بنچینەی بابەتەکە ڕوون دەکاتەوە کەچۆن زیادەڕەوی تیدا کراوە: ((کەسانێک هەبوون نەفرەتیان لەیەزیدی کوڕی معاویە دەکرد، لەوانەیە مەبەستیان لەوە نەفرەتکردن لەکەسانی تریش بێت، زۆربەی ئەهلی عیلم رقیان لەوە بوو بەدیاریکراوی نەفرەت لەکەسێک بکرێت، کەسانیک کەلەسەر ئەو ڕێبازە بوون گوێیان لەوە بوو وای بۆچوون کەیەزید لەگەورە پیاوچاکان و پێشەوایانی ڕێنماییکار بووە)) [٢]، بەهەمان شێوەی قسەکەی ئیبن کەسیر کەئەهلی سوننە ڕقیان لەوە بووە نەفرەت لەیەزید بکرێت ((تا نەفرەت لێکردنەکەی نەکرێتە هۆیەک بۆ نەفرەت لێکردنی باوکی یان یەکێک لەهاوەڵان)) [٣].

بەڵام شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە پێی وایە کەنەفرەت لێکردنی یەزید ((لەو بابەتانەیە کەئیجتیهادی تیدا دەکرێت)) بەڵام وای پێباشە نەفرەت نەکرێت، ئەمەش وەک ئەوەی موسڵمان زمانی لەخراپەکاری پاک ڕابگرێت و، بۆ داخستنی دەرگایەک لەدەرگاکانی خراپەکاری، جیاوازی نێوان وازهێنان لەنەفرتکردن لەیەزید بۆ پاک ڕاگرتنی زمان لەوتنی خراپەو داخستنی دەرگای خراپەکاری چەند

[1] ـ مجموع الفتاوى ٤١٢/٣.

[2] ـ ابن تيمية: مجموع الفتاوى ٤٠٨/٣.

[3] ـ ابن كثير: البداية والنهاية ٢٢٣/٨.

جیاوازییەکی مەزنی هەیە لەگەڵ ئەوەی واز لەنەفرت لێکردنی بهێنرێت چونکە یەزید لە((کۆمەڵی دونیانەویستانی هاوەڵان وشوێنکەوتووانە کەقسەکانیان ڕێنمایکارەو پەند لەئامۆژگارییەکانیان وەردەگیرێت)) بەپێی دەربڕینەکەی ئیبن عەرەبی!!

لەگەرمەی بەرگریکردنی تا مردن لەیەزید ئیبن عەرەبی سەبارەت بەحسینی کوڕی عەلی (خوا لێیان ڕازی بێت) دەڵێت: ((بەهۆی تەئویلکردنەوە خەڵک لەدژی دەرچوون و، لەبەر ئەوە لەگەڵی جەنگان کەلەباپیرەیەوە گێڕابوویانەوە کەپێغەمبەرەو هەواڵی تێکچوون بارودۆخ و، هۆشداریدەر لەچوونە ناو ئاشوبی دابوو، فەرموودەکانیشی لەم بوارەدا زۆرە، لەوانە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویت: ((انه ستكون هنات وهنات، فمن أراد أن يفرق أمر هذه الامة وهي جميع، فاضربه بالسيف كائنا من كان))، واتە: (خراپەو خراپەکاری ڕوودەدات، جا هەرکەس ویستی ئەم ئومەتە لێک بترازێنیت کەکۆیەو، ئەوا بەشمشێر لێی بدەن ئیتر ئەوکەسە هەرکێ بوو)، خەڵکیش بەمەو هاوشێوەی ئەمە هاتن (بۆ شەڕکردن لەدژی حسین) )) [1]. بەمجۆرە بینوتە کە قەڵەمێک بکوژانی حسین و ئەنجامدەرانی ئەو قەسابخانەیەی کەتێیدا شازدەکەس لەخانەوادەی پێغەمبەر کوژران کەزۆربەیان منداڵی بچوک بوون، ئەو کەسانە دەگۆڕێن بۆ موجاهید، کە وەک جێبەجیکردنی ڕاسپاردەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاتبوون بۆ شەڕکردن لەدژی ئەو زیادەڕەوکارانەی کەلەریز دەرچوون و ئومەت پەرتەوازە دەکەن!؟! ئەمە پاساوهێنانەوەیەکە

---

[1] ـ العواصم ص٢٤٤-٢٤٥.

شک نابەین لەنێو زانایانی ئەهلی سوننەدا کەس پێش ئیبن عەرەبی شتی وای وتبێت یان وەک ئەوە بڵێت، لەبەر ئەوەیە ئیبن خەلدون وێڕای سروشتە پاساو هێنەرەوەکەی لەشیکاری مێژوویی ئیسلامیدا بێزاری بەرانبەر دەربڕیووەو، دەڵێت: ((قازی ئەبوبەکری ئیبن عەرەبی لەمەدا بەهەڵەدا چووە کەلەو کتێبەیدا ناوی ناوە ((العواصم من القواصم)) شتیکی وتووە کەواتاکەی ئەمە دەگەیەنێت: ((حسین بەپێی شەرعی باپیری کوژراوە)). ئەمە هەڵەیەکەو بەهۆی بێئاگابوونی لەمەرجەکانی پێشەوای دادپەروەرە تێی کەوتووە، کێ هەبووە لەحسین دادپەروەر تر لەسەردەمەکەیدا لەپێشەوایەتی و دادپەروەری لەشەڕکردن لەگەڵ ئەهلی بۆچوونەکاندا؟))[1]، ئیبن عەرەبی لێرەدا دەکەوێتە دژیەکیەکی زۆر سەیرەوە، پێش چەند لاپەڕەیەک لەوە باسی ئەوەی کردووە کەدەرچوونی حسین ((تورەبوونەکەی لەسەر ئاین و سەرخستنی حەق بوو)) [2]. پاشان ئەوەتا دەیکاتە دەرچوویەک کەیەکڕیزی موسڵمانان تێک دەدات و، قسەی موسڵمان لەرۆژێک لەرۆژاندا لەسەر یەزید کۆ بووە!!

لەکتێبەکەدا هەڵەو سەرکێشی تری تێدایە کەناتوانین زیاتر مشتومڕ لەسەریان بکەین، تا ئەم لێکۆڵینەوەیە لەمەبەستەکەی خۆی دەرنەچێت، خوای گەورە پشتیوانی هەموو چاکەیەکە.

---

[1] ـ مقدمة ابن خلدون ص٢١٧.

[2] ـ العواصم ص٢٣٧.

### ئیبن عەرەبی وەك موتەكلیم و قازی

بۆ ئەوەی بەویژدانین بین بەرانبەر ئین عەرەبی وشەیەک ماوەتەوە هەردەبێت بیلێین، ئەویش بالادەستی ڕێبازی زانایانی کەلام و جەدەلە بەسەر کتێبەکەی ئیبن عەرەبیدا، ئەوەش ڕێبازێکە بەباشی مشتومڕ دەکات وبەڕەواو بەناڕەوا هەوڵی شکانی بەرانبەر دەدات، بەڵام لایەنێکی تری کەسایەتی ئیبن عەرەبی هەیە لەزیادەڕەوەی ئەو ڕێبازەی کەم کردۆتەوە.

پێشتر باسی ئەوەمان کردبوو کەئیبن عەرەبی قازی بووە، بەڵکو بەناوی قازیەوە بەناوبانگ بووە، وادیارە پیشەی قازێتی سوودی بەئیبن عەرەبی گەیاندووە لەنووسینەکانیدا سەبارەت بەناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت)، ئەوەتانێ کاتێ دەبینی ئیبن عەرەبی بەلۆژیکی دادگایکردن قسە دەکات هێندە وردەکاری وبەدواداچوون دەبینیت کەلەقسەکانی تریدا بەدی ناکەیت، لەنمونەی ئەمەش:

**یەکەم:** وەڵامدانەوەی ئەو کەسانەی پاساو دەدەنە هەڵویستی تەڵحەو زوبیر بەوەی کەلەسەرەتاوە بەیعەتیان داوە بەعەلی بەو مەرجەی تۆڵە لەبکوژانی عوسمان بکاتەوە، کاتێ دواتر ئەوەی نەکردووە مافی خۆیان بووە لەبەیعەتەکەیان بکشینەوە، ئیبن عەرەبی ئەو پاساو هێنانەوەی رەت کردۆتەوەو، وتوویەتی: ((ئەگەر بوترێت: بەیعەتیان لەسەر ئەوە پێداوە کەبکوژرانی عوسمان بکوژێتەوە، دەڵێین: ئەمە لەمەرجەکانی بەیعەت پێداندا دروست نیە، بەڵکو لەسەر ئەوە بەیعەتیان پێداوە کەبەحەق حوکم بکات، ئەویش ئەوەیە کاتێ خاوەن خوێن و، داواکراو ئامادە بکرێن و، سکاڵا بەرز بکریتەوەو، پرسیارو وەڵامیان لێ بکریت و، بەڵگە بخرێتە ڕوو و، فەرمان دەربکرێت، ئاوەها دەکرێتەوە نەک فشار

بخرێته سەری بەقسەیەکی ڕەها، یان کردارێک کەلێکۆڵینەوەی لێ نەکراوە، یاخود بەبیستنی قسەیەک، ئەمانە لەئاینی ئیسلامدا دروست نین)) [١]، ئیبن عەرەبی لێرەدا بەزمانی کارەکەی خۆی قسە دەکات وەک قازی، نەک مشتومڕکاری هەڵچوو و، قسە بەیەک وتنی نێوان دوو کەس.

**دووەم:** هۆشداریدانی لەبارەی پابەند نەبوونی خەڵکی شام بەڕێساکانی شەریعەتەوە لەدادگایکردندا لەم قسەیەیدا: ((داواکاری خوێن دروست نیە حوکم بدات، تۆمەتی (داواکاری خوێن) واپێویست ناکات کەلەدژی دەربچێت، ئەگەر ئەوەی بۆ جیبەجێکرا(بەرانبەری) ئەگەرنا بێدەنگ دەبێت، چەند حەق هەیە کەخوای گەورە تێیدا حوکم دەکات و، خۆ ئەگەر ئاینی نەبوو ئەوا لەدژی دەردەچیت، ئەمەیان لەدونیادا پاساوێکی دەبێت)) [٢].

**سێیەم:** ڕوونکردنەوەی ئەوەی ئەگەر خەڵکی شام پابەندی ڕێکارە شەرعیەکانی دادگایکران بوونایەو، یارمەتی خەلیفەی موسڵمانانیان بدایە لەسەر خۆکۆکرنەوەو هێور کردنەوەی دەروونەکان وڕێکخستنەوەی ریزەکان.. ئەوکاتە دەبوو ((کاتەکە دەگونجا بۆ داواکردن و، شیاوتر بوو ڕەوشەکەو، ئاسانتر دەتوانرا بگەنە داواکراو)) [٣]، ئەگەر بەڕاستی تەنها داوای تۆڵەسەندنەوەی شەرعیان بۆ خەلیفەی شەهید دەکرد، چونکە دادگایکرانی پاک و تاوتوێی کارەکە وای لیکردووە کەدوو ڕەوتی تەواو لێک جیاوازی هەبێت.

---

[1] ـ العواصم ص١٥٠.
[2] ـ العواصم ص ١٦٨.
[3] ـ العواصم ص١٧٠.

**چوارەم:** هۆشداریدان سەبارەت بەکێشەیەک کەدواتر ئیبن تەیمیە هۆشداری لەبارەیەوە داوەو، بەخەیاڵی زۆر لەپینەوپەڕۆکارانی زۆربەی سەردەمەکاندا نەهاتووە، ئەویش بریتییە لەوەی کەمعاویە تەنها بەیەکلابوونەوەی کارەکە بۆی خۆی بێئاگا کردووە لەبابەتی بکوژانی عوسمان، بەجۆرێک وەک ئەوەی هەر لەسەر زەویدا نەبن، ئیبن عەرەبی دەڵێت: ((ئەوەی پەردە لەسەر ئەمە لادەدات ئەوەیە کەمعاویە کاتێ کارەکەی بۆ یەکلا بوویەوە نەیتوانی هیچ کەس لەبکوژانی عوسمان بکوژێتەوە بەحوکمدان نەبێت، مەگەر ئەوانەی لەجەنگی (تأویل)دا کوژران، یاخود فێڵ کرابێت لەوەی کەوتراوە، تا کارەکە گەیشتە سەردەمی حەجاج کەلەسەر تۆمەت خەڵک دەکوژرا نەک بەحەقیقەت.

دەرکەوت بۆتان ئەوانە (واتە خەڵکی شام) لەکاتی دەسەڵاتداری خۆیاندا ئەوەیان ئەنجام نەدەدا کەقوربانیان لەپێناوی داوا کردنیدا دەدا)) [1].

لەڕاستیدا قازی ئیبن عەرەبی لێرەدا راست بۆی چووەو پەنجەی لەسەر چارەسەرەکە داناوە، هەرچەند پینەوپەڕۆ بۆ خەڵکی شام بکەین و، وایدابنێین کەمەبەست و نیازیان باش بووە، ئەوا پابەند نەبوونیان بەڕێساکانی شەرع لەدادگایکراندا کارێکەو پینەوپەڕۆ هەڵناگرێت و، خۆ بێئاگاکردنیان لەبکوژانی عوسمان پاش ئەوەی دەسەڵاتیان کەوتە دەست جێی گومانە، ئەگەر کوشتنیان لەتوانادا بووبێت و لەپێناوی پاراستنی سەقامگیری دەسەڵاتیاندا وازیان لێ هینا بێت، ئەوا لەپێشترە بۆیان کەسەرزەنشتی عەلیان نەکردایە لەسەر واز لێهێنانی و، خۆ ئەگەر

---

[1] ـ العواصم ص١٧١.

کوشتنیشیان لەتوانادا نەبووبێت، ئەوا پاساوی عەلی لەمەدا ڕوونترو ئاشکرا تر بووە.

هەرچۆنێک بێت ئەوا ئەم بڕگانەی کتیبەکەی ئیبن عەرەبی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کاتێ بەلۆژیکی دادگا بیر دەکاتەوە کەماوەیەکی زۆری ژیانی کاری تێدا کردووە، ئەوا دەگاتە ئەنجامی نزیکتر لەلێکۆڵینەوەو دادپەروەری.

لەبەر ئەوە ئیبن عەرەبی قازی جیاوازە لەئیبن عەرەبی قسەکەر، وەک ئەوەی ئەم بڕگانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئیبن عەرەبی لەلێکۆڵینەوە (تحقیق)ەوە نزیکتر بووە لەلێکۆڵەرانی کتێبەکەی و ئەوانەی هەمان ئاراستەیان گرتووە لەنەوەکانی قوتابخانەی ((شیعەگەری سوننی)) هاوچەرخ.

## کۆتایی
## گەرانەوە بۆ سەرەتا

پاش ئەمە: لەسەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەیدا ئاماژەمان بۆ پەیوەندی نیوان ڕیشەداریی شەرعی (التأصیل الشرعی) و بەئاگایی مێژوویی (الوعي التاریخیٚ) کردو، لێرەدا ئەوە زیاد دەکەیهن کەتێڕوانینمان بۆ مێژوو کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر وێنا کردنمان بۆ بنەماو پابەندبوونما پێیەوە، پێچەوانەکەشی بەهەمان شێوە ڕاستە: چونکە ڕوونی بنەما لەمیشکدا یارمەتیدەرە بۆ بونیاتنانی تێڕوانینێکی هەڵسەنگاندنی بابەتیی بۆ ڕووداوە مێژووییەکان.

لەلاپەڕەکانی پێشوودا جیاوازی نیوان مەنهەجی ئیبن تەیمیەو لێکۆڵەرانی فەرموودەناسان لەگەل مەنهەجی ئیبن عەرەبی و قوتابیە هاوچەرخەکانی لەتیگەیشتنی مێژووی سەرەتای هاتنی ئیسلام وشرۆڤەی ناکۆکییە سیاسیەکانی نیوان هاوەڵان ڕوون دەبێتەوە، باسەیر بکەین چۆن ئەو جیاوازیە کاریگەری هەبووە لەتێڕوانینی هەریەک لەئیبن تەیمیەو ئیبن عەرەبیدا بۆ بنەمای سیاسی ئیسلامی، تەنها یەک نمونەش دەخەینە ڕوو ئەویش شەرعیەتی دەسەڵاتدارە، چونکە کرۆکی کیشەکەو شوینی نەخۆشیەکەیە لەشارستانیتی ئیسلامیدا، لەمەدا ئیبن عەرەبی هیچ سەنگێک بۆ بۆچوونی ئومەت لەهەڵبژاردنی سەرکردەکانیدا دانانێت، بەڵکو بۆ ئەوە چووە کە((یەکێک یاخود دووان خەلافەتی پیٚ دادەمەزرێت و تەواو دەبێت، ئەو کەسەی پاش ئەوە بەیعەت

دەدات ئەوا لەسەری پێویستەو، لەڕووی شەرعییەوە ناچارە ئەوە بکات!)) [١].

لەمەدا دەیەوێت راڤەی بەیعەت پێدانی ئەبوبەکر لەلایەن عومەرەوە لەشەوی سەقیفەداو جێگرتنەوەی عومەر لەرۆژی وەفاتی ئەبوبەکردا وا بخاتە روو کەئەو مانا چەوسێنەرە دەبەخشێت، بەڵام ئیبن تەیمیە سەردەمی ڕاشیدین لەوە بێبەری دەکات، بەڵکو ئەهلی سوننەش لەوە بێبەری دەکات کەقسەی وا بکەن و، دەڵێت: ((ئەمە قسەی پێشەوایانی ئەهلی سوننە نیە، با هەندێک لەئەهلی کەلام بڵێن: پێشەوایەتی بەبەیعەتپێدانی چوار کەسیش دادەمەزرێت، هەندێکیش وتوویانە: بەبەیعەتپێدانی دوو کەسیش دادەمەزرێت، هەندێکی تریش وتوویانە: بەبەیعەتپێدانی یەک کەسیش دادەمەزرێت، ئەمانە قسەی ئەهلی سوننە نین)) [٢]، وەک ئەوەی ئیبن تەیمیە ڕوونیدەکاتەوە کەبەیعەتپێدانی عومەر بەئەبوبەکرو جێگرتنەوەی عومەر بۆ ئەبوبەکر لەهەردوو حاڵەتەکەدا بەبێ پاڵاوتن (ترشیح) نەبووەو، دەڵێت: ((ئەگەر وا دانرا کەئەوان (واتە هاوەڵان) بەڵێنەکەی ئەبوبەکریان جێبەجێ نەکرد لەعومەردا ئەوا نەدەبووە پێشەوا... ئەگەر ئەبوبەکر عومەرو کۆمەڵێک بەیعەتیان پێداو هاوەڵانی تر ئامادەنەبوون بەیعەتی پێبدەن ئەوا تەنها بەوە نەدەبووە پێشەوا، بەڵکو بەبەیعەتپێدانی لەلایەن کۆمەڵی خەڵکەوە بووە بەپێشەوا...بەڵام گواستنەوەی

---

[1] ـ العواصم ص١٤٨.

[2] ـ منهاج السنة ٥٢٦/١-٥٢٧.

دەسـەڵات بـۆ عومـەر ئـەوا بـەبـەیعـەتپێدانی موسـڵمان بـۆی پـاش وەفاتی ئەبوبەکر بەوە بووە پێشەوا)) [1].

لەبەر ئـەوەی ئـەم نامـەیـە ڕیشـەدارکردنـی بنـەمـایی نیـە، بـەڵکو تەنها ڕێسا مەنهەجیـەکانـە بـۆ شـیکاری مێژوویـی، ئـەوا بـەو تـەنـها نمونـــەیـــە واز دەهێنـــین، ئـــەوە بـــەســـە بـــۆ گوزارشـــت لـــەوەی کەمـەنهـەجمـان لـەتێگـەیشتنی مێژووی سـەرەتـای هـاتنی ئیسلامدا کاریگەری زۆر قوڵی لەسەر تێگـەیشتنمان بـۆ بنـەمـا ئیسلامیەکـان دەبێت..

درێژەی ئەمەو جێبەجیکردنی ئەم ڕێسایانە لێدەگـەڕێم بـۆ دوو کتێبی ترم کەئەوانیش ((السنة السیاسیة))و ((الـشرعیة الـسیاسـیة)یـە کەداوای یارمەتی لەخوای گەورە دەکەین بۆ تەواو کردنیان و، ئـەو دوو کتێبـەمـان و تـەواوی کـارەکانمـان و قسـەکانمـان وا لـێ بکـات کەتەنها لـەبـەر خـوای گـەورەیـەو، ئـەم کـارەمـان لـێ قبـوڵ بکـات و بیکاتە مایەی سوود بۆ بەندە چاکەکانی، کـەچاویـان لـەوەیـە ژیـانی ئیسلامی بگەڕێتەوەو، بنـەمـاکـان شـەرع لـەگـەردو خـەوشـی مێژوو پاک بکرێتەوە.

سوپاس بۆ خودا کەتـەنهـا بـەنیعمـەتـەکانی ئـەو کـارە چاکـەکـان تەواو دەبن.

[1] ـ المنتقی من میزان الاعتدال ص٦٢-٦٤ کەکورتکراوەی زەهەبیە بۆ کتێبی (منهاج السنة).

# پاشکۆ

**تیبینیه مەنهەجیەکان لەسەر وەڵامەکانی دکتۆر منیر غضبان لەسەر ئەم کتیبە لەکتێبەکیدا:**

**(جولات نقدیة فی کتاب الخلافات السیاسیة بین الصحابة)**

**یەکەم:** دکتۆر منیر گێڕانەوەکەی تەبەری ڕاست کردۆتەوە کەسەیفی کوری عومەری تێدایە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنیت کەبەیعەتپێدانی عەلی بۆ ئەبوبەکر لەشەوی سەقیفەدا بووە (ل٢٩ و پەراوێزی ل ٣٠) هەروەها گێڕانەوەیەکی تری بۆ سەیف ڕاست کردۆتەوە (ل٧١) هەرچەندە کۆدەنگی فەرمووودەناسان لەسەر ئەوەیە کەسەیف لەگێڕانەوەی فەرموودەدا لاوازە، لەم کتیبەشماندا لەکاتی خستنەڕووی تیبینیەکانمان لەسەر کتێبی (العواصم من القواصم) قسەی ئەهلی جرح و تعدیلمان سەبارەت بەسەیف باس کرد.

زەهەبی دەڵیت: ((بەهاودەنگی وازلێهێنراوە)) (الذهبي: المغني فی الضعفاء ٢٩٢/١) ئیبن حەبانیش وتوویەتی: ((یروي الموضوعات عن الاثبات)) (ابن حبان: کتاب المجروحین ٣٤٥/١)و عقیلی وتوویەتی: ((ئەو لاوازە)) (العقیلي: الضعفاء ١٧٥/٢)و، ئیبن عەجمی دەڵێت: ((سەیف فەرموودەی دادەناو بەزەندیق بوون تۆمەتبار بوو)) (ابن العجمي: الکشف الحثیث ١٣١/١)و، نەسائی ودار قوتنی وتوویانە: ((لاوازە)) (ابن الجوزي: کتب الضعفاء والمتروکین ٣٥/٢)و، ئیبن ئەبی حاتەم وتوویەتی: ((فەرموودەی واز لێهینراوەو

فەرموودەی وەک فەرموودەی واقدی وایە)) (ابن ابي حاتم: الجرح والتعديل ٢٧٨/٤)و، ئەبو نەعیمی ئەصفەهانی دەڵێت: ((لەئایندارىدا تۆمەتبارە، دەڵێن زەندیقە، فەرموودەی کەوتووە، هیچ نیە)) (أبو نعيم الاصفهاني: كتاب الضعفاء ٩١/١). ئایا دەگونجێت گێڕانەوەیەکی هەردوو صەحیحەکە بۆ بەرژەوەندی گێڕانەوەی سەیفی کوڕی عومەر واز لێ بهێنین کەئەو زانا پایە بەرزانە ئاوا قسەیان لەسەر کردووە؟! لەناجێگیریەکانی لۆژیکی دکتۆر منیر ئەوەیە دەگەڕێتەوەو جەخت دەکاتەوە کە((سەیف لاوازە، ناکۆکی لەمەدا نیە)) (ل١٥٥) ئەمە پاش ئەوەیە کەسەنەدی ئەو گێڕانەوەیەی ڕاست کردۆتەوە، پاشان لەکۆتایی کتێبەکەیدا (ل١٩٢) ڕاسپاردەی ئەوەیە کەگێڕانەوەکەی سەیف پشتی پێ ببەسترێت، جا ئەمە چ ناجێگیریەکە لەحوکمداندا!!

**دووەم:** دکتۆر منیر ژمارەیک فەرموودەی ڕاست کردۆتەوە بەبێ ئەوەی بیانگێڕێتەوە بۆ کەسانی پسپۆڕی فەرموودەناس (بۆ نمونە بڕوانە: پەراوێزی ل٣٢و٣٣)، بەڵام ڕاستکردنەوەکەی بۆ گێڕانەوەکەی سەیف و، ناجیگیریی لەحوکمدان لەسەر فەرموودەکان، هاندەر نین بۆ ئەوەی وەک موجتەهیدێک لەجرح و تعدیلدا پشتی پێ ببەسترێت، هەروەها دکتۆر منیر بانگەشەی بوونی ژمارەیەک ((گێڕانەوەی صەحیح و حەسن، یان صەحیحی قبوڵکراو کردووە، کەئاماژە بۆ بەیعەتدانی سەعد (سەعدی کوڕی عوبادە بەئەبوبەکر) دەکەن بەدەقی ڕاشکاو)). بەڵام ڕاسترینی ئەوەی کەدکتۆر منیر هیناویەتیەوە لە(ل٤١)دا بریتییە لەفەرموودەکەی ئەحمەد کەپچڕانی تێدایەو حومەیدی کوری عبدالرحمان لەصدیقەوە گیڕاویەتیەوەو، لەبارەی ئەم هەواڵە پچڕاوەوە لەڕێسای نۆیەمدا قسەمان کردو، ڕوونمان کردەوە

كه((وازانراوه كەحومەیری لەمناڵەكانی تابیعینەو، لەكاتی ژیانی ئەبوبەكرو بەیعەتی سەقیفەدا لەدایك نەبووە، بەڵكو لەدواینەكان وهاوەڵانی بەتەمەنەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، وەك ئەبوهورەیرەو ئەبی بەكرەو ئیبن عومەرو ئیبن عەباس، ئیبن حەجەر پچڕانی ئەم هەواڵەی ڕاگەیاندووە (فتح الباري ١١٤/١٣)و (الهيثمي: مجمع الزوائد ١٩١/٥)و، (احمد شاكر: مسند الامام أحمد ١٦٤/١ تحقيق أحمد شاكر)و، (الالباني)و جگە لەوانیش، بەڵام قسەی لێكۆڵەری ((منهاج السنة)): ((وصحح الالباني الحديث)) (منهاج السنة ٥٣٦/١ الهامش رقم ٤) ئەمە لەچوارچێوەی ئەوەی باسمان كرد لەویستی بەلای تەصحیحی لاوازدا كەپشتیوانی بۆچوونی نوسەرو بیروڕای بكات هەبووە، ئەگەرنا ئەوا ئەلبانی ئەصلی حەدیسەكەی ڕاست نەكردۆتەوە: ((قريش ولاة هذا الامر))، لەسەر بنەمای ڕێگاو شاهیدیەكانی ترو، وتوویەتی: ((فەرموودەكە شاهێدیەكەی لەفەرمودەكەی جابرداو، یەكێكی تری لەفەرموودەكەی ئەبوهورەیرەدا هەیەو، بەدەربڕینی: ((الناس تبع لقريش)) دێت)) (الالباني: سلسلة الاحاديث الصحيحة ١٤٦/٣) بەڵام گفتوگۆی نێوان سەعدو ئەبوبەكر –كەجێی ناكۆكییە لێرەدا- ئەلبانی ڕاستی نەكردۆتەوە، بەڵكو هاوبۆچوونی فەرموودەناسانی پێشوو بووەو، ڕایگەیاندووە كەپچڕاوەو وتوویەتی: ((گێڕەرەوەكانی متمانە پێكراون، بەڵام حومەید نەگەیشتووە بەئەبوبەكر وەك ئەوەی لە(المجمع)دا هاتووە)) (مجمع الزوائد) (سلسلة الاحاديث الصحيحة ١٤٦/٣ الحديث رقم ١١٥٦)، سەیر ئەوەیە دكتۆر منير هەمان هەڵەی لێكۆڵەری (منهاج)ی دووبارە كردۆتەوەو، پاش هێنانی ئەم قسانەی ئێمە: ((صححه الالباني)) نوسیویەتی و، ئەمەی بۆ زیاد كردووە ((أفضل الروايات الضعيفة التي رواها هشام وأبو مخنف)) (ل٥٩)

هەرچەندە من یەک پیتم لەهشامی کوڕی کلبی و ئەبی مخنف نەگوازتۆتەوە!!

**سێیەم:** دکتۆر منیر نکوڵی لەژمارەیەک فەرموودە کردووە کەئێمە سەبارەت بەقسەپێوتنی خەڵکی شام بەعەلی وشوێنکەوتووانی هیناومانەو، دەڵێت: ((ئەو سێ گێڕانەوەیەی کەهێناویانی صەحیح نین)) (ل٦٢)، من یەکەم گێڕانەوەی ناو ئەم کتێبەم بەمجۆرە هێناوە: (مسلم ١٧٨١/٤و الحاكم ١١٧/٣و النسائي ١٠٧/٥و البزاز ٣٢٤/٣و الترمذي ٦٣٨/٥ والالباني: صحيح سنن الترمذي–أبواب المناقب)، دووەمیشیان بەمشێوەیە: (مسلم ١٨٧٤/٤ والبيهقي ٤٤٦/٢)، سێیەمیش ئاوا هێناومە: (المقدسي: الاحاديث المختارة ٢٨٨/٣–٢٨٩و وقال محقق الكتاب: ((اسناده حسن)) وانظر مسند الشاشي ٢٤٧/١ وأحمد ١٨٨/١ وأبو يعلي ٢٥٩/٢ وانظر ايضا ابن ابي عاصم: السنة ٦١٩/٢ وسير أعلام النبلاء ١٠٤/١ وتهذيب الكمال ٥٠٤/١٦). سەیر ئەوەی دکتۆر منیر هیچ بەڵگەیەکی بۆ پشتیوانی ئەو رەتکردنەوەیەی نەهێناوە، بەڵکو شڵەژاو بووە تەنانەت لەشێوەی وەڵامدانەوەی ئەو گێڕانەوە جێگیرانەدا، پاش ئەوەی کاری خۆی یەکلا کردۆتەوە کەئەو سێ گێڕانەوەیە صەحیح نین، لەلاپەڕەکانی دواییدا (ل٦٤) هاتۆتەوەو وتوویەتی: ((بەڵام گێڕانەوەی دووەمیان لەسەر بۆچوونی ئەو صەحیحە...))!!و دەڵێت: ((گێڕانەوەی کۆتاییان کەصەحیح بوونەکەی نازانین...))!! جا ئایا بەڕێزیان دەیەوێت لێمان لەبەر ئەم قسە ناجێگیرانەی کەهیچ بەڵگەیەکی لەسەندی نەقڵ و، گونجانی لۆژیکی تێدا نیە واز لەقسەی ئەو زانا پایەبەرزانەی پسپۆڕ لەزانستی فەرموودەناسیدا بهێنین؟!

**چوارەم:** دکتۆر منیر دەنووسێت: ((جەختمان لەوە کردۆتەوە کەهاوەڵان بەشداری ئاشوبەکەیان نەکردووە))!! بەمجۆرە رەهاییە، هەرچەندە ئەمە پێچەوانەی موتەواتری بنبڕە، پێشتر لەڕێسای نۆیەمدا ناوی ژمارەیەک لەبەشداربووانی بەدرمان هێناوە -ئەمە جگە لەوانەی تر- کەبەشداریان لەئاشوبەکەدا کردووەو، لەوێدا نووسیبوومان: ((پێشەوا بوخاری لەوانە ناوی فضالەی کوڕی ئەبی فضالەی ئەنصاری هێناوەو، دەڵێت: ((فضالە لەگەڵ عەلیدا لەرۆژی (صفین)دا کوژرا، کەلەئەهلی بەدر بوو)) (البخاري: التاریخ الصغیر ٧٨/١)، هەروەها زەهەبی لەنیویاندا باسی کەعبی کوڕی عەمری ئەنصاری کردووەو، دەڵێت: (( لە(صفین)دا لەگەڵ عەلیدا بەشداری کردووەو، لەبەشداربووانی بەدر بووە کەمابوون)) (سیر أعلام النبلاء ٥٣٧/٢) ئیبن حەجەر باسی سابتی کوڕی عبید و ئوسەیدی کوڕی سەعلەبەو سەهلی کوڕی حنیف و ئەبا عەمری ئەنصاری و ئەبا هەیسەمی کوری تیهان، (بڕوانە: الاصابة ٣٩٢/١و ١٩٨/٣و ٨٣/٧و ٢٨٧/٧و ٤٤٩/٧)، هەروەک دەقەکان بەگشتی بەڵگەن لەسەر بوونی ژمارەیەک لەهاوەڵان لە(صفین)دا، وەک ئەوەی هەیسەمی لەچیرۆکێکی درێژدا هیناویەتی: ((عەماری کوڕی یاسر وەک ئاڵا بوو بۆ هاوەڵانی محەمەد (صلى الله عليه وسلم)، عەمار بچوایەتە هەر دۆڵێتک لەدۆڵەکانی (صفین) هاوەڵانی محەمەد (صلى الله عليه وسلم) بەشوێنیەوە بوون)) (هەیسەمی وتوویەتی: تەبەرانی و ئەحمەد بەکورتی گێڕاویانەتەوەو ئەبو یەعلی بەشێوەی تەبەرانی و بەزاز بەوتەی: ((عەمار لەدژی دەستە زیادەڕەوکارەکە دەجەنگێت)) بەتەنها لەعبداللە کوڕی عەمر گێڕاویەتیەوەو گێڕەرەوەکانی ئەحمەدو ئەبو یەعلی متمانەپێکراون).

**پێنجـەم:** دکتـۆر منیـر ورد نـەبـووە لـەگوازتنـەوەیـدا لـەمنـەوە، هێرشی کردۆتە سەر گێڕانەوە لەئەبی مخنف وئیبن کلبی و واقدی و جگـە لـەوان لـەفـەرمـوودە هـەڵبـەسـتـەران (وضـاعین) (ل٥٥و، ل١٩٢)گێڕانەوەی لێیانەوە هێناوە وەک گێڕانـەوەکـەی ئـەبی مخنف (ل٤٢) و وەڵامی داوەتەوە، تا ئەو سەرنجە بدات بەخوێنـەر کـەمـن لێیانمـەوە گوازتۆتـەوە، هـەرچـەنـدە مـن لـەهیچکـام لـەو درۆزانانـەم نەگوازتۆتـەوە، بـەڵکو گێڕانـەوەکـەی سـەیفی کـوڕی عومـەرم ڕەت کردۆتـەوە، کـەئـەو لـەناویانـدا لـەهـەموویـان متمانـەپێکراوترینیانـە، چونکە ئـەهلی فـەرمـوودە گێڕانـەوەیـان ڕەت کردۆتـەوە، هـەروەهـا دکتـۆر منیـر تێکـەڵکردنـی بـۆ دروسـت بـووە لـەچـەنـد بابـەتێکـدا کـەوەڵامـی قسـەکـانی مـن بـەقسـەی ئـەو زانـا پێشینانە دەداتـەوە کەلێیانەوە گواستومەتـەوە، لـەوانـەیـە بـۆ ئاسـوودەکردنی ویژدانـی بێت کـەوەڵامـی مـن دەداتـەوە نـەک ئـەوان، ئـەم کـارەشـی گونجـاوە لـەگـەڵ ڕۆشـنبیری سـەلـەفی بـاو کـەمردوویـان لاپیـرۆزەو رقیـان لەزیندووە، لەپێشتر بوو بۆ مامۆستای بەڕێزمـان سـەیری خـودی قسەکەی بکردایە نـەک ئـەو کـەسـەی وتوویـەتـی، لـەوانـەش بڕگـەی کۆتایی (ل ١١٧)ی کتێبەکـەی، کـەلـەقسـەی ئیبن عمـادی حـەنبـەلییـە لە(شذرات الذهب)داو، لەوانـە قسـەی ئیبن تـەیمیە لـەبـارەی تۆبـەی عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت) لەهەندێک لەسیاسەتەکانی، کەدکتۆر منیر وا وەسفی کردووە کە((درۆی ئاشکرایە)) (ل٧٧).

**شـەشـەم:** دکتـۆر منیـر لـەبـەرگریکردنیـدا لـەفـەرمـانڕەوایـەکـی ئەمەوی کەقسـەی لەسـەر فەرموودەی موسـلم و بـەیهـەقـی کـردووە کەلـەم کتێبـەدا هێناومانـە زۆری لـەخـۆی کـردووە: ((لـەئـەبی حـازم لەسـەهلی کوڕی سـەعدەوە، وتویـەتـی: پیـاوێکی ئـال مـەوران کرایـە فـەرمـانڕەوای مـەدینـە، دەڵێت: سـەهلـی کـوری سـەعدی بـانگکردو

فەرمانی پێکرد کەجنێو بەعەلی بدات، دەڵێت: سەهلی رازی نەبوو، پێی وت: ئەگەر بەوە رازی نابیت ئەوا بڵێ: نەفرەتی خوا لەئەبا توراب، سەهل وتی: عەلی هیچ ناوێکی لای خۆشەویستر نەبووە لە ئەبو تراب، زۆر پێی خۆش بوو بەوە بانگ بکرایە)) (مسلم ١٨٧٤/٤و بیهقی ٤٤٦/٢) وایکردووە لەتوانادا بێت ئەو فەرمانڕەوا ئەمەویە کە((داوای ئەوەی لێ کردووە نەفرەت لەئەبو تراب بکات لەسەر ئەو بنەمایەی کەئەوە جگە لەعەلی کوری ئەبوتالب دەگەیەنێت)) (ل٩٧). لەدەربڕینی ڕاشکاوانەی نیوان فەرمانڕەوا ئەمەویەکەو سەهلی کوڕی سەعدەوە بەئاشکرا دیارە کەلەبارەی کێ قسە دەکەن، بەڵام دکتۆر ئەم پینەو پەڕۆ ساردو سڕە دەکات و، فەرموودەکە بەش بەش دەکات و بەشی کۆتایی لێ لادەبات تا لەوەڵامە ڕاشکاوانەکەی سەهل لەمبارەیەوە دەربازی ببێت: ((عەلی هیچ ناوێکی نەبووە خۆشەویستر بێت لەلای لەئەبو تراب)).

**حەوتەم:** دکتۆر منیر ئەو قسەی لەسەرم هەیە کەمن خۆم لەفەرموودەکەی ترمزی بێئاگا کردووە کەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی معاویەوە دەفەرموویێت: (( اللهم اجعله هاديا مهديا واهد به)) هەرچەندە کەترمزی بەحەسنی داناوە، بەڵام لەراستیدا ئەو باشکردنەی ترمزی بەس نیە بۆ قبولکردنی فەرموودەکە وەک ئەوەی لای ئەهلی حەدیس ناسراوە، هەربۆیە سەیر نیە کە ئیبن عبدالبر تانەی لە گەیشتنەوەی فەرموودەکە داوە چونکە لەسەنەدەکەیدا عبدالرحمن کوڕی ئەبی عومەیرە هەیەو، ئەبو زرعەی عیراقی لە(تحفة التحصيل في ذكر رواة المراسيل ٢٠٣/١)دا وتوویەتی: (( عبدالرحمن کوڕی ئەبی عومەبرەی مەزنی و، پێی وتراوە ئیبن عومەیرەی ئەزدی و، جگە لەوەش وتراوە، جیاوازەی هەیە لەهاوەڵێتیدا، ترمزی لەپێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)

فەرمموودەکەی لەبارەی معاویە هێناوە: (اللهم اجعله هادیا مهدیا)و، جگە لەوەش فەرمووودەی تری هەیە، ئیبن عبدالبر دەڵێت: فەرمووودەکانی ناچەسپێت و هاوەڵێتی دروست نیە))و، رازی لە (علل الحدیث ٣٦٣/٢)دا دەڵێت: ((ئەم فەرمووودەیەی لەپێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) نەبیستووە)). هەموو ئەمانەش بەڵگەن لەسەر وردبینی ئیبن تەیمیە وخویندنەوەی فراوانی لەوەی لەڕیسای نۆیەمدا لێیەوە گواستمانەوە: ((معاویە تایبەت بەفەزڵی لەصەحیحدا هیچ نیە)) (منهاج السنة ٤٠/٧).

**خوا گەورە بێهاوتایەو یارمەتیدەرە بۆ هەموو کارێکی باش**

**لەسەرچاوەکانی ئەم کتیبە..**

١- محمد بن اسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي: الجامع الصحيح المختصر (صحيح البخاري)، تحقيق: مصطفى ديب البغا، دار ابن كثير، اليمامة، ١٩٨٧.

٢- مسلم بن الحجاج أبو حسن القشيري النيسابوري: صحيح مسلم، تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي، دار احياء التراث العربي، بيروت.

٣- محمد بن اسحاق بن خزيمة أبوبكر السلمي النيسابوري: صحيح ابن خزيمة، تحقيق: د.محمد مصطفى الاعظمي، المكتب الاسلامي، بيروت، ١٩٧٠.

٤- محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي: صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان، تحقيق: الشيخ شعيب الارنؤوط، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٩٩٣.

٥- محمد بن عبدالله أبو عبدالله الحاكم النيسابوري: المستدرك على الصحيحين، تحقيق: مصطفى عبدالقادر عطا، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٠.

٦- أبو عبدالله محمد بن عبدالواحد بن أحمد الحنبلي المقدسي: الاحاديث المختارة، تحقيق: عبدالملك بن عبدالله بن دهيش، مكتبة النهضة الحديثة، مكة المكرمة، ١٤١٠هـ.

٧- محمد بن عيسى أبو عيسى الترمذي السلمي: سنن الترمذي، تحقيق: أحمد محمد شاكر واخرون، دار احياء التراث العربي، بيروت.

٨- عبدالله بن عبدالرحمن أبو محمد الدارمي: سنن الدارمي، تحقيق: فواز أحمد زمرلي وخالد السبع العلمي، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٤٠٧هـ

٩- أحمد بن الحسين بن علي بن موسى أبوبكر البيهقي: سنن البيهقي الكبرى، تحقيق: محمد عبدالقادر عطا، مكتبة دار الباز، مكة المكرمة، ١٩٩٤.

١٠- أحمد بن الحسين بن علي بن موسى أبوبكر البيهقي: السنن الصغرى، تحقيق: د. محمد ضياء الرحمن الاعظمي، مكتبة الدار، المدينة المنورة، ١٩٨٩.

١١- علي بن عمر أبو الحسن الدارالقطني البغدادي: سنن دارالقطني، تحقيق: السيد عبدالله هاشم يماني المدني، دار المعرفة، بيروت، ١٩٦٦.

١٢- سليمان بن الاشعث أبوداود السجستاني الازدي: سنن أبي داود، تحقيق: محمد محي الدين عبدالحميد، دار الفكر.

١٣- أحمد بن شعيب أبو عبدالرحمن النسائي: السنن الكبرى، تحقيق: د. عبدالغفار سليمان البنداري وسيد كسروي حسن، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٩١.

١٤- أحمد بن شعيب أبو عبدالرحمن النسائي: المجتبى من السنن، تحقيق: عبدالفتاح أبو الغدة، كتب المطبوعات الاسلامية، حلب، ١٩٨٦.

١٥- محمد بن يزيد بن ماجه أبو عبدالله القزويني: سنن ابن ماجه، تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي، دار الفكر، بيروت.

١٦- أبو عوانة يعقوب بن اسحاق الاسفرائيني: مسند أبي عوانة، تحقيق: أيمن بن عارف الدمشقي، دار المعرفة، بيروت، ١٩٩٨.

١٧- مالك بن أنس أبو عبدالله الاصبحي: موطأ الامام مالك، تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي، دار احياء التراث العربي، مصر.

١٨- أبوبكر عبدالله بن محمد بن أبي شيبة الكوفي: الكتاب المصنف في الاحاديث والاثار، تحقيق: كمال يوسف الحوت، مكتبة الرشد، الرياض، ١٤٠٩هـ.

١٩- ابوبكر عبدالرزاق بن همام الصنعاني: المصنف، تحقيق: حبيب الرحمن الاعظمي، المكتب الاسلامي، ١٤٠٣ هـ.

٢٠- أبوبكر أحمد بن عمرو بن عبدالخالق البزار: مسند البزار. تحقيق: د. محفوظ الرحمن زين الله، مؤسسة علوم القران ومكتبة العلوم والحكم، المدينة المنورة وبيروت، ١٤٠٩هـ.
٢١- سليمان بن أحمد بن أيوب أبو القاسم الطبراني: المعجم الكبير، تحقيق: حمدي بن عبدالمجيد السلفي، مكتبة العلوم والحكم، الموصل، ١٩٨٣.
٢٢- سليمان بن أحمد بن أيوب أبو القاسم الطبراني: معجم الاوسط، تحقيق: طارق بن عوض الله بن محمد وعبدالمحسن بن ابراهيم الحسين، دار الحرمين، القاهرة، ١٤١٥ هـ.
٢٣- سليمان بن أحمد بن أيوب أبو القاسم الطبراني: الروض الداني (المعجم الصغير)، تحقيق: محمد شكور محمود الحاج أمرير، المكتب الاسلامي، بيروت، ١٩٨٥.
٢٤- أبو سعيد الهيثم بن كليب الشاشي: مسند الشاشي، تحقيق: د. محفوظ الرحمن زين الله، مكتبة العلوم والحكم، المدينة المنورة، ١٤١٠ هـ.
٢٥- أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني: مسند الامام أحمد، مؤسسة القرطبة، مصر.
٢٦- أحمد بن علي بن المثنى الموصلي أبو يعلي: مسند أبي يعلي، تحقيق: حسين سليم أسد، دار المأمون للتراث، دمشق، ١٩٨٤.
٢٧- أبو بكر أحمد بن الحسين البيهقي: شعب الايمان، تحقيق: محمد السعيد بسيوني زغلول، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٠ هـ.
٢٨- أبو القاسم هبة الله بن الحسن بن منصور اللالكائي: شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة من الكتاب والسنة واجماع الصحابة، تحقيق: د. أحمد سعد حمدان، دار طيبة، الرياض، ١٤٠٢هـ.
٢٩- أبوبكر أحمد بن محمد بن هارون بن يزيد الخلال: السنة، تحقيق: د. عطية الزهراني، دار الراية، الرياض، ١٤١٠ هـ.

٣٠- أبو عبدالله نعيم بن حماد المروزي: كتاب الفتن، تحقيق: سمير أمين الزهيري، مكتبة التوحيد، القاهرة، ١٤١٢ هـ.
٣١- أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني: فتح الباري شرح صحيح البخاري، تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي ومحب الدين الخطيب، دار المعرفة، بيروت، ١٣٧٩ هـ.
٣٢- أبو عمر يوسف بن عبدالله بن عبدالبر النمري: التمهيد لما في الموطأ من المعاني والاسانيد، تحقيق: مصطفى بن أحمد العلوي ومحمد عبد الكبير البكري، وزارة عموم لاوقاف والشؤن الاسلامية، المغرب، ١٣٨٧ هـ.
٣٣- محمد بن اسماعيل بن ابراهيم أبو عبدالله البخاري الجعفي: التاريخ الكبير، تحقيق: السيد هاشم الندوي، دار الفكر.
٣٤- محمد بن عبدالله بن أحمد بن سليمان بن زبر الربعي: تاريخ مولود العلماء ووفياتهم، تحقيق: د. عبدالله أحمد سليمان الحمد، دار العاصمة، الرياض، ١٤١٠ هـ.
٣٥- عبد الرحمن بان أبي حاتم محمد بن ادريس أبو عبدالله الرازي التميمي: الجرح والتعديل، دار احياء التراث العربي، بيروت، ١٩٥٢م.
٣٦- محمد بن ابراهيم بن اسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي: التاريخ الصغير، تحقيق: محمود ابراهيم زايد، دار الوعي، حلب، ١٩٧٧.
٣٧- محمد بن أحمد بن عثمان بن قايماز الذهبي أبو عبدالله: سير أعلام النبلاء، تحقيق: شعيب الارناؤوط ومحمد نعيم العرقسوسي، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٤١٣ هـ.
٣٨- عبدالرحمن بن علي بن محمد بن الجوزي أبو الفرج: الضعفاء والمتروكون، تحقيق: عبدالله القاضي، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٠٦ هـ.

٣٩- أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني: تهذيب التهذيب، دار الفكر، بيروت، ١٩٨٤.
٤٠- أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني: تعجيل المنفعة بزوائد رجال الائمة الاربعة، تحقيق: د. اكرام الله امداد الحق، دار الكتاب العربي، بيروت.
٤١- يوسف بن الزكي عبدالرحمن أبو الحجاج المزي: تهذيب الكمال، تحقيق: د.بشار عواد معروف، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٩٨٠.
٤٢- سليمان بن خلف بن سعد أبو الوليد الباجي: التعديل والتجريح لمن خرج له البخاري في الجامع الصحيح، تحقيق: د. أبو لبابة حسين، دار اللواء للنشر والتوزيع، الرياض، ١٩٨٦.
٤٣- محمد بن سعد بن منيع أبو عبدالله البصري الزهري: الطبقات الكبرى، دار صادر، بيروت.
٤٤- أبو عمر يوسف بن عبدالله بن محمد بن عبد البر: الاستيعاب في معرفة الاصحاب، تحقيق: علي محمد البجاوي، دار الجيل، بيروت، ١٤١٢ هـ.
٤٥- برهان ابراهيم بن محمد بن عبدالله بن محمد بن مفلح: المقصد الارشد في ذكر أصحاب الامام أحمد، تحقيق: عبد الرحمن بن سليمان العثيمين، مكتبة الرشد للنشر والتوزيع، الرياض،١٩٩٠.
٤٦- احمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني: الاصابة في تمييز الصحابة، تحقيق: علي محمد البجاوي، دار الجيل، بيروت، ١٩٩٢.
٤٧- أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني: العلل ومعرفة الرجال، تحقيق: وصي الله بن محمد عباس، المكتب الاسلامي، بيروت، ١٩٨٨.
٤٨- أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني: تلخيص الحبير في أحاديث الرافعي الكبير، تحقيق: السيد عبد الله هاشم اليماني المدني، المدينة المنورة، ١٩٦٤.

٤٩- أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني: فضائل الصحابة، تحقيق: د.وصي الله محمد عباس، مؤسسة الرسالة، بيروت،١٩٨٣.
٥٠- علي بن أبي بكر الهيثمي: مجمع الزوائد ومنبع الفوائد، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٤٠٧ هـ.
٥١- محمد عبد الرحمن بن عبدالرحيم المباركفوري أبو العلا: تحفة الاحوذي بشرح جامع الترمذي، دار الكتب العلمية، بيروت.
٥٢- تقي الدين أبي بكر علي بن عبدالله الحموي الازراري: خزانة الادب وغاية الارب، تحقيق: عصام شعيتو، دار ومكتبة الهلال، بيروت، ١٩٨٧.
٥٣- شمس الدين محمد بن أحمد الذهبي: ميزان الاعتدال في نقد الرجال، تحقيق: الشيخ علي محمد معوض والشيخ عادل أحمد عبد الموجود، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٥.
٥٤- عمرو بن أبي عاصم الضحاك الشيباني: السنة، تحقيق: محمد ناصر الدين الالباني، المكتب الاسلامي، بيروت، ١٤٠٠ هـ.
٥٥- محمد بن اسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي: الادب المفرد، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي، دار البشائر الاسلامية، بيروت، ١٩٨٩.
٥٦- أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني الشافعي: لسان الميزان، تحقيق: دائرة المعرف النظامية بالهند، مؤسسة الاعلمي للمطبوعات، بيروت، ١٩٨٦.
٥٧- أحمد بن علي أبوبكر الخطيب البغدادي: تاريخ بغداد، دار الكتب العلمية، بيروت.
٥٨- شهاب الدين أبو الفلاح عبد الحي بن أحمد بن محمد العكري ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب في اخبار من ذهب، تحقيق: عبد القادر الارتؤوط ومحمود الارنؤوط، دار ابن كثير، بيروت، ١٩٨٨.

٥٩- مسلم بن الحجاج بن مسلم القشيري أبو الحسين: الكنى والاسماء، تحقيق: عبدالرحيم محمد أحمد القشقري، الجامعة الاسلامية، المدينة المنورة، ١٤٠٤ هـ.

٦٠- أحمد بن علي بن الحسن أبو المحاسن الحسيني: الاكمال في ذكر من له رواية في مسند الامام أحمد من الرجال، تحقيق: د. عبدالمعطي أمين قلعجي، جامعة الدراسات الاسلامية، كراتشي، ١٩٨٩.

٦١- عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي أبو الفضل: طبقات الحفاظ، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٠٣ هـ.

٦٢- محمد بن عبدالله بن محمد بن عبدالله بن أحمد المعافري الاشبيلي أبو بكر بن العربي: العواصم من القواصم في تحقيق مواقف الصحابة بعد وفاة النبي صلى الله عليه وسلم، تحقيق: الشيخ محب الدين الخطيب، دار الجيل، بيروت، ١٩٩٤.

٦٣- محمد بن أحمد بن أبي بكر بن فرح القرطبي أبو عبدالله: الجامع لاحكام القران، تحقيق: أحمد عبدالعليم البردوني، دار الشعب، القاهرة، ١٣٧٢ هـ.

٦٤- محمد شمس الحق العظيم ابادي أبو الطيب: عون المعبود في شرح سنن أبي داود، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٥ هـ.

٦٥- أحمد بن عبدالله صالح أبو الحسن العجلي الكوفي: معرفة الثقات، تحقيق: عبدالعليم عبدالعظيم البستوي، مكتبة الدار، المدينة المنورة، ١٩٨٥.

٦٦- محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي: مشاهير علماء الامصار، تحقيق: م. فلايشهمر، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٥٩.

٦٧- محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي: الثقات، تحقيق: السيد شرف الدين أحمد، دار الفكر، بيروت، ١٩٧٥.

٦٨- أحمد بن محمد بن الحسين البخاري الكلاباذي أبو نصر: الهداية والارشاد في معرفة أهل الثقة والسداد (رجال صحيح البخاري)، تحقيق: عبدالله الليثي، دار المعرفة، بيروت، ١٤٠٧ هـ.

٦٩- اسحاق بن ابراهيم بن مخلد بن راهويه الحنظلي: مسند اسحاق بن راهويه، تحقيق: د. عبدالغفور بن عبدالحق البلوشي، مكتبة الايمان، المدينة المنورة، ١٩٩١.

٧٠- شمس الدين محمد بن أحمد بن عثمان بن قايماز الذهبي: المغني في الضعفاء، تحقيق: نورالدين عتر.

٧١- ابو حاتم محمد بن حبان البستي: كتاب المجروحين، محمود ابراهيم زايد، دار الوعي، حلب.

٧٢- أبو جعفر محمد بن عمر بن موسى العقيلي: كتاب الضعفاء الكبير، تحقيق: عبدالمعطي أمين قلعجي، دار المكتبة العلمية، بيروت، ١٩٨٤.

٧٣- ابراهيم بن محمد بن سبط ابن العجمي أبو الوفا الحلبي الطرابلسي، الكشف الحثيث عمن رمي بوضع الحديث، تحقيق: صبحي السامرائي، مكتبة النهضة العربية، بيروت،١٩٨٧.

٧٤- أحمد بن عبدالله بن أحمد أبو نعيم الاصبهاني الصوفي: الضعفاء، تحقيق: د. فاروق حمادة، دار الثقافة، الدار البيضاء، ١٩٨٤.

٧٥- أحمد بن عبدالرحيم بن الحسين بن عبدالرحمن بن أبي بكر بن ابراهيم الكردي: تحفة التحصيل في ذكر رواة المراسيل، تحقيق: عبدالله نوارة، مكتبة الرشيد، الرياض، ١٩٩٩.

٧٦- أبو سعيد بن خليل بن كيكلدي أبو سعيد العلائي: جامع التحصيل في أحكام المراسيل، تحقيق: حمدي عبدالمجيد السلفي، عالم الكتب، بيروت، ١٩٨٩.

٧٧- شمس الدين محمد بن أحمد بن عثمان بن قايماز الذهبي: الكاشف في معرفة من له رواية في الكتب الستة، تحقيق: محمد عوامة، دار القبلة للثقافة الاسلامية، جدة، ١٩٩٢.

٧٨- أحمد بن عبدالحليم بن تيمية الحراني أبو العباس: مجموع الفتاوى، تحقيق: عبدالرحمن بن محمد بن قاسم النجدي، الرئاسة العامة لشؤون الحرمين الشريفين، السعودية.

٧٩- أحمد بن عبدالحليم بن تيمية الحراني أبو العباس: منهاج السنة النبوية، تحقيق: د. محمد رشاد سالم، مؤسسة قرطبة، ١٤٠٦ هـ.

٨٠- أحمد بن عبدالحليم بن تيمية الحراني أبو العباس: درء تعارض العقل والنقل، تحقيق: د. محمد رشد، دار الكنوز الادبية، الرياض، ١٣٩١ هـ.

٨١- أحمد بن عبدالحليم بن تيمية الحراني أبو العباس: السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية، دار المعرفة.

٨٢- شمس الدين أبن القيم محمد بن أبي بكر أيوب الزرعي أبو عبدالله: جلاء الافهام في فضل الصلاة على محمد خير الانام، تحقيق: شعيب الارنؤوط وعبدالقادر الارنؤزط، دار العروبة، بيروت، ١٩٨٧.

٨٣- شمس الدين ابن القيم محمد بن أبي بكر أيوب الزرعي أبو عبدالله: اعلام الموقعين عن رب العالمين، تحقيق: طه عبدالرؤف سعد، دار الجيل، بيروت، ١٩٧٣.

٨٤- عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي: طبقات المفسرين، تحقيق: علي محمد عمر، مكتبة وهبة، القاهرة، ١٣٩٦ هـ.

٨٥- عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي: الدر المنثور في التفسير بالماثور، دار الفكر، بيروت، ١٩٩٣.

٨٦- محمد بن علي بن محمد الشوكاني: فتح القدير الجامع بين فني الرواية والدراية من علم التفسير، دار الفكر، بيروت.

٨٧- عبدالله بن أحمد بن محمود النسفي: مدارك التنزيل في حقائق التاويل (تفسير النسفي)، تحقيق: الشيخ ابراهيم محمد رمضان، دار القلم، بيروت، ١٩٨٩.

٨٨- أبو الفداء الحافظ ابن كثير: البداية والنهاية، تحقيق: د. عبدالله أنيس الطباع، مكتبة المعارف، بيروت.

٨٩- عبدالرحمن بن علي بن محمد بن الجوزي أبو الفرج: صيد الخاطر، تحقيق: الشيخ أسامة محمد السيد، دار الفكر، بيروت، ١٩٩٦.

٩٠- عبدالرحمن بن علي بن محمد بن الجوزي أبو الفرج: المنتظم في تاريخ الملوك والامم، دار صادر، بيروت، ١٣٥٨ هـ.

٩١- عبدالرحمن بن محمد بن خلدون الحضرمي: مقدمة ابن خلدون، دار القلم، بيروت، ١٩٨٤.

٩٢- محمد بن علي بن محمد الشوكاني: نيل الاوطار من أحاديث سيد الاخيار شرح منتقي الاخبار، دار الجيل، بيروت، ١٩٧٣.

٩٣- محمد عبدالله أبو صعيليك: الامام الحافظ أبوحاتم محمد بن حبان البستي فيلسوف الجرح والتعديل (ضمن سلسلة أعلام المسلمين)، دار القلم، دمشق، ١٩٩٥.

## پوختەیەك لەژیانی نووسەر
## (محمد بن المختار الشنقيطى)

نووسەریکی مۆریتانییە، ئێستا مامۆستای میژووی ئاینەکانە لەکۆلێژی خویندنی ئیسلامی لەزانکۆی (حمد بن خليفە) لەقەتەر، پێشتر مامۆستای (تفسیرو نحو) بووە لەزانکۆی یەمەن، گرنگی دەدات بەفیقهی سیاسی و، بەراوردی ئاینەکان و، بابەتی تائیفیەت و، گرفتی شوناس و، پەیوەندییەکانی عەرەب و ئەمریکا.

هاوەڵێتی ژمارەیەک لەزانایانی شەنقیتی کردووەو لییانەوە ئیجازەی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزو شێوەو ڕیککاری وەرگرتووەو، فیقهو ئوصول و نەحوی خویندەوەو، پاشان باکالوریوسی لەفیقهو ئوصول لەپەیمانگای ئیبن عباس بۆ خویندنی ئیسلامی و، باکالوریوس لەوەرگێڕان (عەرەبی- فەرەنسی- ئینگلیزی) لەزانکۆی ئیمان لەیەمەن بەدەستهێناوە، پاشان چووە بۆ ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاو دە ساڵ لەوێ ژیاوە، بڕوانامەی ماستەری لەکارگێڕی گشتی لەزانکۆی کۆلۆمبیای باشوور و، ماستەرو دکتۆرای لەمێژووی ئاینەکان لەزانکۆی تەکساس بەدەستهێناوە.

لەکتێبە چاپکراوەکانی بەزمانی عەرەبی: ((الحركة الاسلامية فى السودان: مدخل الى فكرها الاستراتيجي والتنظيمي)) (لەندەن ٢٠٠٢، جەزائیر ٢٠٠٤، بيروت ٢٠١٠)، ((فتاوى سياسية: حوارات فى الدعوة والدولة)) (جدە ٢٠٠٤)، ((خيرة العقول المسلمة فى القرن العشرين)) (دمشق ٢٠١١)، دیوانی شیعری: ((جراح الروح)).

لەکارەکانی بەزمانی ئینگلیزی: ((کاریگەری جەنگەکانی خاچپەرستی لەسەر پەیوەندییەکانی سوننە-شیعە)) (نامەی دکتۆرا لەمیژوویی ئاینەکاندا لەزانکۆی تەکساس)، ((صەلاحەدینی ئەیوبی

لەیادگەی سوننەو شیعەدا)) (بەشێکە لەکتێبی ((بەیادهێنانەوەی جەنگە خاچپەرستیەکان))ە واشنتۆن ٢٠١١)، ((گەشتیکی بەئازار بەرەو لای بەدیهێنەر: چرکەساتی گۆڕانی رۆحی لەنیوان غەزالی و ئۆگستیندا))، ((رۆژهەلاتیبوون و رۆژئاوایبوون: لەنێوان ئیدوارد سەعیدو برنارد لویسدا))، ((تیرۆوانینی ئەمریکییەکانی سەرەتا بۆ موسلمانان))، (عبیداللە: ئەفریقیە موسلمانەکانی سەرەتا لەئەمریکا))، زۆربەی بەرهەمەکانی وەرگێڕدراون بۆ سەر زمانی تورکی و، لەنیوان سالانی ٢٠٠٦ بۆ ٢٠١٢ لەئەستنبوڵ چاپ کراون، بەبەردەوامی لەپێگەی جەزیرە نێت دەنووسێت و، لەم بوارەدا بەسەدان بابەتی شیکاری بلاوکردۆتەوەو، هەندێکجار بەتویژینەوەو کۆڕ لەمەلبەندی جەزیرە بۆ تویژینەوەو مەلبەندی عەرەبی بۆ تویژینەوەو خویندنەوەی سیاسەتەکان لەدەوحە بەشدار دەبێت.